پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
(4)

# سەرچاوەکانی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی

## لێکۆڵینەوەیەك لە گرفتی گشتاندن
## پێش خوێندنەوە و رەگەزدۆزیی

نووسینی:
د. نەصر موحەممەد عارف

وەرگێرانی:
شوان هەورامی

سەرچاوەکانی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی

د. نەصر موحەممەد عارف

# في مصادر التراث السياسي الإسلامي

## دراسة في إشكالية التعميم قبل الإستقراء والتأصيل

د. نصر محمد عارف

ترجمة:
شوان هورامي

دابەشکاری سەرەکیی:
کتێبخانەی (وەفایی) . سلێمانی 07701919360

# سەرچاوەكانی كەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی

**لێكۆڵینەوەیەك لە گرفتی گشتاندن پێش خوێندنەوە و ڕەگەزدۆزیی**

**نووسینی:**

**نەصر موحەممەد عارف**

**وەرگێڕانی:**

**شوان هەورامی**

**٢٠٠٨ زایینی** **١٤٢٩ كۆچی**

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ژمارە (٤)

ناوی کتێب: سەرچاوەکانی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی
نووسینی: نەصر موحەممەد عارف
وەرگێڕانی: شوان هەورامی

بابەت: لێکۆڵینەوەی ئیسلامیی
نەخشەسازیی: هاوژین عومەر
ژمارەی لاپەڕە: ٢٨٧
پێوانەی لاپەڕە: ١٦,٥×٢٣
تیراژ: ٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: (٢٦٢١)ی ساڵی ٢٠٠٨
نۆرەی چاپ: یەکەم
شوێنی چاپ: چاپخانەی دیلان
ئیمەیلی پرۆژە: iiitkurdistan@yahoo.com

# ڕێخۆشکردن

بێگومان ڕاپەرین و پێشکەوتنی هەر گەلێك لە گەلان لەسەر ئاستی توانای ئەو گەل و نەتەوانە لە پێشخستنی پەیڕەوێکی زانستیی و مەعریفیی وا راوەستاوە کە ڕێگەکانی هەڵسوکەوتکردنی بۆ دیاریی دەکات لەگەڵ ئەندێشەگەرایی و بیروباوەڕو کەلەپوورو بارودۆخ و هەروەها تەواوی ئەوەی دەوری داوە لە فیکر و رووداو و گۆڕانکارییەکان.

کە ببێتە هۆی گەیاندنی بە راستی لە بۆچوون و ناوەڕۆك و پێشهاتەکانی بوونی ئەو رووداوانە، بەو شێوەیەی هەر ڕێگەو ڕێبازێك بگرێتەبەر بە مەرجی گەیاندنی بە هەر چەمکێك کە پشکدار بێت لە دەرخستنی راستیدا، پاشان چاکتێگەشتنی واقیعی هەنووکەیی بە بێ پشتگوێخستن یان خۆلادان لە زۆر، یان کەمیی پێکهێنەرەکانی رواڵەت و بابەتی ژێر توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە، بە بێ پەلەکردن و تیژپەڕیی لە گشتاندندا، پێش تەواوکردن و ئەنجامدانی پشکنین و توێژینەوە بە دوای هە رچیە کدا کە پەیوەندیی بە بابەتەکەوە هەیە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

بۆ ئەوەی دەرئەنجام و هەڵسەنگاندن و گشتاندنەکان لەسەر بنچینەیەکی زانستیی دابڕێژرێن، کە رەنگدانەوەی دۆخی رواڵەتە توێژراوەکە بێت بەبێ لایەنگرییەك کە خودگەرایی لە بابەتەکەدا بسەپێنێ، بە شێوەیەك بارودۆخەکە بگۆڕێت کە خۆی دەیەوێت، ئەوکاتە توێژەر بارودۆخێکی وا بەرجەستە دەکات کە بۆ خۆی دروستی کردووەو خولقاندوویەتی، کە وەڵامدەرەوەی ئەو بیروبۆچوون و بیرۆکە

پێشوەختانەیەتی کە لای بوونەتە راستیی حاشاهەڵنەگر. بەو هۆیەشەوە زانست دەبێتە هەست و سۆزێکی رۆمانتیکی شاعیرانەو بە دەربڕین و ئاخاوتنێکی ئەکادیمیی وەها رەنگ دەکرێت کە وێنە خەیاڵییەکەی توێژەر بۆ بارودۆخی خوازراوی ناو بیرو ئەندێشە ی خۆی لە پشتەوە بشارێتەوە. لێرەدا توێژەر دەکەوێتە ناو یەکێ یان هەردوو جۆر لە جۆرەکانی نەزانین، کە ((ئیمامولحەرەمەین ئەبولمەعالی جوەینی)) لە کتێبی ((الورقات في اصول الفقه))دا باسیان دەکات، بە بۆچوونی ئەو نەزانین دوو جۆرە، نەزانینی سادە کە بریتییە لە پەیبردن بە شتێك بە پێچەوانەی ئەوەی لە راستیدا هەیە، هەروەها نەزانینی داڕێژراو یان تێکەڵ (الجهل المركب) کە ئەویش بریتییە لە پەیبردن بە شتەکان بەبێ ئەوەی لە راستیدا بەوشێوەیە بێت کە پێی واشبێت ئەوەی ئەو تێیگەیشتووە هە ربەو شێوەیە[1].

زانست پێچەوانەی نەزانینە، کە بریتییە لە پەیبردنی تەواو و پڕ بەبالای شتەکان، یان بارودۆخەکان لەسەر بناغەی بەڵگەی یەکلاکەرەوە، هەروەك زانایانی ((اصول)) پێناسەیان کردووە کە بریتییە لە پەیبردن بە شت لە رێگە ی هەستەکانی مرۆڤەوە بە شێوەیەکی دروست و دوور لە گومان، نەك لە رێگەی بۆچوون و خەیاڵەوە، هە روەها کالا بە قەد بالای بارودۆخەکە بێت بۆ ئەوەی نەبێتە جێگەی گومان (یا خەملاندنی گۆترەیی)، هەروەها لەسەر بنەمای بەڵگە بێت بۆ ئەوەی نەبێتە شوێنکەوتنێکی کوێرانە[2]،

---

[1] ابو المعالي الجويني – الورقات في اصول الفقه، منشور على هامش ارشاد الفحول الى التحقيق من علم الاصول للشوكاني، القاهرة – مطبعة محمد على صبيح، ص٤٣.

[2] ئەم پێناسەیەم بە وەرگرتنی راستەوخۆ لە شێخ ((عەلی جومعە موحەمەد)) مامۆستا لە ئەزهەری پیرۆز وەرگرت.

چـونکه زانـست ماهیـەت و پرۆگـرام و دەرەنجامـەکانی زانـستە نـەك بـە دەستەواژەو دارِشتنی وشەکانی کە زیاتر لە تەلیسمی ئەفسوناویی دەچـێت کە بە دەربرِینیان ئـیتر وادەزانرێـت خاوەنەکـەیان بووەتـە زانـاو زانـستیانە دەدوێت.

ئەوەی سـەیری ژیارەکـان بکـات بـۆی دەردەکـەوێت کـە ئەوانـە لەسـەر رێکخـستنێکی زانـستیانەی خـاوەن پرۆگـرام دروسـت بـوون کـە تواناکـانی مرۆڤیان رەها کردووە و بیرو رەفتاریان وەها رێکخستووە کە بچنە ناو یـەك تەوژمـەوە و بـەرەو ئامـانج و ویـستێ کـە رەنگدانـەوەی خـود و ناسـنامە و دوارِۆژی هاوبەش پێکدەهێنێ بۆ بیناکردنی شەقلێکی شارستانیی وەها کـە بەختەوەریی مرۆڤـی تیـا بـەدیی بهێنرێـت – دیـارە بـەپێی ریزبەنـدیی ئـەو شارستانییەتە بۆ ئەو مرۆڤە و ئەو بەختەوەرییە – ئەو شەقڵ و رێچکەیەش کە بەختەوەریی پێوەیە ناکرێ پێی بگەیت بەبێ زانینـی هـە رشـتێك وەکـو راستی خۆی، بۆ ئەوەی کارلێك لە گەڵیدا سەرکەوتوو بێـت و ئامانجـەکان و مەبەستەکانی دەستەبەر بکات. بەڵام ئەگەر هەڵسوکەوت و کارلێـك لەسـەر بنەمای بۆچوون یان گریمانە یا نەزانین بێت بەراستیی هەنووکەیی و بـوون، ئـەوا بـە هـیچ شـێوەیەك ناگاتـە ئـەنجامی کرداریـی. بـارودۆخی عـەرەبیی ئیسلامییمان نموونەیەکی ئاشکرایە لەسەر شکستی چارەسەرەکان و لەگەڵ زۆربوونیان ئەمەش لەبەر نەزانینی راستیی زانست و پەیرِەوێکی دروست کە ببێە هۆی دیاریی کردن و مەوداو پێکهێنەرەکانی رواڵەتەکـەو رێکخـستنی و پێرِستکردنی پەیوەندییەکان و هۆکارو ئامانجەکان.

قورئـــان و ســـوننەتی پێغەمبـــەر ﷺ ئـــەو سەرچـــاوەیە بـــوون کـــە موسوڵمانانی پێشوو ریزبەنـدیی و شـەقڵی مـەعریفیی و زانـستی پرۆگـرام و

پەیڕەوی خۆیان لێ وەرگرتبوو، لەسەر ئەو شەقڵەش بناغەی شارستانیەتی ئیسلامیی دامەزرا، کە بۆماوەی دوازدە سەدە بەکاریگەریی مایەوە، بەڵام کاتێ ئەم شەقڵە زانستیی و پرۆگرامییە کاریگەریی و نوێیگەرایی بێهێز بوو، سەرەڕای ئەوەی بنەماو بناغەو سەرەتا گشتییەکانی بەردەوامن، بەڵام ئەم ژیارە بەرەو ئاوابوون چوو، چونکە کارلێکی نێوان بنەما گشتییەکان و بارودۆخی رۆژانەی لە دەستدا، نەیتوانی سوودی لێوەرگرێ و لێی هەڵێنجێ و دایبەزێنێتە سەر بارودۆخی هەنووکە، کە لە ئاستی بارودۆخەکەدا پەیڕەوی کاریگەر بۆ کارلێك لەگەڵیدا پێشبخات و لێی تێبگات و خۆی نوێ بکاتەوە.

بە هەمان شێوەش شارستانیەتی ئەورووپای نوێ لەسەر بناغەی زانستیی و پەیڕەوێکی وا دروست کرا کە سەرچاوەکانی زانیاریی و زانست و چۆنیەتی بەدەستهێنانی بۆ مرۆڤی ئەورووپی دیاریی کرد. پاشان سەرچاوەکانی تێگەیشتن و زانست و چۆنیەتی فێربوونی رێساکانی سروشت و کۆمەڵگەی مرۆیی بۆ دەستەبەر کرد، بۆیە گشت هەوڵ و تێکۆشانی پێشڕەوانی ئەو شارستانیەتە وەکو دیکارت و بیکۆن و ئەوانی تریش بریتی بوو لە دیاریکردن و روونکردنەوەی چەمکی پەیڕەو و تیۆری زانستیی، ئەمەش وایکرد کە عەقڵیەتی مرۆڤی ئەورووپیی رزگار بکات لە نەزانینی سادە، یا نەزانینی تێکەڵ و داڕێژراو بەرەو تێگەیشتن لە بارودۆخی ژیان، بە شێوەیەك بتوانێت کارلێکی لەگەڵدا بکات بە چاوپۆشی لە نرخ و بەهاو ئامانجەکانی ئەو هەڵسوکەوتە، پاشان بەگەڕخستنی بە ئامانجی بنیاتنانی راپەڕینێك کە چەندەها سەرکەوتنی جۆراو جۆری لە زۆربەی بوارەکاندا بەدەستهێناو چەند نشوستیەکیشی بەسەرداهات لە چەند بوارێکی تردا،

چونكه لەو بوارانەدا لە پەیڕەوی زانست و تێگەیشتن لایداو دوور كەوتــەوە. چونكە نەیتوانی بابەتی نادیار (الغیـب) یـەكلایی بكاتــەوە، لـە كاتێكـدا كـە نادیارو پەنهان بە هەرشێوەیەك بێت لـە شـێوەكان یەكێكـە لـە پێكهێنــەرە ســەرەكیەكانی مـرۆڤ جـا بـەوە بزانــێ یـان نـا و سروشـتی ئـەو نادیـارە هەرچۆنێك بێت، دیارە ئەمەش دەرەنجامی خراپ بەكارهێنانی ئاین لەلایەن كەنیسەوە بوو، كە كۆتی لەسەر ژیریی مرۆڤ دانابوو بۆیە مرۆڤی ئـەوروپیی ئەو توێژینەوەو شیكردنەوەیەی كەنیـسەی بـۆ ئـاین و سەرچـاوەكانی ڕەت كردەوە.

بە ســەیركردنێكی بـارودۆخی وڵاتـانی عـە رەبیـی و ئیـسلامییش بۆمـان دەردەكــەوێت ترسـناكترین كــەموكورتی ئەوەیــە كــە لەزەمینــە و بنــەمای زانستیی و پەیڕەوییدا هەیە، سەرەڕای زۆری بەرهەمهێنانی زانستیی، بـەڵام نەبوونی پەیڕەو و ڕێگەیەكی زانستییانە وایكردووە كە بەرهەمە زانستییەكە ببێتـە خۆڵـەمێش و تـۆز و زیـاتر شـێواندن و تـەم و مـژكردنی بارودۆخەكـە بێت، نەك پشكدار بێت لە ڕۆشنكردنەوەی دیدێ كە سەرەنجامی بە پێكانی بــە كــردەوە كۆتــایی بێــت. ئــەم شــێوازەش تــەنها لایــەنێكی بیروهۆشــی نەگرتووەتەوە و هی تریش فەرامۆش بكات، بەڵكو گشتگیرە.

هەروەك لە میانەی ئـەم توێژینەوەیـەدا دەردەكـەوێت كـە تەنانـەت ئـەو كەسانەش كە بەرگی پەیڕەوی زانـستی ئەوروپییـشیان پۆشـیوە ئەنـدازەی ســـوودلێوەرگرتنیان ســـنووری درووشمـــی نەبەزانـــدووە بـــۆ نـــاوەڕۆكی ڕاسـتەقینەی پــەیڕەوی زانـستیی. هــەموو ئەوانــەی كــە لــە بــارەی فیكـری سیاسیی ئیسلامیی، یـان كەلـەپووری سیاسـیی ئیـسلامیی، یـان یـەكێ لـە دیـاردەو ڕواڵەتــەكانی شـتیان نووسـیوە ڕێـژەی ئاگادارییـان لـە سەرچـاوە

راســتەوخۆكانی ئــەو بــیرو گەنجینەیــە ((٦٪))ی سەرچــاوە دیارەكــانی تێپەڕناكات. بەم شێوەیە سـادەترین ڕێـسای پـەیڕەوی زانـستییان پێـشێل كردووە، كە سەرەتاییترینیان بریتییە لە ڕێسای خوێندنەوە و ئاگـاداربوونی بابەتییانـە لـە دیـاردە توێژراوەكـە و پـێش ئـەوەی دەرەنجامـەكانی وەكـو ڕێسای ڕەها گـشتاندنیان بـۆ بكرێـت، ئـەم ڕێـسایەش هـەموو بیریارەكـانی خۆرهــەڵات و خۆرئـاوای كـۆن و نـوێ لەسـەری كـۆدەنگن، پێیـان وایـە كـە گشتاندن بەبێ بوونی پاساوێكی پاڵپشت لە خوێندنـەوەی بابەتیانـەو بـەبێ چڕكردنەوەی ژیرانە و زانستیانەی بیرۆكەكان.

بێگومان گشتاندنی چـاك یـان خراپیـان بەسـەر كەلـەپووری ئیـسلامییدا داوە تەنها بە ئاگاداربوون لە ((٦٪))ی سە رچاوە راسـتەوخۆكانی، بـەڵكو هەشیانە تەنها یەك سەرچاوەشی نەبینیوە یان نەیویستووە ببینـێ، بـەڵام دنیای پڕكردووە لە هەراو قاڵـەقاڵ لەسـەر ئیـسلام و سیاسـەت[٣]، هەشـیانە تـەنها بـەلای هەنـدێ لـە نـاوی ئـەو بابـەت و نووسـەرە ناپـسپۆڕانەی ئـەو دیاردەیەدا شـكاندوویەتیەوە، تـەنها وەكـو هۆكارێـك بـۆ دەسـتەبەركردن و بەدەستهێنانی شەرعییەت و شایستەیی زانـستیی یـان وەكـو پاسـاوێك تـا بیروڕاكـانی وەربگیرێـن، بـە بـێ هەوڵـدانێكی راسـتەقینە و بابەتییانـە لـە ناوەڕۆكی بابەتەكە بكۆڵنەوە، هەروەها ئەو بابەتانەشیان هەڵنەبژاردووە كە گومان دەبرێت كە لەو بابەتە بدوێت، لەگـەڵ ئەمەشـدا كـە ئـەو سەرچـاوانە گەلێك زۆرن و لە بەردەستی هەموانـدان، بـەڵام بـە دەگمـەن نـەبێت ناویـان نـەهاتووە و بـڵاو نەكراونەتـەوە و گرنگییـان پـێ نـەدراوە، مەگـەر لەلایـەن خۆرهەڵاتناسـانەوە نــەبێت.. وەكــو بڵێیــت یانــەكانی بڵاوكردنــەوە و

[٣] محمد أحمد خلف الله، علي عبدالرازق، د محمد حسين هيكل.. و ئەوانی تریش.

ساغکردنەوە پەیڕەویی توێژەرەوانی فیکری سیاسیی ئیسلامیی و سەرچاوەکانیان دیاریی دەکەن بەو شێوەیەی ئەوەی چاپکراوە هەیە و ئەوەش کە چاپ نەکراوە نییە، کە پێچەوانەکەی راستە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە کەمی نەبێت مامەڵە لەگەڵ چاپکراودا نەکراوە سەرەڕای بوونی لە کتێبخانە گشتییەکاندا.

تەوەرەی ئەم توێژینەوەیە لە بارەی سەرەتاییترین رێساکانی توێژینەوەی زانستییە کە بریتییە لە خوێندنەوەی بابەتیانە پێش گشتاندنی دەرەنجامەکان. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بابەتی فیکری سیاسیی ئیسلامیی یان کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی دیاردەیەکە پەیوەستە بەچەند سەردەمێکی مێژووییەوە کە ئێمە ناتوانین بیبینین یان تێبینیی راستەوخۆی لەسەر بدەین، یان تێبینییەکانی لەسەر وەرگرین بە سەرنجدانیان و تاقیکارییان و راپرسییان و لێکۆڵینەوەی بارودۆخیان و.. تاد، بەڵکو تاکە هۆکاری توێژینەوەی ئەو دیاردەیە بریتییە لە خوێندنەوەی بابەتیانەی نووسراوەکان و رووپێوکردنی مێژووی فیکری ئیسلامیی لە رێگەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان بە مەبەستی توێژینەوەی ماهیەتی بابەتەکە و رەگەزەکانی نەك پشت بەستن بە نووسەرو نوسراوێکی دیاری کراو، بەبێ دەرکردنی بڕیاری پێشوەخت یان گریمانەی پێشتر سەبارەت بە سروشتی ئەو کەلەپوورە و نرخ و پێکهێنەرەکانی. یان هەڵوێستی لەگەڵ یان دژ وەربگرین، بەڵکو دەبێ بە عەقڵ و ژیریەکی کراوەی وەها بچینە ناو بابەتەکەوە، کە بابەت و چەمکی سیاسەت لە بیری ئیسلامدا وەك پێوەرێك بۆ دیاریکردنی ئەوەی کە دێتە ناو بازنەی زانستی سیاسیی یا کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی و ئەوەش کە نایەتە ناوی، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە

نـاتوانین بڕیـار بەسـەر دیاردەیەکـدا بـدەین تـەنها لـەدوای ناسـینی ئـەو دیاردەیـە لـە نزیکـەوە نـەبێت بـە شـێوەی هـەموەکی و گـشتگیر، پاشـان خـستنەڕوو شـیکردنەوەی لـە ژێـر ڕۆشـنایی و ریزبەنـدی ڕێـچکەی بـیرو ئاخاوتنی زمانەوانیی و بارودۆخی مێژووییدا، لە دوای ئەوە ئینجا دەکرێت هەڵوێـستی جیـاوازو جـۆراو جـۆر هـەبن لـەبارەی دەرەنجامـەکان و هەڵسەنگاندنیان و ئەوکاتە گشت ئەو دەرەنجامانـە شـیاو و گونجـاو دەبـن، بە ئەندازەی پەیوەستبوون بە بنـەماکانی پـەیڕەوی توێژینـەوەی زانستیی بنیاتنراو لەسەر بنەمای خوێندنـەوە پـێش دەرکردنـی بڕیـار، ناسـین پـێش گشتاندن و هەڵسەنگاندن.

بە پشتبەستن بـەو ڕێسایەش ئـەم توێژینەوەیـەی بەردەسـتت گرنگیـی دەدات بــە نیــشاندانی سەرچــاوە کەلەپوورییــە راســتەوخۆکانی زانــستی سیاسیی، ئـەو سەرچـاوانەی کـە بـە هـەموو ئـەو کەسـانەی لـەو بابەتـەیان نووسیوە تەنها شەشیەکی ئەو سەرچاوانەیان بینیوەو کەسیشیان نییـە بـە تەنها کە ((٦٪))ی ئەو سەرچاوانەی بەکارهێنابێت.

لێرەدا تێبینییەکی گـرنگ دەمێنـێ کـە دەیخەینـە روو، ئـەویش ئەوەیـە ئــەم توێژینەوەیــە ئــەو بابەتانــە ناگرێتــەوە کــە لــەبارەی پەیوەندییــە نێودەوڵەتییەکانن، بەڵکو هەموو لە بارەی زانستی سیاسییەوەیە بـە گـشت مەودا ناوخۆییەکانـەوە. بـەڵام بـواری پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان ئـەوە سەرچــاوە ی ســەربەخۆی هەیــە، توێــژەریش هەڵــساوە بــەئامادەکردنی لیــستێك لــەو بــوارەدا لــەکاتی کــارکردنی لــە پــڕۆژە ی پەیوەندییــە نێودەوڵەتییەکان لە ئیسلامدا کە لە کۆلیژی ئـابووریی و زانـستی سیاسـیی زانکۆی قاهیرە بە هاوکاریی لەگەڵ پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی لە

واشنتۆن لە ساڵی ١٩٨٧ەوە کاری لەسەر دەکرێت و ئێستا لە قۆناغی دارشتنەوەی کۆتاییدایە.

خواش لە دوای مەبەستە و هەر ئەویش رێنمای رێگای راستە..

**نووسەر**

**واشنتۆن**

**رەمەزان ١٤١٤ ك**

**ئازار/ مارس ١٩٩٣ ز**

## وتەیەك سەبارەت بە رەوش و قۆناغەكانی ئەم توێژینەوەیە

بیرۆكەی ئەم پرۆژەیە كاتێك گەڵاڵە بوو و دەستی پێكرا كە لە ساڵی ١٩٨٦ دا دەستنووسێكی (محمد ابن خليل الاسدي (٨٥٤ ك))م بەردەست كەوت، بۆم روون بوویەوە كە ئەم دەستنووسە لە هیچ لەو كتێبانەی كە لە بارەی فیكری سیاسیی نووسراون و بەردەستم كەوتوون، ئاماژەی پێنەكراوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەو دەستنووسە زۆر بەهێزە و بە پەیڕەوێكی زۆر رەسەن دیاردەی سیاسیی سەردەمی خۆی تێدا شیكردووەتەوە، ئەمەش ئەو گریمانەی لەلا دروست كردووم كە ئەوەی تائێستا زانراوە لە كەلەپوور و گەنجینەی سیاسیی ئیسلامیی، هەموو ئەوە نییە كە هەیە و نووسراوە لە مێژووی موسوڵماناندا لە بارەی سیاسەتەوە، كە لە خودی خۆیدا سیاسەت چالاكییەكی بنچینەی شارستانیەتی ئیسلامییە و چەندەها جۆر چالاكیی تری پێوە بەندە. هەروەها ئەوەش دەركەوت كە لەوانەیە چەندەها نووسراو و سەرچاوەی تر هەبن و تا ئێستا باس نەكراون یان توێژینەوەو لێكۆڵینەوەیان لەسەر نەكراوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كە كەلەپووری ئیسلامیی بە گشتیی تا ئێستا هەوڵێكی كاریگەری وەك پێویستی بۆ نەدراوە كە كۆبكرێتەوە و پێڕست و پۆلێنی بۆ بكرێت، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەو كەلەپوورە لە چەندەها جێگای پەرتووبڵاوی دنیادا هەیە. بۆیە پێم وایە كە دەبێ هەوڵی ئەوە بدرێت كە بە رێگەیەكی زانستییانە پەیڕەو ئامێز ئەو سەرچاوانە بناسرێن و بە شێوەیەكی وردو روون رێكبخرێن كە چیدیكە كەموكورتییان دەرهەق نەكرێت، لەو پێناوەشدا ئەم هەنگاوانە نران:

**یەکــەم:** ئامــارو رووپێــوکردنی ئــەو نووســراوانەی کــە بــە نــاوی نووسەرەکانیانەوە ناسراون وەك نموونەیەك لـە گـرنگترین نووسـراوەکانیان نەك گشت نووسینەکانیان بۆ نموونە:

١- کتێبی ((الأعلام))ی ((الزركلي)).

٢- کتێبی ((معجم المؤلفين))ی ((عمر رضا كحالة)).

٣- هەندێ کتێبی ناودارانی ئاینزا (مذهب)ـەکان بە تایبـەتی نـاودارانی مەزهــەبی حەنبــەلیی و ((طبقـات الـشافعية)). توێژینــەوەی ســەرەوە بــە پشتبەستن بە ناو - نە نیوەرۆك -ی سەرچاوەگەلێك ئەنجام درا کە هەست دەکرا باسـی بابـەتێك دەکـەن کـە لـە چوارچـێوە ی زانـستی سیاسـەتدا - زانــستی سیاســەتێك کــە موســوڵمانان دەیناســن - جێگــەی دەبێتــەوە. کارکردن و کاری بەردەوام لەگەڵ سەرچاوەو ناوەکانیان، دەسەڵاتی ناسـین بە توێژەر دەدات هەتا بە سەرنجدانی ناوی کتێب، بتوانرێت سەرچـاوەکانی خـۆی لـە نێـو زنجـیرە جۆراوجۆرەکانـدا بناسـێتەوە و بدۆزێتـەوە. هـەموو سەرچـاوە هەڵبـژێردراوەکان، ئەگـەر پەیوەنـدیی نزیکیـان بـە بابەتەکـەوە هەبووبێت یا نەبووبێت، تۆمار کراون، چونکە هەڵە لـە هەڵبژاردنـدا، پاشـان خــستنەبەرباس و ئــەنجاموەرگرتن، راســترە لــە هەڵــەی گوێپێنــەدان و نەزانکاری لە هەڵبژاردندا، تۆمارکردنی کتێبێك کە دواتر رۆشن ببێتـەوە کـە پەیوەندی بە بابەتەکەوە نییە باشترە لەوەی کـە کتێبێـك ئەگـەری ئـەوەی هەبێت پەیوەندیی بـە بابەتێکـەوە هـەبێت، بـەڵام گـوێی پێنـەدرابێت. لـەم قۆناغەدا، لیستێکی دوورو درێژ لە سەرچاوە هاتە بەردەست. لـەم لیـستەدا هەڵەی جۆراو جۆر هەبوو کە گرنگترینیان بریتی بوون لە:

١- سەرچــاوەكانی ســـەرەوە هەریەكـــە و بـــە رەوشـــێكی تایبـــەت نووســـرابوون. هەنـــدێ سەرچـــاوە، نووســـەرانیان لەســـەر بنـــەمای نـــاوی بنەماڵەیی و مێژوویی كۆچی دواییان ریزبەنـدیی كـردووەو هەنـدێكی تـریش بـەپێی نـاوی یەكـەم و مێـژووی كۆچـكردنی.. لـەم رووەوە نـاوی نووسـەرو كتێبەكەی چەند جار تۆمـار كراوەتـەوە، جـارێ بـە پێـی نـاوی بنەماڵـەیی، جارێكی تر لەسەر بنەمای ناوی یەكەمی، جارێكی تر لەسەر بناغـەی نازنـاو و.. من ناوە دووبارەبووەكانیشم تۆمار كردووە، چونكە ناوە عەرەبییەكان، خزمایەتییەكان، هۆزەكان و نازناوە لە یەك نزیكەكان و لێكچووەكان، زۆرن ئەوانەی كە هاوناو و بە هۆزێ، یا شارو كارێكی هاوشێوە ناسراون، بەڵام لە رۆژگاری جیاوازدا ژیاون.

٢- ناوی هەندێ لە نووسراوەكان ئاماژەیان بە سیاسەت تێدابوو، بـەڵام بابەت و نێوەڕۆكیان پەیوەندیی بەم زانستەوە نەبوو، بـۆ نموونـە ((سیاسـة الـصبیان)) كـە نوسـراوی ((ابـن الجـزار))ە كـە كتێبێكـی پەروەردەییـە، هەروەها ((سیاسة المریدین)) كە سەبارەت بە تەسەوفە، ((سیاسـة البقـر)) نوسـراوی دكتـۆر ((مـصطفی حـسن)) (چـاپی ١٢٦٤ ك) كـە سـەبارەت بـە پزیـشكی ئاژەڵییەوەیـە ((الـروض الآســي في الطـب الـسیاسي)) نوسـراوی ئیبراهیم پاشا كە لە كۆتاییـەكانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا نووسـیویەتی، كـە كتێبێكە لە پزیشكیی و زانستی توێكاریی (تشریح)دا.

**قۆناغی دووەم:** خستنە بەرباسی كتێب ناسینی پێش سـەردەمی چـاپ، وەكو:

١- ((الفهرست، ابن الندیم)).

٢- ((كشف الظنون)) حاجی خەلیفە.

٣- ((ايضاح المكنون في الزيل على كشف الظنـون)) ئيـسماعيل پاشـاى بەغدادى (كۆچكردوو لە ١٩٢٠ ز دا).

٤- (هديـة العـارفين في اسمـاء المـؤلفين وآثـار المـصنفين)، ئيـسماعيل پاشاى بەغدادى.

لەم قۆناغەشدا هەروەكو قۆناغى رابـووردوو، دەسـتكرا بـە هەڵبـژاردن و تۆماركردنى ناونيشانى كتێبگەلێك كە پەيوەندييان بە زانـستى سياسـييەوە هەبوو. ئە ڵبەتە لەم هـەنگاوەدا، راسـتيى ئامـاژە بـە نووسـەرى كتێبـەكان خرايــە بــەرباس و هەڵــەكانى قۆنــاغى پێــشتر كــە ئامــاژەى بــە چــەند نووسەردەكرد كە كرابوونە خاوەنى كتێبێك، ئەمە چارەسەر كرا.

**قۆناغى سێيەم: پێڕستى دەستنووسەكان:** توێژەر هەستاوە بە هـاوێرى (جرد) دەستيى بۆ پێڕستى دەستنووسەكانى خانـەى كتێبـى ميـسريى (دار الكتب المصرية) و خانەى كتێبى ئەزهەر (دار الكتب الازهريـة) و پـەيمانگاى دەستنووسى عەرەبيى لە قاهيرە. پێڕستى نووسينە دەستنووسەكانى ئـەو كتێبخانانەى كە لە بەردەستدا بوون خرايە بـەرباس هـەتا دەركـەوێت، ئايـا ئەم كتێبانە لە ناوچوون يان لە كوێدا پارێزگـارى دە كـرێن. لـەم قۆناغـەدا، ناونيشانێكى زۆرمان دەستكەوت كە لـە قۆناغـەكانى رابـردوودا شـوێنەوارى ئەوانە هەر ديارنەبوو، بە تايبەتى هەندێ لە ليستەكان زانيارييگەلێكيان لـە نێوەڕۆكى كتێبەكان پێشكەش دەكرد كە بۆ ديـاريكردنى بابەتەكـەى بـەس بوو. تواناى دەستخستنى تەواوى پێڕستە دەستنووسەكانى جيهانم نـەبوو. دكتۆر كۆركيس عەوواد كە لە كتێبەكەى خۆيـدا ليـستێكى لـە دەستنووسـە

ئیـــسلامییەکان و شـــوێنی پاراســـتنیان لـــە جیهانـــدا ئامـــادە کـــردووە[4]،

کتێبناسییەکی لە پێڕستی دەستنووسەکان بە زمانە جۆراوجۆرەکان ئامادە کردووە کە دەگاتـە (٣١١٥) لـە سەرچـاوە و لـە کتێبخانـەی ئـەم وڵاتانـەی خوارەوەدا پاریزگاری دەکرێت:

یەکێتیی سۆڤیەت، نەمسا، ئەردەن، ئێرلەندا، ئیسپانیا، ئـە فغانـستان، ئە ڵمانیا، ئیماراتی عەرەبیی یـەکگرتوو، ئەمـەریکا، ئەندونیـسیا، جـەزائیر، ئیتالیا، بـەحرەین، بـەرازیل، بولغارسـتان، پورتوگـال، پاکستان، تانزانیـا، چاد، چین، چیکۆسـلۆڤاکیا، ئیـسیوپیا، دانیمـارك، رۆمانیـا، سـاحیل عـاج، سەنیگال، سودان، سوریا، عەرەبستانی سعودیی، سویـسرا، عومـان، غانـا، فەرەنسا، فەلەستین، فەنلانـد، قەتـەر، کـامیرۆن، کەنـەدا، کوەیـت، لیبیـا، هەنگاریا، مالیی، پۆڵەندا، ماداگاشکار، میسر، مەغریب، مۆریتانیا، نەرویـژ، نەیجیریا، هیندستان، هۆڵەندا، ڤاتیکان، یەمەن و یۆگۆسلاڤیای پێشوو.

لـــەم وڵاتانـــەدا کتێبخانـــەی جـــۆراو جـــۆر لـــە زانکۆکـــان، ناوەنـــدە نیشتمانیەکان، ئەنیستیتۆکان، مزگەوتەکان و کلیساکاندا هەیـە، مـن تـەنها گەڕاومەتەوە بۆ ئەم پێڕستانەی خوارەوە، چونکە جگـە لەمانـە ئـەوانی تـر عەرەبیی نەبوون.

کۆڕی زمانی عەرەبیی لە دیمەشق، پێڕسـتی دەستنووسـی ((دار الکتـب الظاهرية)) لە سوريا.

[4] كوركيس عواد، فهارس المخطوطات العربية في العالم، الكويت: معهد المخطوطات العربيـة، ١٤٠٥ﻫ – ١٩٨٤م.

– الـدكتور محمـد عبـدالله عينـان، پێڕسـتی دەستنووسـی کتێبخانـەی پاشایەتی لە مەغریب.

– چەلەبی موسڵی، دەستنووسەکانی موسڵ – عیراق.

– دکتۆر عەلی سامی نەشار، پێڕستی دەستنووسی مزگەوتی ئەحمەدیی لە تەنتای میسر.

– دکتـۆر یوسـف عیـزەددین، پێڕسـتی دەستنووسـی عـەرەبیی لـە کتێبخانەی نیشتمانیی ((سۆفیا)) لە بولگارستان.

– پێڕستی دەستنووسی مۆزەخانەی ئاسیایی بەلگراد لە یۆگۆسلاڤیای پێشوو.

– پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی کوبریلی ئەستەمبوڵ لە تورکیا.

– حەمیـد مەجیـد هـدو، پێڕسـتی دەستنووسـی کتێبخانـەی ((مدینـة العلم)) ئیمامی خالیسی لە کازمیەی بەغداد.

– مـەحمود ئەحمـەد موحەممـەد، پێڕسـتی دەستنووسـی کتێبخانـەی ناوەندی ئەوقاف لە سلێمانی، عێراق.

– دکتـۆر موحەمـەد عبدوللـەتیف هریـدی، پێڕسـتی دوورودرێـژی دەستنووسی تورکی و فارسیی زانکۆی ئیمـام موحەمـەد کوڕی سـعود لـە عەرەبستانی سعودی.

– پێڕسـتی دەستنووسـی کتێبخانـەی ناوەنـدی زانکـۆی مـەلیك عەبدولعەزیز لە عەرەبستانی سعودیی.

– یوسف خوری، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی زانکۆی ئەمەریکایی بەیرووت لە لوبنان.

– پێڕستی دەستنووسی مزگەوتی گەورەی سەنعا لە یەمەن.

– سالم عەبدوڕڕەزاق ئەحمەد، پێڕستی دەستنووسەکان لە کتێبخانەی گشتیی موسڵ لە عێراق.

– موحەمەد عیزەت عومەر، پێڕستی دەستنووسی کۆپیکراوی کتێبخانەی ئەنیستیتۆی کلتووری زانستی عەرەبیی لە زانکۆی حەڵەب لە سوریا.

– پێڕستی دەستنووسی وێنەگیراوی زانکۆی ئەردەن.

– موحەممەد حەججی، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی ((صبیحة))ی شاری ((سلا)) لە مەغریب.

– مەحمود عەلی عەتائوڵڵا، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی حەرەمی ئیبراهیمی لە شاری خەلیل لە فەلەستین.

– دکتۆر ئەحمەدولعلیمی، پێڕستی دەستنووسی کۆلیژی بانگەواز و ئوسولی دین لە شاری عەممان، ئەردەن

– موحەمەد عابد ئەلفاسی، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی ((القرویین)) لە مەغریب.

– موحەممەد سەعیدو لقورەیحی، پێڕستی کتێبخانەی وەزیری لە ئێران

– پێڕستی دەستنووسی کۆلیژی ئەدەبیات و زانستی مرۆڤایەتیی شاری ((رباط)) لە مەغریب.

– ئوسامە ناسر نەقشبەندی، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سلێمانی لە عێراق.

– ئە حمەد تەیمور پاشا، هەڵبژاردەی دەستنووسە عەرەبییەکانی ئاستانە لە تورکیا (کە بە هەوڵی دکتۆر سەلاحەدین ئە لمونجد بڵاو کراوەتەوە).

– دکتۆر سەلاحەددین ئەلمونجید، لیستی دەستنووسی عەرەبیی لە فەلەستین.

– دکتۆر سەلاحەددین ئەلمونجید، پێڕستی دەستنووسی عەرەبیی لە کتێبخانەی کۆنگرێس لە واشنتۆن، ئەمەریکا.

– دکتۆر سەلاحەددین ئەلمونجد، پێڕستی عەرەبیی لە ((ئیمبرۆزیانا))ی میلان لە ئیتاڵیا.

– دکتۆر داوود ئەلچەلەبی ئەلموسڵی، دەستنووسی موسڵ لە عێراق.

– هەڵبژاردەیەك لە دەستنووسی عەرەبیی لە حەڵەب لە سوریا.

– دکتۆر تەها موحسین، کۆمەڵەیەك دەستنووس لە کتێبخانەی شاری ئەستەمبوڵ لە تورکیا.

– دکتۆر رەمەزان شەشن، دەستنووسی گرانبەهاو نایاب لە کتێبخانەکانی تورکیا.

– موحەمەد مەهدی نەجەف، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی گشتی ئیمامی حە کیم لە شاری نەجەف، عێراق.

– عەبدولحەفیز مەنسوور، پێڕستی گشتیی وەرگیراوی دەستنووسی کتێبخانەی حەسەن حەسەنی عەبدولوەهاب لە تونس.

– عەلی خاقانی، دەستنووسی کتێبخانەی عەباسیەی بەسرە لە عێراق.

– فوئاد سەید، پێڕستی دەستنووسی وێنەگیراو لە ئە نستیتۆی وەرگیراوی دەستنووسی عەرەبی قاهیرە لە میسر.

– یاسین موحەمەد سەواس، پێڕستی دەستنووسی ((دار الكتب الظاهرية)) لە دیمەشق)) سوریا.

– موحەمەد ئەلعەرەبی ئەلخەتابی، پێڕستی کتێبخانەی حەسەنییەی کۆشکی پاشایەتی رەبات لە مەغریب.

– پێڕستی دەستنووسی عەرەبیی پارێزراو لە ناوەندی گشتیی بەڵگەنامە و شوێنەواری شاری (رباط)) لە مەغریب.

– سەید ئەحمەد حوسەینی، لیستی وەرگیراوی دەستنووسی کتێبخانەی ((الروضة الحيدرية)) لە نەجەف، عێراق.

– ئەحمەد ئەبوعەلی، پێڕستی کتێبخانەی شارەوانیی ئەسکەندەرییە لە میسر.

– کۆرکیس عەواد، پێڕستی دەستنووسی عەرەبیی لە کتێبخانەی قاسم موحەمەد رەجەب بەغدادی لە عێراق.

– عەبدورەحمان ئەلفاسی، هەڵبژاردەیەك لە دەستنووسە نایابەکانی کتێبخانەی پادشایەتی ((رباط)) لە مەغریب.

– عەبدولحەفیز مەنسوور، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی ئەحمەدیەی مزگەوتی زەیتوونە لە تونس.

– عیماد عەبدوسسەلام، پاشماوەی دەستنووسی کتێبخانەی قادری، مزگەوتی عەبدولقادری گەیلانی بەغداد لە عێراق.

– دکتۆر عەلی ئەبا حسەین، پێڕستی دەستنووسی بەحرەین.

– لیستی وەرگیراوی دەستنووسی خانەی کتێبی نیشتمانیی لە تونس.

– ((خزر ئیبراهیم سەلامە)) دەستنووسی ((مسجد الاقصى)) لە فەلەستین.

– میخائیل عەواد، دەستنووسی کۆڕی زانیاری عێراق.

– دکتۆر موحەمەد عیسا صالحیە، دەستنووسی یەمانیی لە کتێبخانەی عەلی ئەحمەد ئەمیری گەل لە ئیستانبوڵ.

–مەحمود عەلی عەتائوڵڵا، پێڕستی دەستنووسی کتێبخانەی ((مسجد حاج نمر النابلسي)) لە فەلەستین.

– ((سعيد الديوةجي)) دەستنووسی کتێبخانەی ناوەندی شاری موسڵ لە عێراق.

– ((الخوري فسقفوس اسحاق ارملة السرياني)) گۆشەیەك لە دەستنووسی ((دير الشرفة)).

کارل برۆکلمن، مێژووی ئەدەبیاتی عەرەب.

– فوئاد سزگین / مێژووی کلتووری عەرەبیی، ئەم کتێبە لە هەشت بەرگدا ئامادەکراوە کە چوار بەرگیان بە شیعر، بەرگێکیان بەقورئان و فەرموودە، بەرگێکیان بە مێژوو، بەرگێکی تریش بە تەسەوف و بیروباوەڕ (عقائد) و بەرگی کۆتایش تایبەتمەند کراوە بە ((فقه)). ئەم ریزبە ندییە بووەتە هۆی ئەوەی کە فوئاد سزگین تەنها یەك وەرگێراو (نسخە) لەو وەرگێراوانەی منی باسکردووە کە من لە سە رچاوەی ترەوە بە دەستم هێناوە، چونکە ئەو بە پشتبەستن بە رۆژهەڵاتناسان لە زانستە ئیسلامییەکاندا، لە دەق و کلتووری ئیسلامیی نزیك کەوتووەتەوە.

– کۆرکیس عەواد، کۆنترین دەستنووسی عەرەبیی لە کتێبخانەکانی جیهاندا.

– ((عبدالله الجبوري))، پێڕستی دەستنووسی حەسەن ئەنکەرلی پێشکەش کراو بە کتێبخانەی ئەوقاف لە بەغداد.

– بەشیر قاسم یوشەع، پێڕستی وەرگیراوی دەستنووسی ((غداس)) لە لیبیا.

– دەستنووسی عەرەبیی ئەنستیتۆی توێژینەوەی ئیسلامیی لە عێراق.

– ((عمر رضا کحالة))، هەڵبژاردەیەك لە وەرگیراوی دەستنووسی شاری مەدینەی منەوەرە لە عەرەبستانی سعودیی.

– مەحمود عەلی عەتائوڵڵا، پێڕستی وەرگیراوی دەستنووسی کتێبخانەی ئیسلامیی شاری یافا لە فەلەستین.

– لە قۆناغی سێیەمدا هەندێك هەڵە روویانداوە کە تەنها ئاماژە بە بەرجەستەترین و دەرکەوتووترینیان دەکەین:

١– هەندێ جار یەك کتێب چەند ناونیشانێکی هەبوو، لەم رووەوە تۆمار دەکرا، هەندێ جار ناونیشانی کتێبەکە جێگۆڕکێی پێکراوە، هەندێ جاریش تەنها هەندێکی باسکراوە، بۆ نموونە: سیاسەتنامەی خواجە ((نظام الملك الطوسي))، بە ناونیشانی ((سیر الملوك))یش نووسراوە، ((العقد الفرید)) نوسراوی ((ملك سعید))، لە جێگەیەکی تر ناونیشانی ((نفائس العناصر لمجالس الملك الناصر في الاخلاق والسلطنة والشریعة))ی هەڵگرتبوو، پاش هەڵسەنگاندنی وەرگیراوە دەستنووسەکان، دەرکەوت کە نێوەڕۆکی هەردوو کتێب هەریەکە، هەرچەندە ناونیشانەکانیان جیاوازە.

٢– جاری واهەیە کتێبێك لە کتێبخانەیەکدا درابوویە پاڵ نووسەری دەستنووسەکە و لە کتێبخانەکانی تردا ناوی خودی نووسەرەکەیان هەردووکیانی پێوەبوو، بۆ نموونە: ((تهذیب الریاسة في ترتیب السیاسة))ی نوسراوی ((قلعي)) درابوویە پاڵ نووسەری دەستنووس (ابن دجاجة). کتێبی ((اللؤلؤ المنثور في نصیحة ولاة الامور)) لە کتێبخانەی کۆنگرێس و

خانەی کتێبی میسر درابووپە پاڵ کۆپی کارانی کتێبەکەوە. هەروەها کاتێ کە دەستم دەگەیشتە وەرگێراوەکان و دەستم دەکەوتن، دە گەڕامەوە بۆ ئەوە، جگە لەوە دەگەڕامەوە بۆ کتێبناسانی وەکو ((ایضاح المكنون بغدادي))، ((هدية العارفين بغدادي)) و ((كشف الظنون))ی حاجی خەلیفە، کە گرنگترین سەرچاوەی باوەڕپێکراون بۆ روانین لە کتێب و راستکردنەوەی ددانەپاڵ نووسەرەکانیان.

**قۆناغی چوارەم:** هەڵسەنگاندنی کتێبناسیە دەستنووسە چاپکراوەکان لەوانە:

١- ((يوسف اليان سركيس))، فەرهەنگی وەرگێراو (نسخ)ی چاپکراوی عەرەبیی لە دەرکەوتنی پیشەسازیی چاپەوە هەتا ١٩١٩ ز.

- (يوسف اليان سركيس)، هەموو لیستی دانراوە نوێیەکان لە ١٩٢٠ تا ١٩٢٦.

- د. عايدە ئیبراهیم نەصیر، کتێبە عەرەبیە بڵاوکراوەکان لە کۆماری عەرەبی یەگرتوو لە ساڵی ١٩٢٦ تا ١٩٤٠.

- د. عايدە ئیبراهیم نەصیر، هەموو کتێبە عەرەبییە بڵاوکراوەکان لە میسر لە ١٩٠٠ تا ١٩٥٢.

- ((صلاح الدين المنجد))، فەرهەنگی وەرگێراوی دەستنووسی چاپکراو لە ١٩٥٤ تا ١٩٨٠.

- لیستی کتێبخانەی ئەزهەرییە (وەرگێراو (کۆپی)ی دەستیی).

- لیستی زانکۆی قاهیرە (وەرگێراوی دەستیی).

- لیستی زانکۆی ئەمریکایی قاهیرە (وەرگێراوی دەستی).

– ((عبدالجبار عبدالرحمن)) گەنجینەكانی كلتووری عەرەبیی ئیسلامیی، رێنمای وەرگێراوە دەستنووسە عەرەبییە چاپكراوەكان هەتا ساڵی ١٩٨٠م.

–((عبدالجبار الرفاعي))، كتێبناسی سەرچاوەكانی دەوڵەت و سیاسەت لە ئیسلامدا.

لەم قۆناغەدا بۆم دەركەوت وەرگێراو (كۆپیكراو)ی دەستنووس كە لە قۆناغی رابردووەوە بە دەست هاتووە، بە چ ئەندازەیەك گەیشتوونەتە قۆناغی چاپ.

**قۆناغی پێنجەم:** ناسین، هەڵسەنگاندنی نێوەرۆك و پێشكەشكردنی كورتەیەك لە كتێبەكان و ئەو كۆپییانەی كە هەبوون لە میسر، لەم قۆناغەدا ئەنجام دران. پێویستە ئەوەش باس بكەم كە نەمتوانی بگەمە تەواوی كتێبە لەبەر گیراوەكانی خانەی كتێبی میسر.

**قۆناغی شه شەم:** گەڕانەوەی سەر لەنوێ بۆ ((الاعلام))ی زەرگەلی، ((أعلام المؤلفين))ی ((عمر رضا كحالة)) بۆ ناسینی نووسەران و ((هدية العارفين و ايضاح المكنون))ی بەغدادیی و ((كشف الظنون))ی حاجی خەلیفە، بۆ دڵنیابوون لە درانە پاڵی گومانـاوی هەندێ لە وەرگیراوی كۆپیكراو بۆ خاوەنەكانیان.

**قۆناغی حەوتەم:** لەم قۆناغەدا دانراوی هاوچەرخ كە فیكری سیاسیی ئیسلامییان باس كردبوو، توانیم دەستم بگاتە ئەوانە و خرانە ژێر هەڵسەنگاندنەوە.

سەرچاوەو هەڵێنجانی ئەم توێژینەوانە، ناسین و پشكی كلتووری سیاسیی ئەوانە دیاری كرا هەتا دەربكەوێت ئەگەرەكانی ئەم لێكۆڵینەوانە تا چ سنوورێك لەسەر ئەوە دامەزراوە.

من ئەم قۆناغانەم تێپەڕاند، روونە کە هەموو مادە و رەگەزی جێگەی چاوەڕوانی کلتووری سیاسیی ئیسلامیی، بە دەست نەهاتووە، بە دەستەواژەیەکی تر، ئەگەری سەرچاوەی نەدۆزراوە هەیە. سەرەڕای ئەمە، بە لەبەرچاوگرتنی لیستی وەرگیراوە دەستنووسەکانی هەڵسەنگێنراو، سەرچاوەگەلێك کە ئێستا بە نەبوو، یا دەستنەکەوتووم لە قەڵەم داون، لە کتێبخانەی ترو لیستی وەرگیراو و دەستنووسیاندا کە هەڵم نەسەنگاندبێ هەبن و دە ست بکەون، کە ئەم کتێبخانانە زۆر زیاترن لەو ناوەندانەی کە لیستەکانیانم هەڵسەنگاندووە. بە هەمان هۆ ئەم باسە بە دانراوەکانی رەوشی ناسین سنووردار دەکەم:

١- ئەم توێژینەوەیە لەسەر بناغەی لیستە ئامازەپێکراوەکان ئەنجامدراوە، لەم رووەوە بە زیاد کردنی هە ر لیستێکی نوێ ئەگەری ئەوە هەیە وەرگیراو (نسخە)یەکی تریش بناسێندرێ، یان وەرگیراوێك کە گومانمان لە لە ناوچوونی هە بووبێت، بدۆزرێتەوە.

٢- ئەم توێژینەوەیە جەخت لەسەر رەهەندە ناوخۆییەکانی سیاسەت دەکاتەوە، نەك پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، چونکە ئەوە بوار و سەرچاوەی تایبەتی خۆی هەیە، لەگەڵ رەچاوکردنی هەندێك کتێب کە بە سەرچاوەی ناوخۆیی دادەنرێن، لە هەندێ بەشیاندا باس لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەکەن، کە ئەمەش نەبوونی جیاوازیی ناگەیەنێت.

٣- ئەم هەڵسەنگاندنە تەنها لە سنووری سەرچاوە عەرەبییەکاندا ئەنجام دراوە، لە لایەکی تریش وەرگیراو (نسخە)ی ئیسلامیی ناعەرەبیی (کە زمانە مێژوویی و هاوچەرچ و جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە) نەناسێندراون

و له لایەکی تریش نەگەڕاوەمەتەوە بۆ لیستە ناعەرەبییەکان کە بێگومان کەم نین.

٤- ئەو سەرچاوانەی کەلەپوور کە راستەوخۆ ئاگادار بووم لێیان، ئەوانەن کە لە میسرن، هەرچی ئەوانی ترە، ئەوا لە رێگەی پێڕستی دەستنووسەکانەوە کورتەیەکم لێ وەرگرتوون.

توێژینەوەیەك کە لە بەردەمتاندایە لەسەر بنەمای قۆناغ و تەوەرە ئامـاژە پێکراوەکان ئەنجام دراوە، لەم رووەوە، هە رجۆرە رەخنەیەك لەسەر ئەم کتێبە بنووسرێت، دەبێت چوارچێوەی بنەمای زانستیانە رەچاو بکرێت، بەم شێوەیە هەوڵماندا وە کە بنەماکانی توێژینەوەی زانستییانە رەچاو بکەین، هەتاوەکو سەرچاوەی نوێ دەدۆزرێنەوە، بەبێ ئەوەی گرفت تووشی رەوشی ئەم بەرهەمە بکەین، بتوانرێت بخرێتە سەر ئەم نووسینە.

# بەشی یەکەم

## لە بارەی مامەڵەکردن لەگەڵ سەرچاوەکانی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا

بەڕاستی باسکردنی سەرچاوەکانی کەلـەپووری سیاسـیی ئیـسلامیی بـە پشکنین و توێژینەوەو لێکۆڵینەوە، کە پێویست دەکات سەرەتا شوێنی ئەو سەرچاوانە دیاری بکەین لە نووسراوە هاوچـەرخەکاندا کـە دەکۆڵێتـەوە لـە بـیری سیاسـیی ئیـسلامیی، یـان لـە یـەکێ لـە دیاردەکـانی کـە رووبـەڕووی دەبێتەوە بە پلەیەك یان بە یەکێکی تـر بـۆ پێگـەی دیـاردەی سیاسـیی لـە مێژووی بیر لە لای موسوڵمانان. لەبەر ئەوەی کە شـەرعیەتی هەسـتان بـەم جـــۆرە لێکۆڵینەوانـــە وەســـتاوە لەســـەر رادەی بـــەئاگایی لێکۆڵینـــەوە هاوچـــەرخەکان، بـــەم کەلـــەپوورە پـــێش ئـــەوەی لـــەم بارەیـــەوە بگاتـــە گشتاندنی، ئەگەر بێتـوو ئـەم لێکۆڵینەوانـە بگرێتـە بـەر، پرۆگرامـی قـوڵ و پتەوی لێدەخوێندرێتەوە، پێش ئەوەی گشتاندن بکرێت، بتوێژرێتەوە پێش ئەوەی هەڵبسەنگێنرێ، پەرتوبڵاوەکانی بابەتەکـە کۆبکەینـەوە بـە ئاگـایی لێی، پێش ئـەوەی پێگەکـەی دیـاریی بکـەیت لـە ژێرخـانی زانینـی زانـستی سیاسیی، ئەگەر بێتوو ئاوەهـا بوایـە ئـەوا بـەم جـۆرە دەبـوو کەواتـە ئـەم لێکۆڵینەوەیـە جێگـەی نـەد بـەم شـێوەیە جێگـەی نـەدەبوو، ئـەو هـەوڵ و کۆششەی کە خەرج کرابوو هیچ بیانوویـەکی نـەدەبوو، بـەڵام ئەگـەر هـاتوو لێکۆڵینـەوە هاوچـەرخە کـان لـە کـاتی مامەڵـەکردنی لەگـەڵ ئـەم دیـاردە مێژووییە ــ دوور لەلایەنداری تێڕوانین و تێکەڵکردنی رووداوەکان و چـوونی

بـەناو یەکـدا رووی دەداو رادەوەسـتێت لەسـەر پـشتبەستنی هـەبووی لـە بەردەستدا بـۆ ئاگـاداربوون لێـی بەشـێوەیەکی ئاسـان و سـووککراو، ئەمـە دادەنرێت بە گشت کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی، بـە راسـتی ئیـسلام لـە مێژوویـدا توێژینەوەیـەکی پەیوەسـتداری نەناسـیوە لـە بـارەی دیـاردەی سیاسییەوە، ئەم دیاردە پێگەیەکی نییە لـە ژێرخـانی زانستەکانی ئیـسلام هتد.. ئەگەر بێتوو ئەمە دۆخی ئەکادیمی بێـت، ئـەوا پێویـستە لێکۆڵینـەوە بکرێت و پـاڵ نەدرێتـەوە بـۆ لای بەڵگەنەویستەکان کـە تاقیکردنـەوەی بـە خۆیــەوە نــەبینیوە لــە گۆڕەپــانی واقیعــدا، کــە لــە رووی زانــستییەوە نەچەسـپاون، پـاش ئـەوەی ئـەم توێژینەوەیـە جێبـەجێ کـرا ئـەوەی کـە بەدەســت هــات لــە ناســین و لێکۆڵینــەوە لــە سەرچــاوەکانی کەلــەپووری سیاسیی ئیسلامیی ناگاتە زیاتر لە ١٨٪ لـەلای هـەموو نووسـەران و ناگاتـە ٦٪ لای هەریەکـەیان لـە سـەرجەمی نوسـراوە ئیـسلامییەکان لـە زانـستیی سیاسییدا، ئەوەی توانیومە دەستەبەری بکەم جگـە لـە رێژەیـەکی بـچووك نەبێت نەیگرتووەتە خـۆی لـە گەنجیتـەی دەستنووسـەکان لـە جیهانـدا کـە بتوانم بگەمە پێگەی ٧٦٪ ی ئەو دەستنووسانە.

# باسی یەکەم

# پێگەی سەرچاوە کەلەپوورییەکان لە لێکۆڵینەوە هاوچەرخەکانی سەبارەت بە بیری سیاسیی ئیسلامیی: توێژینەوەیەکی چەندێتیی

ئەم توێژینەوەیە بە روونیی و دیاریکراوی باسی چەندێتی ئەو سەرچاوە کەلەپوورییانــە دەکــات کــە توێــژەرە هاوچــەرخەکان لــە ئــەنجام و گـشتاندنەکانیاندا پـشتیان پــێ بەسـتوون، دیـاریکردنی رێژەکـەی بـۆلای ســەرجەمی ئــەوەی توانیومــە بگەمــە لای ئــەو سەرچــاوانە، هەشــبووە نەمتوانیوە پێی بگەم، بە راسـتی توانیومـە بگەمـە لای (٣٠٧) سەرچـاوەی کەلەپووری راستەوخۆ لـە زانـستی سیاسـیی – ئـەوەی کـە موسـوڵمانەکان ناسـیویانە – لەوانــە (١٠٥) کتێبــی چـاپکراو بــە رێــژەی ٣٤,٥٪ و (١٢٧) کتێبـیٚ دەستنووسـی شـوێن دیـاریکراو بـە رێـژەی ٤١,٥٪ و ٧٥ سەرچـاوە نەمتوانیوە پێی بگەم بۆ دیاریکردنی شوێنەکانیان پاش چە سپاندنی بوونی مێژوویان لەبەر ئەوەی من هەڵنەسـاوم مەگـەر تـەنها بـەدەورەدانیان بـەلای کەمەوە لە ٥٪ لە پێڕستی دەستنووسە هەبووەکان لە جیهاندا کـە ریزبەنـد کراوە بە هەموو زمانەکان کەمێکیان بـە عـەرەبیی نووسـراوە، ئـەویش ئـەو بەشەیە کە بۆی گەڕاومەتەوە.

پاش ئەوەی چاوم گێڕا بەسەر ٧٤ کتێبی هاوچەرخدا کە باس لـە بـیری سیاسیی ئیسلامیی دەکات، یان یەکیٚ لە دیاردە کان بۆ دیاریکردنی پێگەی

**سەرچاوە کەلەپوورییەکان لەم پەڕتووکانە وەرگیراوە ئەم ئەنجامانەی خوارەوەم دەرهێناوە:**

**(١)– یەك پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ٣٣ سە رچاوە بەڕێژەی ١١.٠/٪[٥].**

**(٢)– یەك پەرتووك گەراوەتەوە بۆلای ١٩ سە رچاوە بە رێژەی (٥,٦٪)[٦].**

**(٣)– یەك پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ١٦ سەرچاوە بەڕێژەی ٥ ٪[٧].**

**(٤)– یەك پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ١٤ سەرچاوە بەڕێژەی ٤,٦٪[٨].**

**(٥)– دوو پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای١٣ سەرچاوە بەڕێژە ی (٤,٤٪)[٩].**

**(٦) – پێنچ پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ١٢ سەرچاوە بەڕێژەی ٤٪[١٠].**

---

[5] د. صلاح الدين بسيوني رسلان، الفكر السياسي عند الماوردي (بیری رامیاری لەلای ماوەردی). القاهرة، دار الثقافة للنشر والتوزيع (١٩٨٣).

[6] د. محمد عابد الجابري، العقل السياسي العربي محدداته وتجلياته (عەقڵی رامیاریی عەرەبیی، دیارییکەرانی و دەرکەوتنەکانی) بيروت المركز الثقافي العربي، الطبعة الثانية (١٩٩١م).

[7] كايد يوسف محمود قرعوش طرق انتهاء ولاية الحكام في الشريعة الاسلامية والنظم الدستورية (رێگاکانی کۆتایی هاتنی ویلایەتی فەرمانڕەوایەکان لە شەریعەتی ئیسلامی و سیستمە دەستوورییەکان)، بيروت، مؤسسة الرسالة (١٩٨٧ م).

[8] د. مصطفى حلمى، نظام الخلافة بين اهل السنة والشيعة (سیستمی جێنشینی لە نێوان ئەهلی سوننە و شیعەدا) القاهرة، دار الدعوة، الطبعة الاولى (١٩٨٨م).

[9] د.حسين فوزي النجار، الاسلام والسياسة (ئیسلام و رامیاری)، القاهرة، دار الشعب (١٩٧٧م) و د. مصطفى حلمى نظام الخلافة في الفكر الاسلامي (ڕژێمی جێنشینی لە بیری ئیسلامی) القاهرة: دارالانصار (١٩٧٧م).

[10] د. حوريه توفيق مجاهد، الفكر السياسي من افلاطون الى محمد عبده (بیری رامیاری لە ئەفلاتۆنەوە تا موحەممەد عەبدە)، القاهرة، مكتبة الانجلو المصرية. (١٩٨٦م). د. احمد شلبى السياسة والاقتصاد في التفكير الاسلامي (رامیاری و ئابووری لە بیرکرنەوەی ئیسلامی)، القاهرة، مكتبة النهضة المصرية.الطبعة الثالثة (١٩٧٤م)، د. سمير عالية، نظرية الدولة وآدابها في الاسلام

**(٧)–سێ پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ١١ سەرچاوە بە ڕێژەی ٣,٦٪[11] .**

**(٨)– حەوت پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ١٠سەرچاوە بەڕێژەی ٣,٢٪[12] .**

---

(بیردۆزی ولأت و رەوشتە کانی لە ئسلامدا) دراسة مقارنة (توێژینەوەیەکی بەراوردکارییە)، بیروت المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، الطبعة الاولى (١٩٨٨م)، سعدي ابو جيب، دراسة في المنهاج الاسلام السياسي (لێکۆڵینەوەیەك لە پرۆگرامی ئیسلامیی سیاسیی)، بیروت مؤسسة الرسالة، الطبعة الاولى، (١٩٨٥م)، د.محمد جلال شرف، د. عبد المعطي محمد، الفكر السياسي في الاسلام (بیری سیاسیی لە ئیسلامدا)، شخصيات ومذاهب (کەسایەتییەکان و ڕێبازەکان)، الاسكندرية: دار الجامعات المصرية (١٩٧٨م).

[11] د. محمد الشحان الجندى، معالم النظام السياسي في الاسلام مقارناً بالنظم الوضعية (زانراوەکانی سیستمی سیاسیی لە ئیسلامدا بە بەراوردکردنی لەگەڵ سیستمی دەستکرد)، القاهرة دار الفكر العربي (١٩٨٦م)، د.احمد شلبي، السياسة في الفكر الاسلامي (سیاسەت لە فیکری ئیسلامییدا)، القاهرة المكتبة النهضة المصرية، الطبعة الخامسة (١٩٨٣م)، د. حسين فوزي النجار، الاسلام والسياسة (ئیسلام و سیاسەت)، القاهرة: دارالمعارف، (١٩٨٥م).

[12] باقر شريف القرشي، نظام الحكم والادارة في الاسلام (سیستمی فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبردن لە ئیسلامدا)، النجف الاشرف: مطبعة الادآب الطبعة الاولى (١٩٦٦م) - د. حازم عبد المتعال الصعيدي، النظرية الاسلامية في الدولة، مع مقارنة بنظرية الدولة في فقه الدستوري الحديث (بیردۆزی ئیسلامی لە دەوڵەتدا لەگەڵ بەراوردکردن بە بیردۆزی دەوڵەت لە فیقهی دەستووریی نوێدا) القاهرة دار النهضة العربية... (١٩٧٧م)، د. محمد عبد القادر ابوفارس، النظام السياسي في الاسلام (سیستمی سیاسیی لە ئیسلامدا) الكويت: مطبوعات الاتحاد الاسلامي العالمي للمنظمات الطلابية، (١٩٨٤م)، د. محمد عمار، الاسلام وفلسفة الحكم (ئیسلام و فەلسەفەی فەرمانڕەوایی) بيروت المؤسسة العربية للدراسات والنشر الطبعة الثانية (١٩٧٩م) ــ علي محمد الأغا، الشورى والديمقراطية (راوێژو دیموکراتیەت) بحث مقارن في الاسس والمنطلقات النظرية (توێژینەوەیەکی بەراوردکاریی لە بنچینەکان و دەرچوونەکان). بيروت المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر، الطبعة الاولى (١٩٨٣م) — سعيد بن سعيد دولة الخلافة، دراسة في التفكير السياسي عند الماوردي (دەوڵەتی جێنشینی، لێکۆڵینەوە لە بیرکردنەوەی سیاسیی لای ماوەردی)، الرباط: منشورات كلية الاداب والعلوم الانسانية د.ــ. محمد

**(٩)– حەوت پەرتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ٩ سەرچاوە بەرێژەی ٣.٪[13].**

**(١٠)– سێ پەرتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ٨ سەرچاوە بەرێژەی ٢,٦٪[14].**

**(١١)– شەش پەرتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ٧ حەوت سەرچاوە بەرێژەی ٢,٣٪[15].**

---

رافت عثمان: رياسة الدولة في فقه الاسلامي (سەرکردايەتيی دەوڵەت لە فيقهی ئيسلاميیدا) القاهرة: دار الكتاب الجامعي، (١٩٧٥م).

13 د. محمد سلام مدكور، معالم الدولة الاسلامية (نيشانەکانی دەوڵەتی ئيسلاميی): الكويت مكتبة الفلاح (١٩٨٣م)، د. حازم عبدالمتعال الصعيدي، الاسلام والخلافة في العصر الحديث (ئيسلام و جێنشينی لە چەرخی نوێدا) القاهرة: مكتبة الاداب، الطبعة الاولى (١٩٨٢م)، فتحى الدربني، خصائص التشريع الاسلامي في السياسة والحكم، (تايبەتمەنديەکانی تەشريعی ئيسلامی لە راميارى و فەرمانڕەواييدا) بيروت مؤسسة الرسالة _ الطبعة الاولى (١٩٨٤م)، د. صلاح الدين دبوس، الحاكم واصول الحكم في النظام الاسلامي (فەرمانڕەواو بنچينەی فەرمانڕەوايی لە سيستمی ئيسلاميدا)، القاهرة: دار الفكر العربي (١٩٨٥م)، احمد مبارك البغدادي، الفكر السياسي عند ابي الحسن الماوردي (فيکری سياسيی لای ئەبو حەسەنی ماوەرديی) الكويت: مؤسسة الشراع الطبعة الاولى (١٩٨٤م) د.صبحى الصالح، النظم الاسلامية نشأتها وتطورها (سيستمە ئيسلاميەکان و پێگەيشتنی و گۆڕانکاريەکانی) بيروت: دار العلم للملايين، الطبعة الاولى (١٩٦٥م).

14 د. مصطفى كمال وصفى، النظام الدستوري في الاسلام مقارناً باالنظم العصرية (سيستمی دەستووريی لە ئيسلامدا بە بەراورد لەگەڵ سيستمە هاوچەرخەکاندا) القاهرة، مكتبة وهبة (١٩٧٤م)، د. محمود الخالدي معالم الخلافة في الفكر السياسي الاسلامي (نيشانەکانی جێنشينی لە فيکری سياسيی ئيسلاميیدا) بيروت، دار الجيل، الطبعة الاولى (١٩٨٤م)، د. نيفين عبدالخالق، المعارضة في الفكر السياسي الاسلامي (نەياريی لە فيکری سياسيی ئيسلاميیدا)، القاهرة مكتبة الملك الفيصل: الطبعة الاولى (١٩٨٥م).

15 د. محمد سليم العوا، في النظام السياسى للدولة الاسلامية (لە سيستمی سياسيی بۆ دەوڵەتی ئيسلاميی) القاهرة: المكتب المصري الحديث، الطبعة السادسة (١٩٨٣م)، - د. حسن صبحي احمد عبدالطيف، الدولة الاسلامية وسلطتها التشريعية (دەوڵەتی ئيسلاميی و دەسەڵاتە تەشريعييەکەی) الاسكندرية مؤسسة شباب الجامعة د. ت - د. توفيق عبدالغني الرصاص: اسس العلوم السياسية في

**(١٢)– پێـنج پـەڕتووك گەڕاوەتـەوە بـۆلای شـەش سەرچـاوە بەڕێـژەی ٢٪.[16]**

**(١٣)– سـێ پـەڕتووك گەڕاوەتـەوە بـۆلای پێـنج سەرچـاوە بـە ڕێـژەی ١,٦٪.[17]**

---

ضوء الشريعة الاسلامية (بنچينەكانی زانستی سياسيی لـە ژێـر رۆشـنايی شـەريعەتی ئيـسلامييدا) القاهرة الهيئة المصرية العامـة للكتـاب (١٩٨٦م)، - عبـدالكريم الخطيـب، الخلافـة والامامـة، ديانـة وسياسة... دراسة مقارنة للحكم والحكومة في الاسلام (جێنشينيی و پێشەوايەتيی، ئاين و سياسـيی: لێكۆڵينەوەيەكی بەراوردكاريی فەرمانڕەوا و فەرمانڕەوايی لە ئيـسلامدا) القـاهرة دار الفكـر العربـي الطبعة الاولى (١٩٦٣م) د. احمد شـوقي الفنجـري، كيـف تحكـم بالاسـلام في الدولـة العـصرية (چۆن فەرمانڕەوايی دەكەيت بە ئيـسلام لـە دەوڵـەتی هاوچـەرخدا) القـاهرة الهيئـة المـصرية العـام للكتـاب (١٩٩٠م) — د. حسن بسيوني، الدولة ونظام الحكم في الاسلام (دەوڵـەت و سيـستمی فـەرمانڕەوا لـە ئيسلامدا) القاهرة عالم الكتب — الطبعة الاولى (١٩٨٥م).

[16] د. محمد ضياءالدين الريس، النظريات السياسية الاسـلامية (بيردۆزەكـانی سياسـيی ئيـسلاميی) القاهرة دار التراث: الطبعة السادسة (١٩٧٦م) — د. عبـد الحميـد متـولي، مبـاديء نظـام الحكـم في الاسلام مع المقارنة بالمباديء الدستورية الحديثة (سەرە تاكانی سيستمی فە رمانڕەوا لە ئيسلامدا بـە بـەراوردكردن لەگـەڵ سـەرەتاكانی دەسـتووری نوێـدا) الاسـكندرية منـشاة المعـارف، الطبعـة الثانيـة (١٩٧٤م)، — د. زكريا عبد المنعم الخطيـب: نظـام الـشورى ونظـام الديمقراطيـة المعاصـره (سيـستمی راوێژو سيـستمی ديموكراتيـە هاوچـەرخەكان) القـاهرة: المطبعـة الـسعادة (١٩٨٥م) — د. سـعد محمـد خليل، تولية رئيس الدولة في الفكر السياسي الاسلامي والفكـر الـسياسي الحـديث (دانـانی سـەرۆكی وڵات لە فيكـری سياسـيی ئيـسلاميی و فيكـری سياسـيی نوێـدا) القـاهرة المؤسـسة العربيـة الحديثـة (١٩٨٨م) — د. محمـد عزيـز نظمـى سـالم: الفكـر الـسياسي والحكـم في الاسـلام (فيكـری سياسـيی و فەرمانڕەوايی لە ئيسلامدا)، الاسكندرية مؤسسة الشباب الجامعة د. ت.

[17] د. محمـد عمـارة، الـدين والدولـة، (ئـاين و دەوڵـەت) القـاهرة، الهيئـة المـصرية العامـة للكتـاب (١٩٨٦م) — عزالـدين التميمـي، الـشورى بـين الأصـالة والمعاصـرة (ڕاوێـژ لـە نێـوان رەسـەنايەتی و هاوچەرخێتيدا) عمان، دار البشير، الطبعة الاولى (١٩٨٥م)، -- تقي الدين النبهانى، نظام الحكم في

(١٤)– هەشت پەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای ٤ چوار سەرچاوە بـە ڕێـژەی ١,٣٪[18].

(١٥)– پێنچ پـەڕتووك گەڕاوەتـەوە بـۆلای ٣سـێ سەرچـاوە بـە ڕێـژەی ١٪[19].

---

الاسلام (سیستمی فەرمانڕەوایی لە ئیسلامدا) القدس، منشورات حزب التحرير، الطبعة الثانية (١٩٥٣م).

18 د. حسن عبد الرؤف محمد، فقه الشورى في الاسلام (فيقهی راوێـژ لـە ئیـسلامدا) طنطا (مصر) مطبعة التقدم الطبعة الاولى (١٩٨٧م)، - د. فوزي الطايل، احداث ومجالات السلطة في الدولة الاسلامية (ڕووداوەكان و ئامانجەكان و بوارەكانی دەسەڵات لـە دەوڵـەتی ئیـسلامیدا) دراسة مقارنة (لێكۆڵینەوەیەكی بەراوردكاریە) القاهرة: دار النهضة المصرية (١٩٨٦م) — محمود المرداوي، الخلافة بين التنظير والتطبيق (جێنشینی لە نێوان تیـۆرو جێبەجێكردنـدا) د.ن، الطبقة الاولى (١٩٨٣م). - د. يعقوب المليحي، مبدأ الشورى في الاسلام مع المقارنة بمباديء الديمقراطيات الغربية والنظام الماركسي (بنەمای راوێژ لە ئیـسلامدا لەگـەڵ بـەراوردكردنی بـە دەسـتپێكەكانی دیموكراتیـەكانی ڕۆژئـاوایی و سیستمی ماركسیی) الاسكندرية، مؤسسة الثقافة الجامعية، د. ت - د. عبدالغفار عزيز، الاسلام السياسي بين الرافضين والغالين فيه (ئیسلامی سیاسـیی لـە نێـوان ڕەتـدەرەوانی و زیادەڕەوكەرانیـدا) القاهرة: دار الحقيقة.... للاعلام الدولي (١٩٨٩م) — د. عبد المجيد الانصاري، الشورى واثرها في الديمقراطية (ڕاوێژ و كاریگەریی لە دیموكراتیەتـدا) القاهرة: المطبعة السلفية (١٩٨١م)، - د. احمد صبحي، نظرية الامامة لدى الشيعة الاثني عشرية (بیردۆزی پێـشەوایەتی لای شیعەی دوانـزە ئیمامی) القاهرة دار المعارف (١٩٦٩م)، - احمد صديق عبد الرحمن (رملی كابلی)، البيعة في النظام السياسي الاسلامي وتطبيقاتها في الحياة السياسية المعاصرة (بەیعەتـدان لـە سیـستمی سیاسـیی ئیسلامیی و جێبەجێكردنەكانی لە ژیانی سیاسیی هاوچەرخدا)، القاهرة مكتبة وهبة الطبعة الاولى (١٩٨٨م).

19 محمد عبدالله الشيباني، نظام الحكم والادارة في الدولة الاسلامية منذ صدر الاسلام الى سقوط الدولة العباسية (سیستمی فـەرمانڕەوایی و كـارگێڕی لـە دەوڵـەتی ئیـسلامییدا، هـەر لـە سـەرەتای ئیسلامەوە هەتا كەوتنی فە رمانڕەوایی عەباسیی)، الرياض: مؤسسة الروبية للنشر والتوزيع - محمد فريحة، نظام الحكم عند الماوردي وابي يعلى (سیستمی فـەرمانڕەوایی لای مـاوەردیی و ئـەبی یـەعلا)

**(١٦)– دووپەڕتووك گەڕاوەتەوە بۆلای دووسەرچاوە بە ڕێژەی ٠,٧٪[20].**

**(١٧)– دوو پـەرتووك گەڕاونەتـەوە بـۆ لای یـەك سەرچـاوە بـە ڕێـژەی ٠,٣٪[21].**

**(١٨)– دوازدە پـەڕتووك نەگەڕاونەتـەوە بـۆ لای هـیچ سەرچـاوەیەك بـە ڕێژەی ٠,٠٪[22].**

---

بـيروت رسـالة ماجـستير غـير منـشورة، جامعـة القـديس يوسـف، كليـة الادآب والعلـوم الانـسانية (١٩٨٠م) – د. عبد الرزاق السنهوري، فقـه الخلافـة وتطورهـا لتـصبح عـصبة امـم شـرقية (فيقهـی جێنشینی و گۆڕانکاریەکانی تایبێتە کۆکەرەوەی نەتەوەکانی خۆرهەلات) ترجمة د. نادية السنهوري و د. توفيق الشاوي، القاهرة: الهيئة العامة للكتاب (١٩٨٩م) – د. محمد عمارة، الدولة الاسلامية بـين العلمانية والسلطة الدينية (دەولەتی ئیسلامیی لە نێوان عەلمانیـەت و دەسـەلاتی ئاینییـدا) القـاهرة: دار الشروق الطبعة الاولى (١٩٨٨م).

[20] د. توفيق الشاوي، فقه الشورى والاستشارة (فیقهی راوێـژو راوێـژپێکردن) المنـصوره (مـصر): دار الوفاء للطباعة والنشر (١٩٩٢م)، - علي عبدالرازق: الاسلام واصول الحكم: بحث في الخلافة والحكومة في الاسلام (ئیسلام و بنەڕەتی فەرمانڕەوایی: توێژینەوەیەك، جێنـشینی و حکومـەت لـە ئیـسلامدا) القاهرة: مطبعة مصر، الطبعة الثانية (١٩٢٥م).

[21] د.حسين فوزي النجار، الدولة والحكم في الاسلام (دەولەت و فەرمانڕەوایی لە ئیـسلامدا) القـاهرة، كتاب الحرية الطبعة الاولى (١٩٨٥م) د. فؤاد محمد الشبل: الفكر السياسي: دراسات مقارنة للمذاهب السياسية والاجتماعية، (هزری سیاسـیی بـۆ لێکۆڵینـەوەکانی بـەراوردکاریی بـۆ ڕێـڕەوە سیاسـیی و کۆمەلایەتییەکان) القاهرة: الهيئة العربية العامة للكتاب (١٩٧٤م) (باسـی یـەك بەنـدی بریتییـە لـە بنەماکانی فە رمانڕەوایی لە ئیسلامدا).

[22] د.محمد حسين هيكل، الحكومـة الاسـلامية (دەولـەتی ئیـسلامی)، القـاهرة: دار المعـارف، الطبعـة الثانيـة (١٩٧٧م)، - د.محمـد احمـد خلـف الله، دراسـات في الـنظم وتـشريعات الاسـلامية (چـەند توێژینەوەیەك لە سیستم و تەشریعاتەکانی ئیسلامی) القاهرة مكتبة الانجلو المصرية (١٩٧٧م)، - د. عبدالحميد متولي: مبدأ الشورى في الإسـلام (بنـەمای راوێـژ لـە ئیـسلامدا) القـاهرة، عـالم الكتـب، الطبعة الثانية (١٩٧٢ م). د. محمد يوسف موسى، نظام الحكم في الاسلام (سیستمی فەرمانڕەوایی لە ئیسلامدا)، القاهرة دار الكتاب العربـي للطباعـة والـنشر، الطبعـة الثانيـة، - محمـد عطـا المتوكـل،

له چوارچێوەی خوێندنەوەکانی پێشوودا تێبینی ئەم خاڵانەی خـوارەوە دەکرێت:

**یەکەم:** زۆربەی ئەو پەڕتووکانەی کەدەورێکی گەورەیان گێڕاوە لە ژیانی ڕۆشــنبیریی هاوچــەرخدا و کاریــان کردۆتــە ســەر تێڕوانینــی زۆرێــك و هەڵوێـستیان لــە بـیری سیاسـیی ئیـسلامیدا دیـوە و کۆمــەڵێ پرسـیاری جۆراوجۆریـان ورووژانـدووە کـە جێگەیـەکی نـەبووە لـە مێـشکی مرۆڤــی موسـوڵماندا، وەك ئـەوەی ئایـا سیاسـیی هەیـە لـە ئیـسلامدا یـان ئـەمیش هەروەکو مەسیحیەتی ئەوروپییە؟ ئایا فیکری ئیسلامیی بەرهـەمێکی بـیری سیاســـیی وەبـــەرهێناوە؟.. هتـــد. زۆربـــەی ئـــەم پەرتووکانـــە هیـــچیان نەخوێندووەتەوە لە کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی. پەرتووکەکـەی شـێخ عەلی عەبدولڕازق ((ئیسلام و بنچینەکانی فەرمانڕەوایی)) کە بە نیشانەیەکی دیار دانراوە کە زۆرێك پشتی پێدەبەستن لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئیسلام و پەیوەندیی بە فیکری سیاسیی و سیاسـەتەوە هـەبێ، نەگەڕاوەتـەوە تـەنها

---

المذهب السياسي في الاسلام (ڕێڕەوی سیاسیی لـە ئیـسلامدا) بـيروت مؤسـسة الارشـاد الاسـلامي – الطبعة الثانية (١٩٨٥م) – محمد صالح جعفـر الظـالی، مـن الفقـه الـسياسي في الاسـلام (لـە فیقهـی سیاسیی لە ئیسلامدا)، بيروت منـشورات دار مكتبـة الحيـاة، (١٩٧٩م) – د. عبـد الغـني عبـود، الدولة الاسلامية والدولة العـصرية (دەوڵـەتی ئیـسلامیی و دەوڵـەتی هاوچـەرخ: القـاهرة، دار الفكـر العربي الطبعة الاولى (١٩٨١م) - د. فاروق عبدالسلام، ازمـة الحكـم في العـالم الاسـلامي (قـەیرانی فەرمانڕەوایی لە جیهانی ئیسلامییدا)، القاهرة قليوب للطبع والتوزيع مصر (١٩٨١م) – د. عثمـان خليل، الديموقراطية الاسلامية (دیموکراتیەتی ئیسلامی) – القاهرة، المكتـب الفـني للنـشر (١٩٥٨م) – عـارف تـامر، الامامــة في الاســلام، (پێـشەوایەتی لـە ئیـسلامدا) بـيروت دار الكتـاب العربــي (١٩٦٤م)، صـفي الرحمـان المبـاركفوری، الاحـزاب الـسياسية في الاسـلام (پارتـە رامیارییـەکان لـە ئیـسلامدا)، القـاهرة، دار الـصحوه الطبعـة الاولى (١٩٨٧م) – صـابر طعيمـة الاسـلام ومـشكلات السياسية (ئیسلام و گرفتەکانی سیاسەت) بيروت – دار الجيل (١٩٧٤م).

بۆ دوو سەرچاوە نەبێت ئەویش ((موقەددیمەی ئیبن خەلدون)) و ((گرێی بێ وێنە ((العقد الفرید))ی ئیبن عەبد رەبە هەروەها د.موحەممەد ئەحمەد خەلەفوڵڵا کە دونیای پڕکردووە لە ژاوەژاو دەربارەی ئیسلام و سیاسەت بەشێوەیەك کە بە تەواوەتی رەتی ئەوە دەکاتەوە کە سیاسەت لە ئیسلامدا هەبێت، بۆ ئەمەش نەگەڕاوەتەوە بۆلای هیچ سەرچاوەیەکی کەلەپووریی لە زانستی سیاسیی، یان ئەو هەرنایەوێت بەو کارە هەڵسێت، هەرچەندە ئاگادارە پێی، هەمان شت دەچەسپێ بەسەر (موحەممەد حوسەین هەیکەل)دا کە هەر نەگەڕاوەتەوە بۆ هیچ سەرچاوەیەکی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی، سەرەڕای گرنگیی نووسراوەکانی و ترسناکی دەوریان لە پێکهێنانی ژیریی عەرەبی هاوچەرخدا. ئەم بەڵگانە قەناعەتمان دەداتێ کە گۆڕەپانی عەرەبیی چۆڵ و خاڵییە لە بنچینەکانی هەڵسوکەوتی توێژینەوەی ئەکادیمی راستەقینەو رەوش و پرۆگرامەکانی کە شوێن رێبازێکی زانستیی کەوتبێت و دوای بناغەیەکی بابەتیانە بکەوێت، کە سەرەنجامی بگاتە ئامانجێکی وا کە نزیك بێت لە راستییەوە و دوور بێت لە ویستەکانی ناخی خۆو سڕینەوەی راستییەکان و خۆگێل کردن لێی، لەگەڵ ئەوەی بانگەشەی ئەوەش بکەن کە ئەوە واقیعی مێژووی هاوچەرخی ئیسلامییە و جگە لەمە شتێکی تر بوونی نییە.

دووەم: بەڕاستی نووسراوە هاوچەرخەکان سەرەڕای ئەوەی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییان نەخوێندووەتەوە بە پلەیەکی ماقووڵ و نزیکیان بکاتەوە لە سنووری راستگۆیی، بەڵام ئەم هەمەجۆرییە لە توێژەرانی ئەم بابەتەش نەبووەتە هۆی هەمەجۆریی لە سەرچاوەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر ٨٠٪ لەوانە لە بارەی زانستی سیاسیی ئیسلامیی نووسیویانە

نەگەڕاونەتــەوە بـۆلای زیـاتر لـە ١٠ سەرچـاوە یـان ٣,٥٪ ی ئـەوەی ئـەم لێکۆڵینەوەیــە پێــی گەیــشتووە، ئەوانــە تــەنها سەرچــاوەکان دووبــارە دەکەنەوە، لە نێوانیاندا ڕێژەیەکی جیاوازی ئەوتۆ نابینی لە مامەڵەکردنیان لەگــەڵ سەرچــاوەکاندا، کــە هــەر هــەموویان هــەمان سەرچـاوە دووبــارە دەکەنەوە و جیاوازییان ئەوەندە نییە لە دووبارەکردنەوەی سەرچاوەکاندا، بەڕاسـتی پــەڕتووکی مـاوەردی ((الاحكـام الـسلطانية)) بــەرزترین ڕێـژەی دووبارەبوونەوەی هەیە، کە دووبارەکردنەوەی لە (٥٥) کتێب لە کۆی (٧٤) کتێبدا هاتووە، بە ڕێژەی ٧٤٪، لەگەڵ ئەوەی ئەم پەرتووکە لـە گـرنگترین پەڕتووکەکانی ماوەردیی نییە، ئەنجا لەدوای ئەو ((مقدمة ابن خلدون)) دێت ٤٥: ٧٤ بەڕێـژەی ٦٠٪، ئــەنجا پــەڕتووکی ((الـسياسة الـشرعية))ی (ابــن تیمیــة) ٤٤: ٧٤ بــە ڕێـژە ی ٦٠. /٠، ئــەنجا پــەڕتووکی ((الخـراج))ی (ابـی یوسف) ٣٢: ٧٤ بە ڕێژەی ٤٣٪ ئینجا پەڕتووکی ((الاحكـام الـسلطانية))ی (ابی یعلی) ٢٧: ٧٤ بەڕێژەی ٣٧٪، ئینجا پەڕتووکی (ابن القـیم)، ((الطـرق الحكميــة)) ٢٦: ٧٤ بــە ڕێــژەی ٣٥٪ ئینجــا پــەڕتووکی ((ابــن طقطقــی)) ((الفخــري فــی الاداب الــسلطانية)) ٢٣: ٧٤ بــە ڕێــژە ی ٣١٪، پاشــان ((الحسبة))ی (ابـن تیمیـة) دێـت ١٨: ٧٤ بەڕێـژەی ٢٤./ ئینجـا ((أراْ اهـل المدينة الفاضله))ی فارابی ١٣:٧٤ بە ڕێژەی ١٨٪.

((التـبر المـسبوك))ی غـەزالی ٧٤:١٢ بەڕێـژەی ١٦٪ ((مأثرالأنافـة))ی (القلقشندي)، ئینجـا ((فـضائح الباطنيـة))ی (غزالـي)، و ((العقـد الفريـد))ی (ابن عبد ربه) ١١: ٧٤ بە ڕێژەی ١٥٪ — ئینجـا ((القـوانين الـوزارة وسياسـة الملك))ی ماوەردی و ((غيـاث الامـم))ی جـوەینی ٩: ٧٤ بەڕێـژەی ١٢. / ٠، ئینجا ((سلوك المالك))ی (ابن ابی ربیع) و ((تحرير الاحكام))ی (ابن جماعة)

٨:٧٤ بەڕێــژەی ١١٪و ((ســراج الملــوك))ی (طرطوشـــي) و ((الــسياسات المدنية))ی فارابی ٧: ٧٤ به ڕێژەی ٩٪، ئینجا ((التاج في اخلاق الملـوك))ی (جاحظ) و، ((نهاية الرتبة في طلب الحسبة))ی شیزەری ٧٤:٦ به ڕێژەی ٨٪ ئەنجا پەرتووکی ((السیاسة))ی (حسين المغربـي) ٧٤:٥ بـه ڕێـژەی ٧٪ و ((المـنهج الـسلوك))ی شـیزری ((العثمانيــة))ی (جـاحظ) و ((زبـدة كـشف المالك))ی (ابن شاهين) و ((الدولة الاسلامية))ی (طهطاوي) ٤: ٧٤ به ڕێژەی ٥٪((لەگەڵ تێبینی ئەوەی کەسێ جار گەڕانـەوە کـراوە بـە پەڕتووکەکـەی (طهطاوي)دا له لایەن لێکۆڵکاری پەڕتووك ((د. محمد عمـارة))، پـاش ئـەوە پــەڕتووکی ((الخــراج))ی یــەحیا کــوڕی ئــادەم قرشــی دێــت، پــەڕتووکی ((نــصيحة الملــوك)) و پــە رتــووکی ((تــسهيل النظــر))ی مــاوەردی دێــت هــەردووکیان ٤: ٧٤ بـە ڕێـژەی ٥٪ ((لەگـەڵ تێبینــی ئــەوەی کـە کـەس نەگەڕاوەتــەوە بــۆ ئــەم دووپەڕتووکـە جگــە لــە دوو توێــژەری زانکــۆ کــە نامەیەکی زانکۆیان ئامادە کردووە لە فیکری سیاسییدا، ماوەردیی و دکتۆر موحەممـەد عابـد جـابیری، ئینجـا ((تحفـة الـوزراء))ی (الثعـالبي) و ((العقـد الفريـد))ی (ابـن طلحــة القرشــي) و ((طبــائع الاســتبداد)) و ((ام القــرى))ی کــەواکیبی و ((بــدائع الــسالك))ی (ابــن الازرق) و ((رســالة في الــسياسة))ی فارابی و ((تحصيل السعادة))ی فارابی و ((حجة الله البالغة))ی دەهلـەوی ٣: ٧٤ به ڕێژەی ٤٪، پاش ئەویش (أقـوم المـسالك)ی (خيرالـدين التونـسى) و ((الجـوهر النفـيس))ی (ابـن الحـداد) و ((الحـسبة))ی مـاوەردی و ((قـوانين الـدواوين))ی (ابــن ممــاتي)، پــەڕتووکی ((الــولاة والقــضاة))ی (كنــدي)، و پــەڕتووکی ((الـسياسة))ی (ابـن سـينا)و ((يتيمـة الـدهر))ی (ابـن المقفـع)و ((الامر بالمعروف والنهي عن المنكـر))ی (ابـن تيميـة)، و ((معـالم القربـة))ی

(ابن الاخوة) ٢: ٧٤ بـه رێـژەی ٧. ٢٪لـه کۆتاییـدا ((الـسیاسة الـشرعیة))ی بەرەکەت زادە، و ((التیسیر والاعتبـار))ی ئەسـەدی و((واسـطة الـسلوك))ی (ابن زیان) و ((لمع القوانین))ی نابلسی و ((آثار الاول))ی (حسن العباسي) و ((تحفة الملـوك))ی شـیرازی و پـەڕتووکی ((الـسیاسة))ی (مـرادي) و ((آداب الحــسبة))ی (الــسقطي) و ((المقدمــة الزهراویــة))ی (ذهــبي)و ((نــصیحة العباد))ی ئەحمەدی کـوڕی یـەعقوب، و ((ایـضاح طـرق الاسـتقامة))ی (ابـن المبرد) و ((الامامة))ی (ابي یعلی) و ((تحفـة الملـوك))ی (ایـدیني) و ((التـبر المنـسبك))ی ئــە هــوازی و ((الخــراج))ی (قدامــة ابــن جعفــر) و ((المــنهج المسلوك))ی شیزەری و((مسائل الامامة))ی ناشیئول ئەکبەر و ((تذکرة ابـن حمدون)). هـەموو ئـەم پەڕتووکانـە نەگەڕاونەتـەوە بـۆلای تـەنها یـەك جـار نەبێت لە کۆی ٧٤ پـەڕتووکی هاوچـەرخ لـە بـیری سیاسـیی ئیـسلامیی بـە رێژەی ١,٣٪.لەم روونکردنەوانەوە تێبینی دەکەین کـە لێـرەدا تـەنها چـوار پەرتووك هەیە لە لای زیاتر ٣٠٪ وەرگـیراوی باسـەکە دووبـارە بوونەتـەوە، ئەوانی تر پلەیەکی نزمتریـان وەرگرتـووە، بـەڵکو زۆربـەیان بەکارنـەهاتووە مەگەر لەلای توێژەرێك یان دووان، ناتوانین راڤـەی ئەمـە بکـەین مەگـەر لـە نێوەندی بڕیاردان بەوەی کە ئاسان گەیشتن بۆلای پـەڕتووك و پەرشـەکانی و بڵاوبوونەوەی کە دادەنرێت بە دیاریکەرێکی سەرەکی لە بـەکارهێنانی لـە توێژینەوەی زانستی و ئەکادیمییدا. بـڵاو کـەرەوان و لێکۆڵکـاران پرۆگرامـی توێژەر لە زانستەکانی سیاسیی لـە ئیـسلامدا دیـاریی دەکـەن، زیـادەڕەوی نییە ئەگەر بلێین کە گرنگی دانی رۆژهەڵاتناسەکان و چـڕبوونەوەیان لەسـەر هەندێ بیریار دادەنرێت بە دێباچەی دیاریی کردنی سەرچاوە ئیسلامییەکان

لە زانستی سیاسییدا و پێناسەکردنی ئەوەی بیریارانی سیاسیی کێن کە پێویستە جێگەی باس و توێژینەوەو گرنگیپێدان بن.

**سێیەم:** هەلبـژاردن لـە مامەڵـەکردن لەگـەڵ سەرچـاوە تایبەتیـەکانی بیریارانی زۆر بەناوبانگدا وەکو مـاوەردیی و فـارابی و ئـیبن سـینا و ئیبنـو قوتەیبـە و غـەزالی و جـاحیز.. سـەرەڕای ئـەوەی کـە مامەڵـەکردن لەگـەڵ کەلـەپووری سیاسـیی ئیـسلامییدا کەوتـە ژێـر پـشکنین و رێکـەوت و ژمارەیەکی کەم و سنووردارو دیـاریکراو لـە بیریـاران دەرکـەوتن، بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا کـارکردنیش لەگـەڵ ئـەم ژمـارە سنووردارەشـدا بـە وردیـی نـەکراوە و رێبـازێکی زانـستیی نەگیراوەتەبـەر، بـە شـێوەیەکی رێکـەوت و هەڵبژاردن و بگرە هەڕەمەکیی خراوەتە بـەر بـاس، ئامـاری بەرهەمـەکانیان نـەکراوە بـە شـێوەیەکی زۆر کـەم نـەبێت، بـەڵکو هەنـدێ جـار گرنگـی بـە پـەرتووکی بێهێـزی بیریـاران دەدرێـت، ئەمـەش هۆیەکـەی بـۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە کە پێشتر چاپکراوەو گرنگیی پێـدراوە، یـان بـە هـۆی ئـەوەی ناونیشانەکەی وای لێدەکات زیاتر وەکو بابـەتێکی سیاسـیی دەربکـەوێت و پێش کتێبەکانی تر بکەوێت، لە کتێبی ئەم بیریار و ئەوی تر.

**١- ماوەردیی:**

لەگەڵ ئەوەی کە بەرهـەمی فیکریـی گەیـشتۆتە پێـنچ پـەڕتووك، بـەڵام جگە لە (ألاحكـام الـسلطانية) ئـەوانیتر ئەوەنـدە گرنگییـان پێنـەدراوە، لـە کاتێکدا کتێبەکانی تری لە رووی بـیر و فیکـری سیاسـیی نـەك تێگەیـشتنی سیاسیی و قانونی دەستوورییەوە زۆر گرنگترن لە کتـێبی نـاوبراو، بـە ڵکـو نامـە زانکۆییـەکان کـە مامەڵـە دەکـەن لەگـەڵی و پاڵیـان داوە بەسـەر لێکۆڵینەوە لە بیری کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی هیچ کامیان هەڵنەساون

به دەورەدانی هەموو بەرهەمەکانی ماوەردیی – دکتۆر سەلاحەددین رسلان لە نامەی دکتۆراکەیدا لەبارە ی بیری سیاسیی ماوەردیی نەگەڕاوەتەوە بۆ پەرتووکی ((تسهيل النظر وتعجيل الظفر)) هەروەها دکتۆر ئەحمەد موبارەك بەغدادییش هەر بە هەمان شێوەی کردووە و نەگەڕاوەتەوە بۆ کتێبی ((الرتبة في طلب الحسبة))، هەروەها دەبینین دکتۆر سەعیدی کوڕی سەعید کە نامەی دکتۆراکەی لەبارەی فیکری سیاسیی ئەبو حەسەنی ماوەردییەوە ئامادەکردووە نەگەڕاوەتەوە بۆ تەواوی کتێبەکانی، بەڵکو ئاماژەشی بۆ ((تسهيل النظر)) یان ((الحسبة)) نەکردووە.

**٢- ئەبو حامیدی غەزالی:**

زیاتر گرنگیی و چڕکردنەوە خراوەتە سەر پەڕتووکی (التبر المسبوك في نصيحة الملوك) و بەشە تایبەتییەکانی سیاسیی لە (احياء علوم الدين)دا و نەگەڕاونەتەوە بۆ گرنگترین پەڕتووکە سیاسییەکانی کە بریتین لە بەرهەمە رێکخراوە زانستییەکانی لەم بوارەدا کە بریتییە لە کتێبی (سر العالمين وكشف مافي الدارين) بەڕاستی لەوانەیە هۆکاری ئەم پشتگوێخستنەی ئەم پەڕتووکە سەرەڕای گرنگییەکەی کە (شيخ محمد مصطفى ابو العلا) وەکو پاشکۆی پەڕتووکی (الدرة الفاخرة في كشف علوم الاخرة) بڵاوی کردووەتەوە وای لەلای خوێنەران گەیاندبێ کە ئەمیش وەکو رابردووەکانیەتی.

**٣- ئیبنو قوتەیبەی دینەوەریی:**

ئەمیش زیاتر گرنگی و چڕکردنەوە لەسەر پەرتووکی (الامامة والسياسة)ی کراوە سەرەڕای ئەوەی ئەمە بە سەرچاوەیەکی فیکری سیاسیی ئیسلامیی لە قەڵەم نادرێت، بەڵکو بە سەرچاوەیەکی مێژووی سیاسیی ئیسلامیی دەژمێردرێت کە باسی پێشکەوتنی سیستمی دەوڵەتی

ئیسلامیی پێکهاتوو له دامەزراوەی خیلافه دەکات. نەگەڕاونەتەوە بۆ لای کتێبی (السلطان)ی ناوبراو، که بڵاوکراوەتەوە لە یەکەمین مەوسوعەکەیدا (عیون الأخبار) که به کاکڵەی فیکری ئیسلامیی دەژمێردرێت.

٤ – جاحز:

سەرەڕای ئەوەی که زۆربەی کارەکانی بڵاو کراونەتەوە بەڵام ئەو لە ریزی وێژەوانان‌دا پۆلێن کراوه نەك بیریارێکی سیاسیی، بۆیە بە دەگمەن نەبێت باسی نەکراوە، ئەویش تەنها بۆ کتێبی ((التاج في اخلاق الملوك)) لە کاتێکدا (١٠) کتێبی هەیە لە زانستی سیاسییدا لە نێوان دەستنووس و چاپکراودا، هەموویان شوێنەکانیان ئاشکرایە، ئەمە وای لێدەکات وەکو بیریارێك توێژینەوەی لەسەر بکرێت، بەتایبەتی ئەو لەگەڵ کاری سیاسییدا هەڵسوکەوتی کردووە و رۆڵێکی فیکری بەرچاوی هەبووە لە فیکری بزووتنەوەی موعتەزیلەدا و یەکێك لە باڵەکانی کۆمەڵە موسوڵمانەکانی سەرەتای ئیسلام بۆ لای ئەو ئاماژە پێدەدرێت.

ئەمە کۆمەڵێ بەڵگەیە کە قەناعەتمان پێدەکات کە مامەڵەکردنی هاوچەرخانە لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا بەشێوەیەکی بێبەرنامە کراوە کە دەتوانین بڵێین لەسەر رێکەوت و هەڕەمەکی راوەستاوە، ئینجا هەموو ئەوەی لەبارەیەوە دەرچووە لە گشتگیریی پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی تەواو هەیە لەسەر رۆشنایی ئەوەی پێی گەیشتووین لە سەرچاوەی فیکر کە هەموو رووبەرەکانی مێژووی ئیسلامی داپۆشیوە.

## باسی دووەم

## ڕەوشناسیی و شێوەی مامەڵەکردنی هاوچەرخ لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا

لێکۆڵینــەوە هاوچــەخیەکانی بــیری سیاســیی ئیــسلامیی لــە کۆمــەڵێ بنــچینەو بنــەمای ئاشــکراو روونــی پڕۆگرامیــی دەردەچــن کــە کــارکردنی گرێدەدات لەگەڵ کەلەپووری سیاسـیی ئیـسلامیی بـە گـشتیی و ماهیـەت و سنوورەکانیشی دیاریی دەکات، ئەمەش دەبێتە سەرچاوەیەك بـۆ پاکانـە و بەهانە بۆ پێدانی شـەرعیەت لەسـەر پڕۆگرامەکـەو ئەنجامـەکانی باسـەکە، لێکۆڵینەوە هاوچـەرخەکان هەڵنەسـتاون بـەدەورەدانی سەرچـاوەکانی ئـەم کەلەپوورە وەك پابەند بوونێك بە گـرنگترین رێـساکانی پڕۆگرامـی زانـستیی کە پێویستیی دەکات لە پێشدا خوێندنەوە بکرێت دواتر گـشتاندن (تعمـیم) بێتە کایەوە، ئینجا لە دواییدا دەورەدانی دیاردەکە و کۆکردنـەوەی پـەرش و بڵاوەییەکانی یەکە و پێکهاتەکانی، لە هـەمان کاتـدا ئـەم توێژینەوانـە لـە بنــچینەیەکی هەڕەمــەکیی تریــشەوە دەرنەچــوون هــەتا ببنــە پاکانــە بــۆ وەرگــرتنی نموونــەی هەڕەمــەکیی لــە توێژینــەوەدا، یــان لێکۆڵینــەوەی حاڵەتەکە، یـا هـەر یـەکێ لـە هۆکـارە دیارەکـانی پرۆگرامـی زانـستیی، کـە هەموویان پێویستی دەکەن پێشەکیی دیاردەکە بزانرێـت لـە رووی قـەبارەو سنوورەکانیەوە، پاشان رێگەیەك لـەو رێگانـەی سـەرەوە بگیرێتەبـەر. ئـەم لێکۆڵینەوەیە لە قەناعەتێکەوە دەرچووە کە ئـەوەی گەڕاونەتـەوە بـۆی لـە سەرچـاوەی کەلــەپووری سیاســیی ئیــسلامیی هــەموو ئەوەیــە کــە لــەم کەلەپوورە بەدەست هاتووە، یان لەم سەرچـاوانە دەرناچـێت، ئـەوەش بـە

کەوتنەژێر کاریگەریی و قەناعەتی هەندێ یان هەموو ئەو بنەماو پرۆگرامە ئاشکرایانەی خوارەوە:

**یەکەم:** لێکۆڵینەوەی بیری سیاسیی لە کۆ و سەرجەمی دەرچوون و سەرچاوەگرتن لە یەك گریمانەو هەڵکشان و پێشکەوتنی شارستانی و رۆشنبیری، هەروەك هەموو رۆشنبیریی و شارستانییەکان بەشێك لە چوارچێوەی گشتیی دەنوێنن کە ژیاری جیهانیی وەکو یەك شارستانیی و کەلەپووریی مرۆیی نیشان دەدەن. ئەویش ئەو تێڕوانینەیە کە ژیریی ئەوروپی هەوڵی داوە بیکاتە راستەقینەیەکی زانستی و بەدەستهاتوویەکی بەڵگەنەویست کە مشتومڕی لەسەر نەکرێت، کە مێژووەکەی و رۆشنبیریی وپێشکەوتنی فیکری بەو شێوەیەیە داناوە کە ئەوە رووناکبیریی و مێژووی تەواویی مرۆڤایەتییە، لەسەر هەموو شارستانییەکانی ترە کە بگەڕێت بۆ دۆزینەوەو پێناسەکردنی خۆی لە بەیەکگەیەنەرە بەردەوامەکاندا، ئەمەش لە ژێر داواکاریی و ئیدیعای یەك مرۆڤایەتیی و ژیاری یەکپارچەی جیهانییدا، جا لە روانگەیەوە ئاشکرایە کە کتێبەکانی هزری سیاسیی لە یۆنان و دواتر لە رۆمان و پاشان چاخەکانی ناوەڕاست (مەسیحی و ئیسلام) و پاشان چاخی راپەرین و روناکیی پاشان فیکری ئەوروپیی هاوچەرخ تێپەڕ بکات، ئیتر بەو شێوەیە بەرهەمیی ژیریی شارستانیەتەکانی فارس و هیند و چین و نێوان دوو رووبارو فیرعەونیی لە چاخەکانی کۆن پشتگوێ دەخات، بە تایبەتی شارستانیەتی ئیسلامیی کە چواردە سەدەیە بەردەوامە. کە ئەم مێژووە بە پۆلێنی ئەورووپیی کورتکراوەتەوە لە کۆن و نێوەڕاست و هاوچەرخ، بەو شێوەیەی کە وای دەربخات کە مێژووی ئەوروپا واتە مێژووی

جیهان. کە تاریکییەکانی تاریکیی هەموو مرۆڤەو رووناکییەکانیشی هی هەموو جیهان.

دووەم: بەڕاستیی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی دەورە دراوە لە هەمان ئەو کاتەی کە بیری سیاسیی مەسیحیی تیا دەرکەوت لە ئەوروپادا، وەکو ئەوەی بلێی مێژووی ئەوروپای دیان بەسەر مێژووی ئیسلامدا کەوتووە، ئینجا مامەڵە لەگەڵ هەندێ لەو بیریارە موسوڵمانانەدا بەو شێوەیە کراوە کە هاوکات بوون لەگەڵ چاخەکانی ناوەڕاستی ئەوروپادا. بەڵام پێش ئەوە و دوای ئەوە ئیتر کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی بوونی نییە چونکە لە ئەوروپادا کەلەپووری سیاسیی مەسیحیی لەو کاتانەدا بوونی نەبووە. ئەمە بووەتە بەشێك لە بنەماو بناغەی (مەعریفیی) و ژیریی ئەکادیمیی عەرەبیی لە نێوەڕاستی سەدەی پێشووەوە کە خود نابینرێت مەگەر لە ئاوێنەی ئەوی ترەوە، بە هەمان دیدو گۆشەنیگاوە سەیری کەلەپوورو واقیعی دەکات کە ژیریی مرۆڤی ئەورووپی سەیری دەکات، ئەوە ئیتر "بابەتیانە" و "زانستیانە"یە؟!

سێیەم: سەرچاوەگرتن لە چاوگی یۆنانی بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا دوو کاریگەر بەرهەم دەهێنێ:

(أ) توێژینەوە لە فیکرەکان و چارەسەرەکان و دەروازەکان و باسوخواسەکان کە پێکەوە گرێ دەدرێ لەگەڵ شێوازی مەعریفیی یۆنانیی لە زانستی سیاسییدا و بە دانانی ئەوە بە بنەما کە ئەوەی لە فیکری ئەواندا نەبێت واتە دەرچووە لە زانست و فیکری سیاسیی. ئەوە دادەبەزێت بۆ وێژە (أدب) و فیقهو ئاوێنەی میرەکان.. هتد، ئەویش بێ هەستکردن بە سنوور و شوێنەواری جیاوازیی نێوان بنەمای ئیسلامیی یەکتاپەرستیی و

بنەمای یۆنانیی بتپەرستیی، کە بەدڵنیاییەوە پێکهاتەیەکی زانینی هەیە کە تێڕوانینی بۆ خواو مرۆڤ و گەردوون و بوون جیاوازە لە تێڕوانینی ئیسلامی. بێ هەوڵدان بۆ خوێندنەوەی هەریەکەیان بەسەربەخۆو تێگەیشتنی لە ژێر رۆشنایی بنیاتی ناوخۆیی و مەعریفە ئاشکراکانی، لەبەر ئەمە گرنگیی چڕکراوەتەوە لە زۆرێك لە لێکۆڵینەوەکان لەسەر فەیلەسوفە موسوڵمانەکان کەنوێنەرایەتیی فەلسەفەی یۆنانییان کرد بە زاراوەی ئیسلامیی و بە زمانی عەرەبیی، ئەوان بوونە بەشێك لەو فەلسەفە و هاوتەریبییەکیان لە نێوان ئەو و بیروباوەڕی ئیسلامییدا دروست کرد، بە بێ خۆماندووکردن لەم بابەتەدا کە گرنگ رەهەندی دەشتایی و کۆچەرییە نەك نێوەرۆکیی، چونکە فیکری ئیسلامیشی وەکو فیکری یۆنانیی بۆیە کردووە بە شێوەیەکی دوور لە راستیی و واقیع، سەرەڕای ئەوەی ئەمە لە سنووری چینی فەیلەسوفان تێناپەڕێت.

(ب)– تۆمەتبارکردنی فیکری ئیسلامیی بە گواستنەوەی لە یۆنانییەکانەوە. بە جۆرێك هەندێك لایان وایە کە فیکری سیاسیی ئیسلامیی بە گشتیی لە سەرچاوە یۆنانییەکانەوە وەرگیراوە و شتێك نییە بە فیکری سیاسیی ئیسلامیی بناسرێت[٢٣].

**چوارەم:** پشت بەستن بە دەروازەی کەسێتیی لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی، ئەمەش لە نێوەندی هەڵسوکەوتی یەکێ لەم نزیك کراوانەی خوارەوە:

---

[23] د. عبدالرحمن بدوي، الأصول اليونانية للنظريات الإسلامية السياسية: القاهرة: مكتبة النهضة المصرية، ١٩٥٤م، ص ٧٢.

(أ) تێڕوانین بۆ کەلەپووری سیاسیی وەك ئەوەی کۆمەڵێکـە لـە زلهێـزان کە چەمکی کەسێتی دیاری بە سـەردا جێبـەجێ دەبێـت بـە پێـوانی لەسـەر بۆچـوونی قارەمـان لـە مێـژوودا. بـەو شـێوەیە سـەیری نـەکراوە کـە ئـەوە کەلـەپوورێکی درێژکراوەیـەو جۆرێـك لـە کەڵەکـەبوون و درێـژەدانی پێـوە دیـارە، کـە هـەر فیکرێکـی دواوە لەسـەر فیکـری پێـشووی دادەمـەزرێت، سوودی لێوەردەگرێت و دەیخاتە سەری، هـەروەها هـەموویان سەرچـاوەی مەعریفییان یەکە، کە خۆی لـە نیگـا (قورئـان و سـوننەت) و بـوون (مێـژوو واقیـع)دا دەبینێتـەوە. لـەم ڕێگایـەوە و لـەم نزیکبوونەوەیـەوە فیکـری کەڵەپیاوانی گەورەی وەکو ماوەردیی و ئیبن خەلدون و ئیبن سینا و فارابی و ئیبنو تەیمییە و غەزالی وا لێك دراوەتەوە، کە ئەمە دیاردەیـەکیی خـۆیی کەسەکانەو داهێنانەکانیان پەیوەندیی بە ژیریی خۆیان و هۆکاری خۆییەوە هەیە بە بێ گەڕاندنـەوەیان بـۆ لای پێـشکەوتنێکی فیکریـی دیـاریکراو، کـە کەڵەکەبوون و پێشکەوتنی تێدایە، هەروەها ئەندازەیـەکیش کەڵەکـەبوون و پێشکەوتنی تێدایە، هەروەها ئەندازەیەکیش ژیریی و جیاکەرەوەی کەسیی تێدایە.

ئەم تێڕوانینە بە جۆرێك قوڵبوویـەوە هـەتا وای لێهـات مێـژووی فیکـری سیاسـیی ئیـسلامیی بوویـە مێـژووی ژمارەیـەکی سـنووردار لـە بیرتیـژو داهێنـەرەکان، لــە هــەمان کاتــدا دەبــێ بــزانین کــە بیریــارێکی وەکــو عەبدوڕەحمانی کوڕی خەلدون ریشەی فیکـرە بنەڕەتییـەکانی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئیبنـو موقەفـەع و ئینـو ئـەبی رەبیـع و جـوەینی و غـەزالیی و ئیبنـو تەقتەقی و مورادیی و ئیبنو ریزوانی مالیقیی و ئیبن حەزم و ئەوانی تریش.

(ب) گەڕان بـە دوای کەسـایەتییەکان و نەگـەڕان بـە دوای فیکـردا، بـەو شـێوەیەی کـە ببێتـە مامەڵـەکردنی نـا پرۆگرامیـی لەگـەڵ فیکـری ئـەو بیریارانەدا کە بە دیاردەی کەسیی لە قەڵەم دراون، کە چڕیی خراوەتە سەر تەنها نووسراوێکیان، وەکو لەگەڵ مـاوەردیی و غـەزالی و ئیبنـو قوتەیبـەدا بینیمـان. هـەروەها شـکاندنی سەرسـامبوون بـە کەسـایەتییان بـە هـۆی فیکریانەوە و دەرکردنیان لە چوارچێوەی کـات و شـوێن، بـەبێ شـیکارێکی قووڵ لەو بارودۆخە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەی تیایدا دەرکەوتوون، زاراوەی گشتگیرانەیان بەسەردا داون لەسەر بنەمای یەکێتیی زاراوەی بەکارهاتوو بە بێ ڕەچاوکردنی گۆڕانی ماناو مەبەست و بارودۆخ. بۆ نموونە مامەڵە لەگەڵ چەمکەکانی شارستانیەت و دەوڵەت و دەمارگیریی لە لای ئیبنو خەلدون بە هــەمان دیــدو بۆچــوون و تێگەیــشتنی نــوێ کــراوە، ســەرەڕای گــۆڕانی چوارچێوەی مێژوویی و یەکە کۆمەڵایەتییـەکان کـە هـەمان دەسـتەواژەیان بەسـەردا سـەپاوە، کـە ئـەوە بووەتـە هـۆی گـۆڕانی مانـای وشـەو زاراوەو دەستەواژەکە. هەمان مەسەلە دووبـارە بـە سـەر فیکـری ئیبنـو تەیمییـەدا دەسـەپێت، کـە لـە چواچـێوەی مێـژوویی خـۆی دەرهێنـراوە و خەسـڵەتی گشتیی پێدراوە کە دەیلکێنن بە پیرۆزەوە، ئەمە لە کاتێکدایـە کـە ئیـسلام خەسڵەت و ئاوەڵناوی پیرۆزیی ڕەها جگە لە قورئان و سـوننەتی سـەحیحی پێغەمبەری خوا ﷺ ناداتە هیچ دەقێکی تر، چـونکە ئـەو دوو سەرچـاوەیە زانیارییـەکانی لـە خـوای پـاکو بێگەردەوەیـە، کـە زاتـی ئـەو بـەدەرە لـە سنووری کات و شوێن و نە پاڵیان پێوەدەدات و نە لایەنیان دەگرێت. بەڵام فیکـری مرۆیـی دەبێـت هەنـدێ لـە سـێبەری کـات و شـوێنی بـە سـەردا بچەسپێت.

(ج) پـشتبەستن بـە تـاك لـە مامەڵـەكردن لەگـەڵ كەلـەپووری سیاسـیی ئیسلامییدا بووەتە هۆی پەیدابوونی شێوازێكی سـێیەم، بـە جۆرێـك گـەورە زانایانی ئیسلام و (فەقیهەكان) بە سەرچاوەی هـەموو زانیارییـەك دانـراون، كە بوونەتە كەسانێ پرسیاریان لـەبارەی ئـەوەوە لێـدەكرێت كـە بیریـان لێ نەكردووەتەوە، یا گرنگییان پێ نەداوە، داوایان لێدەكرێت كە ئەوەی ئەمڕۆ بۆ ئێمە گرنگیی هەیە و پێویستییمان پێـی هەیـە پێـشكەشمانی بكـەن، لـە حاڵەتێكدا كە لە راستیدا ئەوەیان پێ نییە. هەندێ جـار بـۆ بەدەسـتهێنانی بیری سیاسیی دەگەڕێنەوە بۆ لای كەسانێ كە ئەوان ئەم دیاردەیە لە لایان گـرنگ نـەبووە و لـەم رووەوە بـە شـێوەیەكی سـەربەخۆ توێژینـەوە، یـان بەرهـەمیان نییـە. زۆرێـك لـە توێژینـەوە هاوچـەرخەكان لـە بـارەی فیكـری سیاسیی و بابەتەكانیەوە پشتیان بە بەڵگەی زانایانێـك بەسـتووە كـە هـیچ پەیوەندییەكیان بەوانەوە نییە و هەوڵیش دەدرێت كە نیاز و ویستی توێژەر بۆ گەڕانەوە بۆ كەلەپووری سیاسیی دابین بكات.

**پێنجەم:** وەسـتان لەسـەر رووكـەش و شـێوە و ناونیـشان و رەوش، بـێ قوڵبوونەوە و شیكاركردنی نێوەرۆكی فیكرەكان و تەنها رازیبوون بە زمانی وتـاردان بـۆ دەرچـواندنی گـشتاندن بـۆ نموونـە وەكـو ئـەوەی كـە وتـراوە سیاسەت لە ئیسلامدا جگە لە ئـەدەبی ئامۆژگـاریی یـا ئاوێنـەی مـیران، یـا رەنگدانـەوەی فـارس و یۆنـان نـەبێ چـیتر نییـە.. هتـد، ئەمـەش بـێ هـیچ كۆششێك بۆ شیكردنەوەی ناواخنی فیكری ئەو ناوەڕۆكە زمانەوانییـە كـەوا دەردەكـەوێت رووكەشـەكەی بـە زمـانێكی سـۆزداریی و میهرەبـانیی، یـان وێژەیی داڕێژراوە، لەوانەیە هۆنراوە یان پەخشان بێت، لەوانەشە چەمكانێك بەكار هاتبن كە پێشتر لە شوێنی تردا بەكار هێنرابێتن، ئەمە لـە كاتێكدایـە

که مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری یۆناندا بە شێوازێکی تر کراوەو هەموو بوارەکانی گفتوگۆ و راوبۆچوون و شانۆ و هۆنراوە یۆنانییەکان کراونەتە سەرچاوە بۆ زانست و فیکر و زانین، هیچ کام لە توێژەرانی فیکری سیاسیی لەسەر رووکەشبوونیان نەوەستاوە و لە چوارچێوەی زانستی سیاسیی نەیان بردۆتە دەرەوە و بە وێژەو پەخشانی ناو نەبردوون، هەروەکو لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا کردوویانە، ئەمە لە حاڵەتێکدایە کە گوتاری ئەدەبیی شێوازێکی گشتیی و زاڵی نییە تیایدا، بەڵکو زۆربەی هەرەزۆریان بیروبۆچوونەکانیان بە شێوەیەکی رێکوپێك و پرۆگرامیانە پۆلێن کردووە، کە پێکدێن لە پێشەکیی و لێکۆڵینەوە و راڤەکردن و ئەنجام و راسپاردەکان. هەروەها وەستاون لەسەر سەردێڕو ناونیشانی بەش و بەندەکان و تێبینیکردنی دووبارەبوونەوەی لە زۆرێك لە پەڕتووکەکاندا، دەربڕینی ئەو وتەیەی کە فیکری سیاسیی ئیسلامیی خۆی دووبارە دەکاتەوە بێ هەستکردن بەوەی کە ئەم سەردێڕانە بە تەواویی یەکەکانی شیکردنەوەی دیاردەی رامیاریی لەلای موسوڵمانان دەردەبڕن، هەروەك لە کتێبە نوێیەکانی سیستمە سیاسییە هاوچەرخەکانیشدا بەشەگەلێك سەبارەت بە دەوڵەت و دەسەڵاتەکانی و پەیوەندیی دەوڵەت لەگەڵ پارتەکان و خاوەن بەرژەوەندییەکان و.. هتد هەیە، بەڵام هیچ کامەیان لە نێوەڕۆك و زانیارییەکانیاندا دووبارە بونەوەی ئەویتر نین، دوبارە بەرهەمهێنانی فیکری سیاسیی لە ئیسلامدا بە هۆی تەنها مامەڵەلەگەڵکردنی رووکەشانە لەگەڵیدا بوویە بەربەستێك لە بەرانبەر توێژینەوەی زانستییەوە. لەگەڵ رەچاوکردنی کە دووبارەبوونەوە –ئەگەر هەبێت– دیاردەیەکە شایانی لێکۆڵینەوەیە، بۆ زانینی هۆکارەکانی،

هەروەها ئایا دەگەڕێتەوە بۆ لاساییکردنەوە؟ باری نێوان کەسانی جیاواز لە بۆچوونە فیقهیی و فەلسەفییەکاندا؟ یان دەگەڕێتەوە بۆ لێکچوونی بارودۆخەکان؟ یان بۆ سروشتی کات و جوولانەوە لەسەرخۆکەی؟

**شەشەم:** لکاندنی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی بە تێڕوانینی فیقهی و دانانی بە بەشێك لە فیقه، هەرچەندە لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان فیقهو فیکردا لە رووی زاراوەو دیاردەی زانینەوە کە دواتر لێی دەدوێین، لە بەشە توێژینەوەیەکی تردا ئەم ئاڕاستەیە وەك ئەنجامێك دەرکەوت، چونکە زۆربەی ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان کردووە لەسەر هزری سیاسیی ئیسلامیی لە چەرخی نوێدا، لە باکگراوەندێکی یاسایی دەستوورییەوە، یان شەرعیی و فیقهییەوەیە کردوویانە، چونکە زانستی سیاسیی عەرەبیی بارێکی تەواوی لە رۆژئاواییبوونی بە خۆوە بینی، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە تا ئەم سەدەیە، ئیتر باس و توێژینەوە نەکرا لە دیاردەی سیاسیی لە کەلەپووری ئیسلامییدا مەگەر لە نێوەندی تێڕوانینی فیقهیی یاساییەوە نەبێت، لەبەر ئەمە هیچ نامۆ نییە کە پەڕتووکەکەی ماوەردیی ((الاحکام السلطانية)) زیاتر بڵاو بووبێتەوە لە پەڕتووکەکانی تری، کە پڕیەتی لە شیکردنەوە و فیکری سیاسیی زۆر زیاتر و گرنگتر لە تێڕوانینی زانستی سیاسییەوە نەك یاسای دەستووریی، ئەم دەروازەیە بەڕاستی بووە هۆی دەرکەوتنی ئەوەی کە وترا ئیتر دەرگای ئیجتیهاد داخراوە وەك راڤەیەك بۆ نەبوونی فیکری سیاسیی ئیسلامیی[٢٤]، ئینجا پاکانەیەکی بەجێی بۆ بچڕانی

[24] د. عبد الحميد متولي، أزمة الفكر الاسلامي في العصر الحديث، کە ئەو بڕوای وابوو داخرانی دەرگای هەوڵ و کۆششکردن (الإجتهاد) لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی هۆیەك بوو بۆ دواکەوتنی فیکری سیاسیی ئیسلامیی و لە ناوچوونی.

پێشکەوتن لە فیکری سیاسیی ئیسلامییدا و نەبوونی، مەگەر لەلای کەمێك لە بیریاران نەبێ، پێشکەش کردووە.

**حەوتەم:** توێژینەوە لە دیاردەی هێز یان دە سەڵات کە بریتییە لە ناوەرۆکی چەمکی سیاسیی هاوچەرخی رۆژئاوا و پێناسەکەی و دانانی نەبوونی ئەم دیاردەیە و چەمکەکانی و چارەسەرەکانی و دوورییەکانی و یەکەکانی وەك بەڵگە لەسەر نەبوونی زانستی سیاسیی لەلای موسوڵمانان، لەگەڵ بێئاگاییەکی تەواو بۆ پێناسەی زانستی سیاسیی لە ئیسلامدا و چییەتی و یەکە شیکارییەکانی وچەمکەکانی، کە زۆر جیاوازن لە چەمکی هاوچەرخ بۆ سیاسەت، چونکە زانستی سیاسیی ئیسلامیی دەبەسترێتەوە بە چەمکی بەرژەوەندییەوە، ئەویش بردنی خەڵکە بۆلای چاکەخوازیی و دوورخستنەوەیانە لە خراپە، ئەمەش مانای راکێشانی چاکەو دوورخستنەوەی خراپەیە... هتد لە پێناسە باوەکانی بەردەست لە لای زۆربەی ئەوانەی لەسەر سیاسەتیان نووسیوە بە درێژایی مێژووی موسوڵمانان.

ئەمە گرنگترین ئەو بەدەستهاتوانەن کە بنچینەی پرۆگرامیی بۆ مامەڵەکردنی پەرتووکە هاوچەرخەکان لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی نیشانداوە و بە پێی ئەم ئەنجامانەی کە پێی گەیشتوون کە نوێنەرایەتی سەرچاوەی شەرعیەتپێدانی هەڵبژاردنی کوێرانە و رێکەوت دەکات، کە بووەتە پرۆگرامی باسوخواسی هاوچەرخ بۆ ئەم کەلەپوورە.

## باسی سێیەم
## بنەمای ڕەوشی پێویست بۆ توێژینەوەی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی

ئەو واقیعەی ئەمڕۆ لە مامەڵەکردنی هاوچەرخانە لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی موسوڵماناندا دەبینرێت، ئێمەی ناچارکردووە تا چەمك و پێوەری ڕەوشناسین بۆ دەسخستنی بنەماو بڕیارگەلێك، کە بتوانن بە زانستیانەو ئەمانەتدارانە لە مامەڵەیان لەگەڵ کەلەپووردا کاریگەرییان هەبێت و بە شێوەیەك پێشکەشی بکەین کە بۆ تێگەیشتنی و نێوەڕۆکی ئەوان بمانگەیەنێتە ڕاستیی فیکر و پێشنیازەکانیان و ڕێگر بێت لە سەپاندنی ئەزموونی مێژوویی بە سەر واقیع و ڕاستیی ئەمڕۆدا، بە بێ ئەوەی فیکر و تێگەیشتنی ئەو واقیعە مێژووییە هەڵسەنگێنین و دووبارە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین هەتاوەکو لەگەڵ فیکرماندا سازگار بێت و داخوازییەکانمان دەستەبەر بکات و بە بێ ئەوەی بۆچوونی هاوچەرخ بەسەر مێژووی رابووردوودا بسەپێنرێت، کە لە ئەنجامدا بەرئەنجامی نادروست لە نێوەڕۆکی کەلەپوور دێتە کایەو توێژینەوەکان لە سوودی زانستیی بێ بەهرە و خاڵیی دەکاتەوە. ئەوەی کە گرنگیی هەیە ئەمەیە کە کەلەپوورەکان لە پێکهاتە و نێوەڕۆکی خۆیاندا بەو شێوەیەی کە هەن دەرك بکرێن، بە بێ ئەوەی شێواندن، یا دەستەواژەو مەسەلەی دیاریکراو بەسەریاندا بسەپێنرێت. لە ئەنجامدا مەبەست لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپوور تێگەیشتنی واقیعی ئەمڕۆ یا توێژینەوەو گوێزانەوەی مێژوویی بۆ جێبەجێکردنی یا پێشکەشکردنی سەرلەنوێی فیکرەکان لە پێکهاتەی

کۆمەڵایەتیی رابردوودا نییە، بە وردیی بە هەمان شێوە کە خستنەبەرباسی نموونەکان، رەگەز و بیرکردنەوەی هەر ژینگەیەکی مێژوویی، جوگرافیی و کۆمەڵایەتیی لە دەرەوەی چوارچێوەی خۆی وەرناگیرێت. مامەڵە لەگەڵ کەلەپووری سیاسییدا لە راستیدا درکی ئەم خاڵەیە کە موسوڵمانان لە درێژایی مێژووی خۆیاندا لەگەڵ سیاسەتدا چ مامەڵەیەکیان کردووە. بەم رێگەچارەیە، ماهیەت و نێوەرۆکی زانستی سیاسەتی ئیسلامیی بە درێژایی قۆناغەکانی پێشکەوتنی تایبەتی خۆی دەرك دەکرێت. ئایا تا ئێستا بەشێکی پەروەردەیی لەسەر بناغەی تێگەیشتن، پێناسە، بنەماکانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە، رەوش و فیکرەکان و چەمکە سیاسییە ئیسلامییەکان دامەزراوە؟ چ جیاوازییەك لە نێوان ئەم بەشەو بەشی پەروەردەیی زانستی سیاسیی باو لە خۆرئاوادا هەیە؟ ئایا ئاماژە بە جیاوازییەکان و تایبەتمەندییەکانی هەریەکەیان بەسە؟ بەو شێوەیەی ئاوەها بەشێکی پەروەردەیی بتوانێت لەسەر بنەمای پاڵپشتی ئەکادیمیی و لەسەر بناغەی بینین و داخوازییەکان بینابکرێت و کاروانی تەواوکاریی خۆی ببڕێت، ئایا دەتوانێت لە درووستکردنی زانستی سیاسیی هاوچەرخی ئەمڕۆدا پشکدار بێت و تەجروبەی شارستانیی تایبەتی خۆی — کە بە سروشتی خۆی تەجروبەیەکی جیاوازە لە تەجروبەی خۆرئاوا — بڕژێنێتە پەیکەری ئەم زانستەوە؟ سەرەڕای ئەمە، ئایایی وەرگیراو لەو بەهاو فیکرانەی کە لە فەرهەنگی ئێمەوە سەرچاوەی گرتووە، بە چاکیی لەسەر ئەندامەکانی شارستانییەتی ئیسلامیی کاریگەریی و کارلێکیان هەیە و لە لایەکی تریشەوە یەکێك لە جۆگەکانی بێداری و هۆشیاریی بۆ گرنگی پێکهێنانی سیستمە مەعریفیی و فەرهەنگیی و زانستییەکانن لەسەر بناغە و

بنەما ئیسلامییەکان، ئەو بنەمایانەی کە بە جوانیی نزیکیی و هاوبەشیی پێویست لە نێوان ئەندامانی ئەم شارستانییەتە ئیسلامییە (موسوڵمان بن یا مەسیحیی) و کەلەپوورو مێژووی فەرهەنگییان بەدیی دەهێنێت، هەتا لە جێگەی ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ رابووردوویان و تەنها بەوەندە واز بهێنن، کۆمەڵگەیەکی هاوئاهەنگ لەگەڵ ماهییەت، پێکهاتەی مێژوویی و فەرهەنگیی کاریگەر سەرلەنوێ نۆژەن بکەنەوە، بە مامەڵەکردنی دروست لە نێوان واقیع و مێژوو لە لایەك و کەلەپوور و پێناسی "خۆ" و فیکری "دیکە" لە لایەکی ترەوە دەست بەکاربن و بە رەوشتێکی گونجاو، بە مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردە سیاسییەکانی جیهانی ئەمڕۆدا شاد ببن. لە هەلومەرجی نێودەوڵەتی ئەمڕۆدا، مرۆڤی شارستانیەتی ئیسلامیی و کۆمەڵگەکەی کاریگەریی و کارامەیی نییە و پێناسی خۆی لە بەردەم مەترسیی هەڵوەشانەوە لە شارستانیەتی "ئەوی تر"دا دەبینێتەوە کە یا لەگەڵ ئەودا گونجاو نییە، یان لەگەڵ ئەو مەرجانەی کە لە رووی ژیریی و دەروونیی و گیانییەوە لەودا بۆی دروست بووە لەگەڵ خۆیدا هاوئاهەنگیی نابینێتەوە. چ جای ئەوەی بگاتە ئەوەی کە قەیرانەکانی شارستانیەتی ئەویتر بە رەنگدانەوەی لە شارستانیەتی خۆیدا، ئەنجامگەلێك بهێنێتەدیی کە لەدایکبووی ژینگەی مێژوویی و جوگرافیی خۆی نەبێت.

بۆ بەدیهێنانی ئاوەها مامەڵەیەکی بە بەرنامە لەگەڵ کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا، پێشنیاز دەکرێت کە بنەماکانی رەوشی ناسین (لە چوار بەشدا) تێبینی بکرێن:

١ – خستنەبەرباسی فیکر لە پێکهاتەی مێژووییدا.

بۆ مامەڵەکردنی بە بەرنامە لەگەڵ هەر فیکرێکدا، نە تەنها پێویستە کە ئەو مەرجانەی ئەو فیکرە لە پێکهاتەیدا هەیە بە شێوەیەك درك بکرێت کە قەتیس مانی ئەو هزرە لە ماوەی مێژووی تایبەتی خۆی، بەکارنەهاتوویی (ئەو فیکرە) لە دونیای ئەمڕۆدا خستنەڕووی رەگەزە نەمرو دوور لە کات و شوێنەکانی فیکری بیریاری لێنەکەوێتەوەو لە لایەکی تریش گشتگیریی و بەکارهاتوویی تەواویش پەیدا نەکات، بەڵکو دەکرێ لە نێوان دراوەکانی کات و شوێندا تایبەتمەندیی کەسیی و ئەوەی کە لەگەڵ سیستمی مەعریفەی ئیسلام (سیستمی مەعریفەی ئیسلامیی بە هۆی پەیوەندیی لەگەڵ سروشدا بالاتر و لە دەرەوەی کاتەوەیە و لە چوارچێوەی شوێندا ناگونجێنرێت) پەیوەندیدارە و لێك جیاناکرێتەوە. بەم هۆیەوە دەتوانین هەردوولا واتە واقیعی دەرەوە و فیکری بیریار بە شێوەیەکی جیا و بە بەرنامە بناسین کە بتوانرێ بە مامەڵە لەگەڵ واقیعی هاوچەرخدا سوود و بەهرەی لێوەرگیرێت. هەمیشە لە نێوان رێڕەوە رەهاو تایبەتەکانی هەر فیکرێك، نزیکییەکی جیاواز هەیە، چەندین هۆکاری هەروەکو هەلومەرجی کاتیی، هەرێمیی، سیستمی بەهایی، فەرهەنگ، توانای ژیریی مرۆیی و بەڵگەنەویستیی و ئاشکراکانی و سروش و بیروباوەڕ لەم نزیکییەدا کاریگەرن. لەو فیکر و بیرکردنەوانەی کە لەسەر بنەمای سروش نین، نزیکیی رێڕەوە تایبەتەکان زیاترە، بەڵام ئەگەری هەبوونی بڕیارە گشتییەکان ئینکار ناکرێت. بە پێچەوانەوە لە هزرو بیرە دامەزراوەکان لەسەر بنەمای سروش، نزیکی بڕیارە رەهاکان بەسەر بڕیارە تایبەت و بەشی (جزئی)یەکاندا زۆرتر دەبێت، بەڵام ئەم زۆر بوونە نابێتە هۆی سڕینەوەی بڕیارو حوکمە تایبەتەکان، چونکە توانای فیکری مرۆڤ

سنووردارە و ئەم سنووردارییەش لە دوو خاڵدا دەردەکەوێت، یەکەم ئەوەی کە فیکر لە شارستانییەتدا لە خوازیاریی خۆیدا بەڵام لە سەردەمێکی دواتردا بیەوێت بەکاربهێنرێت و ئەوەش ئەوەی کە فیکر لە شارستانییەتی هاوچەرخدا بە شێوەیەکی تر پێشکەش بکرێت. هەروەکو چۆن شارستانییەتە هاوچەرخەکان، لە زۆرێك لە رەگەزەکانی سیستمی مەعریفیی خۆیاندا وەکو: بیروباوەڕەکان، فەرهەنگ، زمان، ژینگەی جوگرافیی، کۆمەڵایەتیی و مێژوویی جیاوازییان هەبێت، زەمینەی بەکارهێنانی فیکر یەکێك لەوی تردا سنووردارتر دەبێت، بە پێچەوانەی کاتێ کە فیکر لە هەمان شارستانیەتدا بەڵام لە کاتێکی درەنگتردا بیەوێت بەکار بهێنرێت. لەم رووەوە کەلەپووری سیاسیی ئیسلام هەروەکو سەرچاوەی تیۆردانانی سیاسیی، سەبارەت بە فیکری خۆرئاوایی بۆ راستیی و واقیعەکانی هاوچەرخی ئێمە خاوەنی توانای زیاترەو بە هەمان شێوە ئەم کەلەپوورە بۆ واقیعی ئەمڕۆی ئەوروپا یا چین، بەکەڵك هاتنی کەمترە.

به خوێندنەوەی کەلەپووری سیاسیی موسوڵمانان تێبینیی دەکرێت کە ئەم کەلەپوورە زۆرترین پەیوەندیی بەو واقیعەی لێوەی سەرچاوەی گرتووە، هەیە، لە مەسەلەکانی هۆشدا نقوم نەبووەو لە بیرکردنەوەی هۆشییدا بەو بۆچوون و تێگەیشتنەی کە خودا لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دا بەوی داوە رازیی بووەو راوەستاوە، لەم رووەوە دەبینین ژیریی مرۆڤی موسوڵمان بۆ دەرمانی واقیع لە بۆچوون بۆ واقیع و لە واقیع بۆ بۆچوون لە جووڵەو هەوڵدایە، بە پێچەوانەی فیکری یۆنانیی کە بە هۆی بۆشایی سروش و رێنمایی ژیان لە جووڵانەوەی مێژووی مرۆڤایەتییدا، لە

بۆچوون و تێگەیشتنەکانی خۆیدا نقوم بووە. لە ئەنجامدا ماهیەتی زانستی سیاسیی، یان بیرکردنەوەی سیاسیی لە ئیسلامدا لەگەڵ زانستە ئیسلامییەکانی تردا جیاوازیی بنچینەیی پەیدا کرد، چونکە نووسینی لەم زەمینەیەوە بە پێچەوانەی زۆربەی زانستە ئیسلامییەکانەوە، بۆ پارێزگاری و گوێزانەوەی زانستەکان بە نەوەکانی داهاتوو نەبوو، بەڵکو بەردەوام بۆ چاکسازیی واقیعی سیاسیی و گۆڕانکاریی و هەروەها هاندان و جۆشدانی خەڵك بۆ چاکەو دوورخستنەوەیان لە گومڕایی ئەنجام دەدرا، لەسەر ئەمە و لەسەر بناغەی سوننەتێکی نیمچە بەردەوام، کتێب پێشکەش بە دەسەڵاتدار کراوە، یا بە پێی داخوازیی دەسەڵاتدار بۆ دروستکردنی بەرنامەیەکی زانستیی و بەکارهاتوو بۆ رێکخستنی وڵات و دەوڵەت دەنووسرا، لە ئەنجامی ئەم هەزرەدا بە ئەندازەیەك لەگەڵ واقیعدا تێکەڵ بووە کە درك و لێکۆڵینەوەی بەبێ لەبەرچاوگرتنی توێژینەوەی واقیع و هەلومەرجی مێژوویی و خووی دەسەڵاتدار دژوار دەبێت. بۆ نموونە دەکرێ باسی سەردەمی "قنصوە غوری" دواهەمین پاشای مەمالیکی میسر بکرێت. لەم سەردەمەدا نووسینە سیاسییەکان روویان لە زیادبوون کرد، ئەمەش چاودێرە بەسەر فراوانبوونی گەندەڵیی و کەموکورتییەکان لە سیستمی سیاسیی مەمالیکدا کە لە کۆتاییدا پاش تێکشکانی لە لایەن پرتوگالییەکانەوە بە دەستی عوسمانییەکان، پێچرانەوە.

لەسەر بنەمای خوویەکی تر، بۆ ئەو دەسەڵاتدارانەی کە نووسینێکیان پێشکەش کرابوو، کتێبی کۆنی نوسراو کۆپی کراوەو بەم دەسەڵاتدارە یا دەسەڵاتدارێکی تر پێشکەش دەکرا، هەتا بە جێبەجێ کردنی وتەکانی بارودۆخی دەوڵەتەکەی چاك بکات، ئەم مەسەلەیە دەبوویە هۆی

سەرهەڵدانی گرفت و قەیرانی جۆراو جۆر، کە پێویستی بە توێژینەوەی قووڵی مەعریفیی هەیە.

٢ – گرنگیی جیاکردنەوەی فیکری سیاسیی لە فیقهی سیاسیی.

بە خوێندنەوەی توێژینەوە هاوچەرخەکان سەبارەت بە فیکری سیاسیی ئیسلامیی و مەسەلەکانی، مەسەلەی جیاکردنەوەی ئەوەی فیکری سیاسیی دەژمێردرێت و ئەوەی پێی دەوترێت فیقهی سیاسیی دەردەکەوێت. تێگەیشتنی شەرعی (فقە) لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، هەمان جێگەی سەبارەت بە زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان هەیە کە فەلسەفە سەبارەت بە زانستی کۆمەڵایەتیی لە شارستانیەتی خۆرئاوادا هەیەتی. چونکە زانستە ئیسلامیەکانی تر لە چوارچێوەی فیقهدا "تۆو" و یەکەمین بەرهەمەکانی خۆی دەسکەوت، پاشان بە شێوەیەکی سەربەخۆ بە ناوەندی جیاو دانراوی سەربەخۆ دەرکەوتن. بە لەبەرچاوگرتنی ئاوەها رۆڵێك بۆ فیقهی ئیسلامیی، بەردەوام ئەم زانستە (فقە) لە گۆشەنیگاو رەوشی تایبەتی خۆیەوە بۆ مەسەلەی زانستەکانی تر دەڕوانێت، لەم رووەوە چارەیەکمان نییە جگە لە جیاکردنەوەی ئەم دوو رەوشە.

جیاوازیی نێوان فیقهو فیکر بەو مانایە نییە کە ئەم دوانە هۆکارگەلی جیاوازتریان هەیە. بەڵکو هەردوانیان دەیانەوێت ژیریی و هۆشی خۆیان لە مەسەلەکانی رووبەڕووی مرۆڤدا بەکاربهێنن کە پاش هەوڵ و تواناو هێزیان بگەنە تێگەیشتن، جیاوازییەکانی ئەم دوانە سنووردارە لە سێ لایەندا:

أ – چاوگەی مەعریفیی و زانستیی: زانای تێگەیشتوو (فقیە) لە دوو چاوگە سوود وەردەگرێت، واتە واقعیی و سروش (وحی). ئەو یا لە سروشەوە دەست پێدەکات هەتا بڕیارەکانی بە سەر واقیعدا نوێ بکاتەوە،

یا لـه واقیعـه بـەرەو سـروش دەڕوات هـەتا بڕیارگـەلێکی دەسـتکەوێت بـۆ مەسەلە نوێیەکان و پەرستن تەنها بۆ خودا دەستەبەر بکـات، بـەڵام بڕیـار پشت بە کاروباری جیاواز دەبەستێت. ئـەو بـە تـەوەرە بڕیـاردانی سـروش، جووڵانەوەی خـۆی دەسـت پێـدەکات و واقیـع دەخاتـە ژێـر توێژینـەوەوە، هەوڵدەدات پێناسەی بکات و لێی بکۆڵێتەوە و درکـی بکـات و هۆکارەکـانی سەرکەوتن یا ناکامیی بدۆزێتـەوە و چـۆنیەتی مامەڵـە لەگـەڵ کردنـی بـاس بکـات. ئـەو بـۆ ئـەم کـارە لـە سـروش و سـوننەتی مێـژوویی و بەدەسـت هاتووەکانی ژیریی مرۆیی (موسوڵمان و ناموسـوڵمان) سـوود وەردەگرێـت، کە ئەمە لە ناوەندی کاری فەقیهدا نییە، چونکە زانـای تێگەیـشتوو (فقیـە) لەسەر بنەمای بیروباوەڕی تایبەت، بڕیار دەدات و رەگـەزەکانی بێگانـە بـە بیروبـاوەڕی ئـەو ناتوانێـت لـەناو چـالاکییەکانی ئـەودا دەربکـەوێت، لـە حاڵەتێکدا بۆ بیریـار، بـاوەڕ تـەنها، ئامانجـەکان، ئەگـەرەکان و بنـەماکانی رەوشی ناسین دیاریی دەکات. لەسـەر ئـەم بناغەیـە، پاشمـاوەی بیریـارانی مەسیحیی وەکو ئیبنو مەماتی، یەعقوبی کوڕی سابیت و ئیبنو بەتریق (إبن بطریق) کە مامەڵـەیان لەگـەڵ سیـستمی مەعریفـەو تێگەیـشتنی ئیـسلامیدا کردووە چەندین دەسکەوتیان بەجێ هێشتووە، کە لـە بازنـەی کەلـەپووری سیاسیی ئیسلامییدا جێگەیان دەبێتەوە، هەرچـەندە لـە دەرەوەی بازنـەی فیقهی سیاسیی ئیسلامییشدان.

ب — رەوشناسیی (المنهجية): مامەڵەی زانـای شـەرعزان (فقیـە) لەگـەڵ دەقدا زیاترە لە مامەڵەی رەوشـیانەی ئـەو لەگـەڵ واقیعـدا. رەوشـی زانـای تێگەیـشتوو لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەی دەقـە. ئـەو بـە دەرکـی واقیـع و دیـارییکردن، دووبـارە سـەیرکردنەوەو وەرگرتنـی بنـەماکانی (ئـەو دەقـە)

بڕیاری گونجاو دەردەکات، بەڵام بیریار هەرچەندە بە دوای تێگەیشتنی دەق و مانا وردەکانیدا دەڕوات، بەڵام ڕەوشی گشتیی ئەو بە تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەی واقیع کۆتایی دێت. هەرچەندە فەقیهو بیریار، هەردووکیان لەگەڵ دەق و واقیعدا دەژین، بەڵام ئامانج و ڕەوش و ڕێگای جیاوازیان هەیە. ئەگەر ئامانجی زانای شەرعزان لە لێکۆڵینەوەی دەق و ناسینی واقیعدا دەسکەوتنی بڕیاری شەرعییە، کە دەبێت ڕاست و ڕاستگۆیانە هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ شەریعەتدا، ئامانجی بیریار پێناسەی وردی واقیع و پێشکەشکردنی ڕێگەچارەو ڕێنماییە بۆ دەرمان و چاکسازیی. ئەو ناڵێت کە ڕێگاچارەکانی ڕاست، گونجاو و دروستن، بەڵکو هەوڵدەدات کە بەم شێوەیە بن چونکە ئامانجەکانی ئەو نابنە ئەرکی پێویستبوو لەسەر ئەوانی تر.

ج – یەکەکانی لێکۆڵینەوەی سەرەکیی: بە شێوەیەکی گشتی و سادە زانا (فقیە) دیاردە تاکە کەسییەکان دەخاتە ژێر باس و لێکۆلینەوەوە، بەڵام بیریار دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەخوێنێتەوە، لەم ڕووەوە یەکەی لێکۆڵینەوە لە لای زانای شەرعزان تاکە، لە لای بیریار کۆمەڵگە و کۆمەڵە. مامۆستا شێخ عەلی جومعە موحەممەد، لە نێوان کەسایەتی سروشتی و کەسایەتی مەعنەویی لە فیقهی ئیسلامییدا ئاماژە بە جیاوازیی دەکات. ئەو بڕوای وایە لە کەلەپووری فیقهییدا زیاتر کەسانی سروشتیی واتە کەسانی جێگەی ئاماژەپێکردن بوونیان هەیە نە کەسانی مەعنەوی (دامەزراوەکان، کۆمەڵەکان و گرووپەکان).[٢٥]

[25] الدكتور علي جمعة محمد، الشخصية الطبيعية و الشخصية المعنوية في الفقه الإسلامي، مصر، جامعة الأزهر – كلية الدرسات العربية و الإسلامية ١٩٩٠م.

به وردبوونەوە لە نووسراوە هاوچەرخەکانی فیکری سیاسیی ئیسلامیی، دەبینرێت کە زیاتر باس لە سەرچاوەکانی فیقهی سیاسیی دەکات نەك باسکردن لە فیکری سیاسیی، ئەویش بە باسکردن و گەڕانەوە بۆ باسەکانی حوکمڕانیی (أمارة) و فەرمانکردن بە چاکە و رێگریی لە خراپە و ئەوانی تر لە فەرهەنگە فیقهییە بچووك و گەورەکان. بەمەش رواڵەتی دووبارەکردنەوە و نوێنەکردنەوەیان وەرگرت.

بۆ هەموو فیکری ئیسلامیی گشتێنران، بە بێ ئەوەی جیاوازیی بکەن لە نێوان فیقهی سیاسیی و فیکری سیاسییدا و ماهیەتی تایبەتمەندییەکانی چاوگە فیقهییەکان (کە پەیوەندیدارن لەگەڵ سروشتی نەمرو بە دوای پێشکەشکردنی بەرنامەو چوارچێوەیەکەوەن لە دیاردەی سیاسەت) بدۆزنەوە، لەوێوە کە سەرچاوەی مەعریفەی هەردووکیان یەکێ بووە، بڕیاری دووبارە بوونەوەیان داوە. لە سەرچاوە فیکرییەکان، پشکی واقیع لە چاوگەی مەعریفەییدا زیاتر دەبێت، گۆڕان و گۆڕانکاریی دەسەپێنێت، چونکە واقیع هەمیشە لە نوێبوونەوە و گۆڕاندایە. سەرەنجام بۆ بەدواداچوونی شێوەی مامەڵەی موسوڵمانان لەگەڵ دیاردەی سیاسەتدا، کەواتە لە چوارچێوەی فیکری سیاسیی یا فەلسەفەی سیاسیی یا سیستمی حکومەتدا، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی فیکری سیاسیی و ئەگەر کەسێك بیەوێت لە کێڵگەی تیۆری سیاسییدا لە ئاستێکی باڵای فیکردا کار بکات، سەرچاوەی مەعریفە هەڵێنجانی ناوبراو فیقهی سیاسیی دەبێت.

٣ – رەوشناسیی مامەڵە لەگەڵ چەمکە کەلەپوورییەکان.

مامەڵەی هاوچەرخان لەگەڵ کەلەپووری سیاسییدا، نیشانی دەدات کە لە لێکۆڵینەوی چەمکەکاندا، وردەکاریی رەوشناسیانە بە شێوەی گونجاو

ئـــەنجام نـــەدراوە، بـــەو شـــێوەیەی کـــە هۆکـــاری چـــەمکە سیاســـییە هاوچەرخەکان، کە رەنگدانەوەی چەمکە وەرگێڕدراوە ئەوروپیەکانن لەسەر چەمکە کەلەپوورییەکان دەبنە قورسایی و هۆکارە هاوچەرخەکان، ماناکانی کەلـەپوور دەرك دەکـرێن و ئـەو کاتـە ماناکـانی کەلـەپوور چـەمکی مانـای هاوچەرخیان لەبـەر دەکرێـت، هـەمان مانایـان بەسـەردا دەسـەپێنن و بـەم شـێوەیە – کـە چـیتر شـتێك بـۆ تێگەیـشتن جگـە لـە دەربـڕینی زاراوە نامێنێتـەوە – تێگەیـشتن و چـەمکە کەلەپوورییـەکان داوەرییـان لـەبارەوە دەکرێت، بۆ نموونە سەبارەت بەو زاراوانە دەکرێ ئاماژە بەمانەی خوارەوە بکرێت:

أ – چـەمکی جـەماوەری فەرمانبـەردار (الرعیـة): زاراوەی رەعیـەت لـە ماناکـــانی چـــاودێریکردن، پاراســـتن، گرنگیـــی پێـــدان، پێڕاگەیـــشتن، بەرپرسیارێتی هـەبوون، وەرگـیراوە، لـە فەرمووودەیـەکی پێغەمبـەر ﷺ دا هاتووە: "کلکم راع و کلکم مسؤول عن رعیتـه". لـەوێوە کـە ئـەم زاراوەیـە نیشاندەری چەمکی چاودێرییکردن و پاراستن و بەرپرسیارێتییە بەرانبەر بە ژێردەستان، دواتـر بـۆ جـۆری روونکردنـەوەی ماهیـەتی پەیوەنـدیی نێـوان دەسەڵاتدارو فەرمانبەردار سوودی لێ وەرگیراوە. ئەم تێگەیشتنە (چـەمکە) بۆ ئەو ژنە دەشتەکییە کە خەلیفە عومـەری کـوڕی خـەتتاب (رەزای خـوای لێبێت) ئاردی بۆ دەهێنـاو لـە حاڵەتێکدا ئـەوی نەدەناسـی و رەخنـەی لـە خەلیفە گرت و ئەوی بـە شایـستەتر زانـی لـە عومـەرو ئـەوی بـە شایـستەی خیلافەت زانی – چونکە ئەو چەمکە بـۆ ئـەو ژنـە زۆر روون بـوو – چـونکە کاتێ خەلیفە لە ئەوی پرسیی: "خەلیفە لە کوێوە لـە حـاڵیی ئێـوە ئاگـادار بێـت؟" ئـەو وەڵامـی دایـەوە: "ئایـا فـەرمانڕەوای ئێمەیـەو ئاگـای لێمـان

نییە؟"، ئەم وەڵامە دەریدەخات کە ئەو ژنە بە تـەواویی ئاشـنای ماهیـەتی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتدارو فەرمانبەردار بـووە لـە سیـستمی مەعریفـەی ئیسلامییدا.

تەواوی ئەو چـەمکانەی باسـکران لـە زاراوەی "رعیـە" جیاکراونەتـەوە "Subject" و هاوماناکـانی لـە زمانـە ئەوروپییەکانـدا جێگـەیان گرتووەتـەوە، وەرگێڕەکـان بـۆ وەرگێڕانـی زاراوەی رەعیـەت لـە وشـەی Subject سـوودیان وەرگرتـووە، لـە حاڵەتێکـدا ئـەو وشـەیە لـە مانـای لاتینیدا گوزارشتە لـە جـۆرێکی تایبـەت لـە پەیوەنـدیی فـەرمانڕەوا لەگـەڵ چینێکی تایبەت لە کۆمەڵگەدا کە لە ماف هاووڵاتیبوون بێ بەشن و لە خـوار چـینە کۆمەڵایەتییـەکانی تـرەوەن. Subject بـە خـەڵکی وڵاتـە داگیرکراوەکانی رۆم دەوترا کە لە ژێر دەسـەڵاتی رۆمەکانـدا بـوون و ئـەوان دەسەڵاتی خۆیان بەسەریاندا دەسەپاندو هیچ مافێکیان بۆ رەوا نـەدەبینین و خاوەنی هیچ مافێ نەبوون.

نـە تـەنها چـەمکی تێگەیـشتنی ئـەوروپایی نـوێ جێگـەی تێگەیـشتن و چـەمکە ئیـسلامییەکانی ئـەم زاراوەیـەی گرتـەوە، بـەڵکو لەسـەر بنـەمای تێگەیشتنی ئەوروپایی ئەم مانایانە خـۆی بەسـەر تێگەیـشتنی کەلـەپووری کارەکانـدا توێژرانـەوەو پەیوەندییـەکی فیرعەونانـەی نێـوان دەسـەڵاتدارو فەرمانبەرداری دەرخست.

ب – چەمکی ئیـستیبداد: کـە لـە سەرچـاوەکانی کەلـەپووری سیاسـیی ئیـسلامییدا بـەو مانایەیـە کـە دەوڵـەت بتوانێـت لـە تـەواوی زەمینەکانـدا فەرمانڕەوایی خۆی بە تەواویی بەکاربهێنێ و بسەپێنێ، بەو شـێوەیەی کـە مۆڵەتی هیچ شۆڕشێك نەدات، لە دەسـەڵاتی هەرکەسـێك بـە سـەر خەڵکیـدا

ڕێگریی بکات و ڕێگر بێت لـه سـەپاندنی بـاج و سـەرانە، هـەر بڕیارێـك بـەو شـێوازەی لـە زانـستی سیاسـەتی هاوچـەرخدا بـە چـەمکی (دزەکـردن = التغلغل) ناسراوە (Penetration)، کە هەنووکـە ئـەم چـەمکە بـە هـەمان دەلالەتــەکانی چــەمکی (Despotiom) لێــی دەفامرێــت و بــە وشــەی (ئیستیبداد) مانا کراوە و واتای دیکتاتۆریی، ملهوڕیی و دەستگرتن بەسـەر دەسەڵاتدا دەدات، پاشانیش دەستەواژەکەی هەریەك لە ئیمـامی غـەزالی و موحەممـەد عەبـدەش "المـستبد العـادل" هـەر بـەپێی ئـەم تێگەیـشتنە لێکدرایەوە، نەك بەپێی ئەو تێگەیشتنەی ئەوان مەبەستیان بوو، ئـەوە بـوو کە دەسەڵاتدار دەبێ بتوانێت سیستمی دادپەروەریی بەڕێوە ببات و بۆ ئەو شایستە نییە کە بێهێزیی و بـێ توانـایی حکومـەت ببێتـە هـۆی دەسـەڵاتی بێگانــەکان بەســەر بەشــەکانی قەڵــەمڕەوی ئــەوداو ســتەم لــە جــەماوەر (ڕەعیەت)ی ئەو بکرێت.

ج – زاراوەی "سیاسـەت": مامەڵـە لەگـەڵ ئـەم زاراوەیـەدا ئـەمڕۆ بـەو پێناسـەیەی کـە موسـوڵمانان کردبوویـان ئـەنجام نادرێـت، بـەڵکو لەسـەر بناغەی چەمکە هاوچەرخەکانی ئەم چەمك و تێگەیشتنە کە بە مانـای هێـز، دەسەڵات، دەوڵەت و...هتد بـەکار دەهێنرێـت، لـە حاڵەتێکـدا بـەکارهێنانی ئــەم زاراوەیــە لــەلای موســوڵمانان لەگــەڵ بەرژەوەنــدیی، چاکــسازیی، چارەسازیی، چاودێریی پەروەردە، ڕێنمایی و... هتد پەیوەندیی هەبوو.

د – زاراوەی "دەوڵــەت": کــە بــە مانــای دەستاودەســتکردن و گۆڕانکارییە، لـە سەرچـاوەکانی کەلـەپووردا بـۆ سیـستم یـا ڕێکەوتننامـەی سیاسییش بەکارهێنراوە، بەڵام هیچ کاتێ بە مانای گەلێ لـە ژێـر قەڵـەمڕەو (جوگرافیا)یەکی دیاردا لە ژێر فەرمانڕەوایی حکومەتییـدا بـە چەسـپاویی و

دامەزراویی بژی لە ئارادا نەبووە. ئەم زاراوە کەلەپوورییە ئەمڕۆ بـە جـۆرێ بــەکار دەهێنرێــت کــە دەوڵــەتی نەتــەوەیی و ئــەو مەســەلانەی وەکــو هــاووڵاتیبوون، ســنوورەکان و.. هتــد مانــای لێکدەدرێتــەوە و مانــای لێوەردەگیرێــت، لــە حاڵەتێکـدا هــیچ بیریــارو زانایــەکی موســوڵمان بــۆ روونکردنــەوە (باســکردن)ی ئــەم چــەمکانە لــە زاراوەی دەوڵــەت ســوودی وەرنەگرتووە. ئیبن خەلـدون لـە تەمـەنی دەوڵـەت، قۆناغـەکانی دەوڵـەت و پەیوەندییان بە ئاوەدانی و شارستانیەتەوە قسەی کـردووە و لـەوێوە کـە هەندێ لەگەڵ زمان و چـەمکەکانی ئیبنـو خەلـدون ئاشـنا نـەبوون، دەرك و تێگەیشتنی نادروستیان لەو هەڵێنجاوە.

هـ – زاراوەی سـێبەری خـوا (ظـل الله في الأرض): هەنـدێ لـە بیریـارانی موسوڵمان، لەم ئاوەڵناوە بۆ پەسنی فـەرمانڕەوا سـوودیان وەرگرتـووە.بـە پێی خوو نەریتی موسوڵمانان، ئـەوان هـەر کاتـێ دەیانەویـست ئەرکـەکانی فەرمانڕەوا بەرانبەر بە میللەت بژمێرن لە ناوە گـەورەکانی خـودا هـەروەکو "قیّم" واتە سەرپەرشت سوودیان لێوەردەگرت و تێدەکۆشان، هـەتا بۆیـان بکرێت فەرمانڕەوا نزیـك بکەنـەوە لـە ئاوەڵناوەکـانی پـەروەردگار. زاراوەی "ظل الله" بۆ فەرمانڕەوا بەم هۆیەوە بوو کە بـیری دەسـەڵاتداری بخەنـەوە سـەبارەت بـە خـەڵك (رەعیـەت) هەسـت بـە بەرپرسـیارێتیی بکـات، دەبـێ ئەخلاقی پەروەردگار، تەوەرەی رەفتاری ئەو لەگەڵ میللەتـدا بێـت، لەبـەر ئەوەی کە سوود یا زیانی خەڵکیی لە دەستی ئەودایە، دەبێ لەگەڵ ئەوانـدا دادپــەروەر، بــە بــەزەیی، خێرخــوازو راســتگۆ و.. هتــد بێــت، کاتــێ کــە توێژەرانی هاوچەرخ دەسـتیان کـردە خوێندنـەوەی کەلـەپووری سیاسـیی، مانـاو چـەمکی تێگەیـشتنی کلیـسایی ئـەوروپایی "ظـل الله" یـان لـەوەوە

وەرگرت، کە چەمکێکە مافی پیرۆزیی حکومەتکردن دەداتە دەسەڵاتدار (فەرمانڕەوا)، چونکە ئەو خاوەنی دونیایەو خوا خاوەنی دوا رۆژە. لەم رووەوە لە بەکارهێنانی نوێدا ئەم زاراوەیە زیاتر لە باسی ماف و خەسڵەتی فەرمانڕەوادا باسکراوە، لە حاڵەتێکدا لە بەکارهێنانی ئیسلامییدا زیاتر لە باسی ئەرکەکانی دەسەڵاتداردا بەکار هێنراوە. دەبێ جەخت بکەینەوە کە سەرەڕای ئەمانەش، ئەم زاراوەیە لە کەلەپووری سیاسییدا بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکار نەهێنراو وەرنەگیرا.

چەمك و تێگەیشتنە پێشکەشکراوەکان تەنها بەشێك لەو نموونە فراوانانەی ئەم دیاردەیە بوون و پێشنیاز دەکرێت بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ چەمك و تێگەیشتنەکانی کەلەپووری سیاسییدا لە ماوەی ئەم قۆناغانەی خوارەوەدا لەسەر بناغەی چاووگ و مەعریفەی تایبەت کار بکرێت:

أ – تێگەیشتنی زمانەوانی بە سوود وەرگرتن لە فەرهەنگە زمانەوانییەکان، ئەنسکلۆپیدییەکان و ئەو کتێبانەی کە پێناسەیان کۆکردووەتەوە دیاریی بکرێت.

ب – تێگەیشتنی زاراوەیی وشە، کە لە ناو پسپۆڕانی ئەو بابەتەدا واتە بیریارانی سیاسیی بە دەست بهێنرێت.

ج – چەمکی نەریت (عرف)ی زاراوە کە لە واقیعی کۆمەڵایەتیی و مێژوویی ئەو سەردەمەدا کە نووسەر تیایدا ژیاوە روون بکرێتەوە.

د – بە پێی لێکۆڵینەوەو روونکردنەوەی دەقی هەر نووسەرێك، دەبێ پەی ببرێت بە پەیوەندیی زاراوەکە لەگەڵ پێکهاتەی ئەو زاراوانەی کە ئەو بەکاری هێناون و مەوداکانی تێگەیشتنی هەر زاراوەیەك کە ئەو مەبەستی بووە دیاریی بکرێت.

٤ – باسی وەرگێڕان و ماهیەتی سیستمی مەعریفە لە ئیسلامدا.

مەسەلەی وەرگێڕان ئەو کاتە بە شێوەیەکی جیدیی باسکرا کە توێژەرانی هاوچەرخ مامەڵەی خۆیان لەگەڵ فیکری ئەورووپاییدا دەست پێکرد، مامەڵەیەك کە ڕەوشمەندانە و ڕێکخراو بۆ تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە نەبوو زیاتر بەهۆی مەسەلە ئایدیۆلۆژییەکانەوە بوو. هەرچەندە دەستیان کردە مەسەلەی وەرگێڕان، بەڵام توێژینەوەیەکی گونجاویان لەو بارەیەوە پێشکەش نەکرد، هەتا بتوانن لە پێکهاتەی مێژوویی خۆیاندا بە درووستی جێگە بگرێت و لە پێکهاتەی مەعریفەی ئیسلامیی ئەو سەردەمەدا پێگەی روون بکرێتەوە، بە دەستەواژەیەکی تر، سەپاندنی واقیعی هاوچەرخ بەسەر مێژوودا بە درووست لە قەڵەمدانی بابەتە فیکرییەکان و ڕێگە فیکرییەکانی ئێستا لە ڕووی مێژووییەوە، ڕێگر بوون لە ڕێگەی تێگەیشتنی دروستی وەرگێڕاندا.لە دوو ڕووەوە مەسەلەی وەرگێڕانیان باسکردووە کە هەردووکیان بە ئەنجامێکی یەکسان کۆتاییان هات:

١ – هەندێك لە دیاردەی وەرگێڕان لە مێژووی موسوڵماناندا سوودیان وەرگرت هەتا بیسەلمێنن کە لە ئیسلامدا فیکری سیاسیی بوونی نەبووە و بەرهەمی بە دەست هاتووی موسوڵمانان جگە لە وەرگێڕانی بابەتە یۆنانی و ئێرانییەکان شتێکی تر نییە. ئەم تیۆرە بناغەی بۆچوونی دکتۆر عەبدوڕڕەحمان بەدەوییە لە کتێبی "الأصول اليونانية للنظريات السياسية الإسلامية"، بە پێی بۆچوونی بەدەوی، سیستمی سیاسیی موسوڵمانان هەتا پێش لە مامەڵەیان لەگەڵ یۆنان و ئێراندا زۆر سادە بووەو ئەوان لەو سەردەمەدا لە هەر جۆرە فیکرێك بێبەهرە بوون. ئەو بڕوای وایە ئەوەی کە ئیبنو بەتریق و ئیبنو دایە، لە نووسینەکانی ئەفلاتۆن و ئەرەستۆ

وەرنەگێڕاوە، وەرگێڕانی هیچ یەکێ لەو دوانە نییە، بەڵکو نووسینگەلێکە کە بە دزینی ئەدەبی فەیلەسوفانی یۆنانیی بەدیی هێنراوە، بەهۆی کاریگەریی ئەوانەوە لەسەر فیکری موسوڵمانان ئەم نووسینانە دراونەتە پاڵ ئەرەستۆ و ئەفلاتۆن.

٢- هەندێکی تر بە باسکردنی مەسەلەی وەرگێڕان دەیانەوێت بڵێن کە لە رابردوودا فیکری خۆرئاوایی سەرچاوە و چاوگ بووە، هەتا پەیڕەویی لە جیهانی خۆرئاوای ئەمڕۆ بە ئاسایی لە قەڵەم بدەن و شەرعییەت بەوانەش بدەن ئێستا لەگەڵ بەرهەمە خۆرئاواییەکاندا دەژین، چونکە فیکری ئێمە هەمیشە و تەنها پشت بە وەرگرتن و وەرگێڕان دەبەستێت.

پێش لەوەی کە مەسەلەی وەرگێڕان بە هەمان شێوەی کە لە مێژووی ئیسلامدا ناسراوە بتوێژینەوە، دەبێ ماهیەتی سیستمی مەعریفەی ئیسلامیی بناسین، لە سیستمی مەعریفەی ئیسلامییدا مرۆڤ لە قەیدی شوێنکەوتن (تقليد) و داخران لە بەرانبەری فیکرەکانی ترەوە ئازاد کراوە، هەتا کاتێ کە ئەو نمونانە هەبن کە شێوەی وەرگرتن، هەڵبژاردن، دەرکی تەواو و کاریگەریی و کەوتنە ژێر کاریگەریی بخەنە دەستی ئەو، دەرگای ناسینی تەواویی ئاسۆکان بە رووی ئەودا کراوە دەبێت. موسوڵمانان بە تەنها قورئان و سوننەتیان وەکو سەرچاوەی ناسین سەیر نەکردووە، بەڵکو ئەم دوانەیان وەکو نموونەکانی مەعریفە ناسیوە کە شێوەی فەرمانڕەوا لەسەر ئەوان، شێوەیەکی بیرکردنەوەی ژیرانەو کاریگەریی بەرانبەری فیکرەکان بووەو مرۆڤیان بەردەوام هانداوە کە بە ژیرانە سەیری واقیع و بوون بکات ولە سوننەتەکانی مێژوو، بوون و بوونەوەر پەند وەربگرێت بۆ دۆزینەوەی حیکمەتی ونبووی خاوەن باوەڕ هەوڵ بدات. بۆ ئەم مەبەستە

موسوڵمانان بۆ خۆرهەڵات و خۆرئاوای جیهان گەشتیان کرد، هەتا تەواوی زانستەکان بە دەست بهێنن، تێی بگەن و ئەم کەلەپوورە مرۆییە بۆ مرۆڤەکان پارێزگاریی بکەن. هەرچەندە بەشێك لە کەلەپووری مرۆیی لەگەڵ بیروباوەڕی موسوڵماناندا ناسازگار بوو، بەڵام چونکە لەم سیستمەدا ژیریی هیچ رێگە پێدان و داخوازییەك لە خۆیەوە دەرناکات، ئەم زانستانە دەبێت بخرێنە بەردەستی هەر مرۆڤێك کە خودا ئەوی لە نیعمەتی ژیریی و ئازادیی و هەڵبژاردن بەهرەمەند کردووە، بە هەمان هۆ شێوەی مامەڵەی موسوڵمانان لەگەڵ سەرچاوەکانی مەعریفەدا بە تایبەتی کاتێك کە ئەم سەرچاوانە پەیوەندیدار بوون بە ناموسوڵمانانەوە، جیاوازیی و جیاکاریی تایبەتیان لە وەرگرتنی فیکریاندا تێدا کردووە، وشە بە وشە لێیان وەرنەگیراوە، بگرە ئەگەر جیاوازییەکان لە سروشتی فەرهەنگ، زمانی گفتوگۆ، سیستمی مەعریفە و بابەت پشتگوێ بخەین، وەرگرتنی وشە بە وشە هەرچەندە لە سەرچاوەکانی پزیشکیی، ئەندازیاریی و زانستە سروشتییەکاندا روویداوە، بەڵام لە زانستی کۆمەڵایەتیی و مرۆڤایەتییدا شێوازی جیاواز پەیڕەو کراوە. بە لەبەرچاوگرتنی دوو رەگەز، واتە نێوەرۆکی فیکر (بیرکردنەوە) کە و ئەدەبیاتەکەیشی، دەکرێ سێ رێگا بۆ وەرگێڕان لە مێژووی شارستانیەتی ئیسلامییدا ببینین:

١ – لە قۆناغی یەکەمدا، شێوازیی مامەڵە لەگەڵ فیکر (بیرکردنەوە)ی تردا، بە درك و تێگەیشتنی ئەو فیکرە دەست پێدەکات و لە چوارچێوەی سیستمی فیکریی موسوڵمانان و تێگەیشتن، یەکەکانی توێژینەوە، بەهاکان، وشەو دەستەواژەکانیدا دووبارە بەرهەم دەهێنرایەوە. ئیبنو بەتریق و مەولانا "نصوح" لە نوێنەرانی ئەم قۆناغەن. یوحەننای کوڕی

بـــەتریق (کۆچـــکردووی ٢٠٠ك – ٨١٥ز) کتـــێبی سیاســـەتی ئەرەســـتۆی وەرگێڕاو ناوی "سر الأسرار: كتاب السياسة في تدبير الرئاسة"ی بۆ دانا. ئەو لە ماوەی خوێندنەوەی خۆیدا بـۆ هـەموو لایەنـەکانی فیکـری ئەرەسـتۆ بـە جۆرێك شارەزا بوو ئەو کتێبەی بە شێوەیەك بەرهـەم هێنایـەوە کـە دەڵێـی بەشـێکە لـە سیـستمی مەعریفـەی ئیـسلامیی و هەنـدێ ئـەم کتێبـەیان بـە نووسینی ئەو زانیووە و بە وەرگێڕانیان لە قەڵەم نەداوە. کتێبەکەی ئەو بـە باسـکردنی شـێوازەکانی حکومـەت و پاشـایەتیی دەسـتی پێکـردووە و بـە باسـکردنی چـەندین باسـی وەکـو وڵاتـداریی، ئـەرکی پاشـاکان، وەزیـران، دادپـــــەروەریی، بەردەســـــتان (رەعیـــــەت)و ســـــەربازان درێـــــژەی پێداوە.وەرگێڕانێکی تر لە کتێبی ئەرەستۆ لە بەردەستدایە کە لە دە بـەش پێکهاتووە و لەودا بە باسگەلی وەکو پاشایەتیی، رێکخستن، دادپەروەریی، وەزارەت، نووسەران، کۆنترۆڵی بەردەسـتان، بـاج، بـەڕێوەبردنی کاروبـاری سەربازیی و جەنگەکان و حوکمی سەرکەوتو و ژێرکەوتووی باس کردووە.

مەولانا نەسوح (کۆچکردووی ١٠٠٣ك) هەمان کتێبی بـۆ زمـانی تـورکیی وەرگێڕاوە و ناوی ناوە "فەڕوخنامە". ئەو کتێبەکەی خۆی بـە موحەممـەد خانی کوڕی مورادخانی سوڵتانی عوسمانیی پێشکەش کردووە. فەڕوخنامـە کـــە لـــە شـــانزە بـــەش پێکهـــاتووە، لـــە ســـەرەتادا باســـی دەرکـــەوتنی ئەسـکەندەری مەکـدۆنیی دەکـات – کـە ئەرەسـتۆ ئـەم کتێبـەی بـۆ ئـەو نوسیووە – لە بەشەکانی دواتردا باسی باوەڕ، ئەمانەت، شەرم، رازیبـوون، هیمـەت بـەرزیی، سـوپاس، سـەخاوەت، دادپـەروەریی، پاداشـت و سـزا، لێخۆشـبوون، بەخـشین، رەفتـار لەگـەڵ وەزیـر و پێویـستیی راوێـژکردن دەکـات. کتـێبی سیاسـەتی ئەرەسـتۆ چـەندین جـار وەرگێـڕدراوە، بـەڵام

وەرگێڕدراوەکانی ئەم کتێبە تەواو وەکو دەقی نوسراوی ئەرەستۆ نین، باوەکو هەموو ئەم وەرگێڕدراوانە دراونەتە پاڵ نووسەرە یۆنانییەکەی، بەڵام باوەڕی بتپەرستانەی یۆنانی گۆڕدراوە بۆ فیکری دامەزراو لەسەر باوەڕ و ئامانجی ئاینیی و دەستەواژە یۆنانیی و زاراوە فەلسەفییەکانیش گۆڕدراون بە وشەی عەرەبیی، بەڵام نێوەرۆکی فیکری ئەرەستۆ و گیانی وتەکانی ئەو تیایاندا بە ئاشکرا دەبینرێت.

لە بەرجەستەترین بەڵگەی ئەم مەسەلەیە دەکرێ ئاماژە بە وەرگێڕانەکانی ئیبنو بەتریق بکرێت. ئەو لە شارستانیەتی ئیسلامیی تێر بوو بوو، ناوبراو بە وەرگێڕانی نووسینە پزیشکییەکانی یۆنان ناوبانگی دەرکردبوو، لەوێدا کە لەگەڵ ماهیەتی سیستمی شارستانیەتی ئیسلامیی و پێکهاتەی مەعریفیی ئەودا ئاشنا بوو، سەرچاوە پزیشکییەکانی هەروەکو خۆیان وەردەگێڕا، بەڵام لە وەرگێڕانی کتێبی ئەرەستۆدا ئەوی بە هاوئاهەنگ و گونجاو لەگەڵ سیستمی فەرهەنگیی و مەعریفەی ئیسلامییدا دووبارە داڕشتەوە. لە دیدی ئەوەوە شێوەی مامەڵە لەگەڵ ژیریی مرۆیی و لاشەی مرۆڤدا جیاوازە، چونکە فیزیۆلۆژی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا جیاوازییان نییە، بەڵام ژیریی مرۆیی کە بەرهەمهێنراوی فەرهەنگ، شارستانییەت، زمان و باوەڕە لە شارستانیەتێك تا شارستانیەتێکی تر جیاوازیی هەبووەو لە ئاکامدا دەبێت تایبەتمەندییەکانی خۆی بپارێزێت.

٢ — لە قۆناغی دووەمدا، کە لە سەردەمی موحەممەد عەلی پاشادا[*] دەستی پێکرد، لە زاراوە ئیسلامییەکان بۆ باسکردنی چەمکە مۆدێرنەکان سوود وەرگیرا، بە دەستەواژەیەکی تر، گفتوگۆی ئیسلامیی لە گۆشە

---

[*] دەسەڵاتداری بەهێزی میسر لە ١٨٠٤ تا ١٨٤٥ ز.

نیگـــای "دەرەكیـــی و رواڵەتییـــدا"دا بـــەردەوام بـــوو، بـــەڵام نێـــوەرۆكی بیركردنەوەكانی گۆڕدران و ئامانجەكانی جێگەی ئامانجەكانی تری گرتەوە. بەو شێوەیەی كە رواڵەتی گفتوگۆ گونجاو بوو لەگەڵ پێكهاتەی شارسـتانی و فەرهەنگی ئوممەت، بەڵام مەودای ناوخۆیی ئەو بە تـــەواویی جیاواز بوو. ئەم قۆناغە بە دامەزراندنی دەوڵەتی نویێ لـە میـسردا لـە لایـەن موحەممـەد عەلی پاشاوە دەستی پێكرد، كتێبی (إتحاف الملوك الألبا، تاریخ التمـدن في أوربـا)ی بـۆ وەرگێـڕدرا، كـە پێـشەكی مێـژووی شـارلكان بـوو (هـەر بـەو ناوەشەوە وەرگێڕدرا)، هەتا ببێتە رێخۆشكەری دامەزراندنی دەوڵـەتی نـویێ و یارمـەتی ئـەو بـدات هـەتا ئۆرگانـە نوێیـەكانی خـۆی لەسـەر وێرانـەكانی دامەزراوە ئیسلامییە هەڵوەشـاوەكان هـەروەكو دامـەزراوەی "حـسبة"، یـا پەراوێزخراو وەكو دامەزراوەی "ئەهلی حەل و عەقـد و زانایـان و مـەمالیك" لـە جێگـەیان دامـەزرێنیێ. پـاش ئـەوە خواجـە "حـنین نعمـة الله خـوري" كتێبیكی بۆ ئیسماعیل پاشا** وەرگێڕا بۆ زمانی عەرەبی بـە نـاوی (التحفـة الأدبية في تأريخ الممالك الأورباوية). خوری كـە نووسـەری ئـەم كتێبـەی بـە وەزیرێكـی گـەورەو زانایـەكی بـە تەجروبـە و بـەناوبانگ بـە نـاوی "كیـزۆ" ناساندووە، بە چاكیی تێگەیشتبوو كە لە جیهانیی ئیـسلامییدا بـە تایبـەتی میسر چاوگەی هەڵێنجانی ئیسلامیی (المرجعية الإسلامية) جێگەی دراوەتـە چـاوگەی خۆرئـاوایی، هـەر بۆیـە لـەم رووەوە، كـاتی نووسـینی مێـژووی وەرگێڕانـی كتێبەكـە بـە پێـچەوانەی رۆڵـەكانی شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، سەرەتا مێژووی زاینی و پاشان مێژووی كۆچیی نووسـیووە (١٨٨٧ زاینیـی مەسیحیی بەرانبەر ١٢٩٤ كۆچی) و لە بڵاوكراوەی "روضـة الأخبـار"ی ئـەو

** نەوەی موحەممەد عەلی پاشاو فەرمانڕەوای میسر لە ١٨٦٣ — ١٨٧٩ز.

ساڵەدا چەندین جار ئاگاداریی بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی خۆی چاپکردو لە موسوڵمانان داوای کرد کتێبەکەی ئەو بخوێننەوە، چونکە پێشتر مەسیحییەکان ئەم فیکرەیان ناسیبوو، بە هەمان شێوە کتێبێکی تری بە ناوی (الدستور المعلم في أحوال سياسة بني آدم) بڵاوکرایەوە، کە نووسەری بەیرووتی ئەو کتێبە "إبراهيم يعقوب ثابت" لەو کتێبەدا وتبووی: "من خۆرهەڵاتییم، بەڵام فیکر و بیرکردنەوەم خۆرئاواییە"[٢٦]. ئەو راستی دەوت بەم دەستەواژەیە سروشتی ئەو سەردەمەی کە تیایدا دەژیا باس کرد.

٣ — لە قۆناغی سێیەمدا، هاونێوەرۆك و هاوشێوەو لە قاڵبدا بەو شێوەیە و بە هەمان زاراوەو چەمك و فیکر و بەشەکانی خۆیەوە بە تەواویی وەردەگێڕدرا. لە راستیدا ئەم قۆناغە نیشاندەری سستی لە پێشڤەچوون و شێوەی پێشکەوتنی فیکری سیاسییە لە ئیسلامدا. نوێنەری ئەم قۆناغە (سليم عبدالأحد)ە کە کتێبی "لیکوك"ی بە ناوی (مبادىء علم السياسة — سەرەتاکانی زانستی سیاسیی) وەرگێڕاو لە ساڵی ١٩١٥ز دا لە چاپخانەی (الهلال) چاپی کرد. دوای ئەوە گفتوگۆی مەعریفیی لە ئەدەبیاتی سیاسیی و شێوەی توێژینەوەو یەکەی جیاوازی توێژینەوە بە شێوەیەك گۆڕدرا کە جیاواز بێت لەگەڵ شێوەی ئیسلامیی پێشوودا.

لێکۆڵینەوەی ناوبراو کە باسی پێشکەوتنی هزری سیاسیی لە ئیسلامدا دەکرد لەم خاڵەدا دەوەستێت، چونکە پاش ئەو قۆناغە، قۆناغی هاوچەرخ دەست پێدەکات و ئێمە ئێستا لەم قۆناغەدا دەژین، هەروەها کتێبی "لیکوك"ی وەرگێڕدراوی "سليم عبدالأحد" نموونەی جێبەجێکاری ئەو کتێبانەیە کە هەتا ئەمڕۆ لەم بابەتەدا سوودیان لێوەردەگیرێت.

---

[26] ص ٨٨ من بحث المسألة الشرقية.

نووسینەکانی بیریارانی وەکو شێخ ڕەشید ڕەزا، شـێخ عـەلی عەبـدولڕازق و دکتۆر سەنهوریش چـونکە لـە قۆنـاغی سـستییدا هاتنـە کایـەو پـاش ئـەوە هێشتا قۆناغێکی تر دەسـتی پێنـەکردووە، ناتوانرێـت وەکـو کەلـەپوور لـە قەڵەم بدرێن.

---

# بەشی دووەم

# سەرچاوەکانی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی

# (راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ)

شـێوەی مامەڵـەی خوێندنـەوە هاوچـەرخەکان لەگـەڵ کەلـەپووری سیاسییدا، پاڵنەری تەواویان بۆ دەستەبەندیی سەرچاوەی کەلەپوور بەدیی هێناوە، لەسـەر بنـەما دەرکـەوتووەکان، چـوون پـسپۆڕیی لـە سەرچـاوەی زانستی سیاسـیی و توانـای سەرچـاوە لـە پێکەوەگرێـدانی تیـۆر و واقیـع و هەروەها لێکخشان لەگەڵ دیاردە سیاسـییەکاندا وەکـو ناونیـشانی کتێـب، کەلـەپووری سیاسـیی دەکرێتـە دوو بـەش لـە سەرچـاوە: بەشـێ کـە بـە شێوەیەکی راستەوخۆ ئەم دیاردەیەی توێژیوەتەوە و شێوازێکی فیکریی نە فیقهـی لـە سەرچـاوەکان نزیـك کەوتووەتـەوە، بەشـێکی تـریش کـە بـە شـێوەیەکی نێوەرۆکیانـە دیـاردەی سیاسـەتی خـستووەتە ژێـر بـاس. خوێندنەوەی پێشووتر نیشانیدا کە لێکۆڵینـەوەی توێـژەرانی هاوچـەرخ لـە فیکری سیاسیی ئیسلامیی بە شێوەیەکی بەرچاو زۆربەیان لەسـەر بناغـەی سەرچـاوەکانی بەشـی دووەم ئـەنجام دراون و هـەمان پاڵنـەر بوویـە هـۆی پێشکەشکردنی ئاوەها باسێك.

# باسی یەکەم

## سەرچاوە ناڕاستەوخۆکان، یان ناتایبەتمەندەکان

ئەو سەرچاوانەن کە لە بنچینەدا دیاردەی سیاسەتیان باس نەکردووە، بەڵکو لەگەڵ باسە فیقهیی، مێژوویی، فەلسەفیی، کەلامیی، زمانەوانیی و.. هتددا ئاماژەیان پێکردووە، باسکردنی سیاسەت لەو دەقانەدا ناپرۆگرامیانەیە و بەڵکو هەر ژماردنی کۆمەڵە رەگەزێکی سنووردارە، مامەڵە، شێوەی تێگەیشتنی گۆشەو کەناری سیاسەت، چۆنیەتی خوێندنەوەو توێژینەوەی دەقە ئاماژە پێکراوەکان، بە رەوشێکی تایبەت لە باسگەلی سەربەخۆدا لە لایەن پسپۆڕانی ئەم بوارانەوە پێویستە، ئەم سەرچاوانە بۆ خۆیان پێویستییان بە چەند دەستەو دابەشکردن هەیە:

١ – تەفسیرەکانی قورئان و لێکۆڵینەوەکانی فەرموودە:

قورئان و سوننەت لەوێدا کە بۆ هەموو زانستەکان سەرچاوەی راستەوخۆن و بۆ هەندێکیشیان تایبەتمەندیی و رێگەی تەواو دیاریی دەکەن، لەبەر ئەوە ئەمانە بە سەرچاوەی راستەوخۆی مەعریفیی دەژمێردرێن، بەڵام سەبارەت بەو زانستانەی کە لە چوارچێوەی پسپۆڕیی قورئان و فەرموودەدا نین، ئەم دوو سەرچاوەیە لە سەرچاوەکانی ژمارە دوو دەژمێردرێن و ناڕاستەوخۆ هەژمار دەکرێن، یا تەنها بۆ تێگەیشتن لە دەق و پێشکەوتنی ئەو تێگەیشتنە و پەیوەندیی واقیع پێیەوە یارمەتیدەرن. پاشان لەم رووەوە دیاریکردنی ئایەت و فەرموودەی پەیوەندیدار بە دیاردەی سیاسەتەوە، پێش هەر شتێ پێویستی بە خستنە بەر باسی مێژووی مامەڵەی ژیریی موسوڵمانانەوە هەیە لەگەڵ ئاوەها

دەقگەلێکـدا. بـۆ گەیـشتن بـە پێـشکەوتنی مێـژوویی مامەڵـەی ژیریـی موسوڵمانان لەگـەڵ دەقـەکانی قورئـان و سـوننەتدا، نـاکرێ تـەنها خۆمـان ببەستینەوە بە تێگەیشتنێکی تایبەتی توێژینەوەکانەوەو گومان ببـەین کـە ئاوەها توێژینەوەو راڤەیەکیش (هـەروەکو قورئـان و فـەرمووده) پـیرۆزن و جێگەی رێزن، بەڵکو بە دیدێکەوە کە بریتییە لە مرۆیـی بـوونی هەوڵـەکانی ئەوان و بۆ تێگەیشتن لە دەق لێیان نزیك دەبینەوە.

٢ — کتێبە فیقهییە گەورە و گچکەکان:

بە تایبەتی هەندێ سەرچاوە کە لەوانـدا چـەندین دەق گوێزراونەتـەوە، هەروەکو "رد المحتار علی الدر المختـار"ی ئیبنـو عابیـدین و "إحیـاء علـوم الدین" ئیمامی غەزالی بە هۆی بەشەکانی پێـشەوایەتیی (الإمامـة)، کـڕین و فرۆشـتن (بیـع)، دەرچـوون (الخـروج)، فـەرمان بـە چـاکەو پێـشگیریی لـە خراپەو.. هتد.

٣ — کتێبەکانی (أصول الفقه):

بـە تایبــەتی بەشـە جیاوازەکانیـان وەکـو چـاکەخوازیی (إستحـسان)، بەرژەوەندییــە نێردراوەکــان (المــصالح المرســلة)، بیانووبڕینــەکان (ســد الذرائع) و بەشەکانی ئامانجەکان (أبواب المقاصد) و پلـەکان (المراتـب) و.. هتد.

٤ — بەشەکانی پێشەوایەتی (الإمامة) لە سەرچاوەکانی زانستی کەلامدا:

ئەم بابەتە یەکێکە لە مەسەلەکانی جێگەی باس لەم زانستەدا کە لەسەر ئەو مشتومڕی زۆر روویداوەو کۆمەڵەو ئاینزای جیاواز بە هۆی ئەوەوە جوێ بوونەتەوە. لەوانەیە یەکێك لـە ناسـراوترین و بـەناوبانگترین سەرچـاوە لـەم

رووەوە کتـێبی "مقـالات الإسـلاميين واخـتلاف المـصلين"ی ئەبولحەسـەنی ئەشعەریی بێت.

٥ – وتـاری خەلیفـەکانی راشـیدین و ئـەو پەیماننامانـەی کـە داویانەتـە والیی و دەسەڵاتداران:

نامەی زانایانیش بۆ خەلیفەکان لە هەمان دەستەدا جێگەی دەبێتـەوە، هەروەکو نامەی پێشەوا مالیك بۆ هارونە رەشـید، یـان نامـەکانی سـەعیدی کوڕی موسەییب و سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەوانی تریش. قەلەقشەندی لـە ئینسکلۆپیدیا (دائرة المعارف)ی خۆیدا (صـبح الأعـشى في صـناعة الإنـشاء) زۆرێك لە پەیماننامەی خەلیفەکانی لە سەرەتای ئیسلامەوە هەتا سەردەمی خۆی کۆکردووەتەوە. نامەی پێشەوا عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب بـۆ مـالیکی ئەشـتەر نموونـەی بەرجەسـتەی ئاوەهـا دەقگەلێکـە.[٢٧] لـە پەیماننامـەی پێـــشەوا عـــەلی بـــۆ مـــالیکی ئەشـــتەر کەســـایەتیی فـــەرمانڕەوا و تایبەتمەندییـــەکانی، شـــێوازی هەڵبـــژاردن و دیـــاریکردنی فەرمانبـــەران و نووسەران، هەروەها پەیوەندیی ئەوان لەگـەڵ فـەرمانڕەوادا لـە لایـەك و لـە لایەکی تریش لەگەڵ خەڵکدا باس کراوە، هەروەها باسی هاوڕێیانی چاك یـا خراپ و کاریگەرییان بەسەر سیاسـەتی فـەرمانڕەواوە بـە جـوانی ئامـاژەی پێدراوە. پێشەوا عەلی گرنگییـدان بـە دادپـەروەریی و دوورنەکەوتنـەوە لـە خەڵکیی لە ئەرکەکانی فەرمانڕەوا لـە قەڵـەم داوە، چـونکە ئـەم مەسـەلەیە

[27] دەقی ئاماژە پێدراو لە لایەن پێشەوا (موحەممەد عەبدە)ەوە لە ژێر ناونیشانی "مقتبس الـسياسة و سياج الرياسة" و هەروەها لە لایەن تەوفیق ئەلفوکەیکی لە ژێر ناونیشانی "الراعي و الرعية: المثل الأعلى للحكم الديمقراطي في الإسلام، شرح عهد الإمام علي الى الأشتر النخعي حين ولاه مـصر" لـە چاپخانەی ئەسعەد لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦٢ ز چاپ کراوە.

متمانـه بـه جـەماوەر لـە فـەرمانڕەوا دانامالـێ. ئـەو لـە فـەرمانڕەوای داوا کردووه کـه بازرگانیی و پیشەسازیی گرنگیی پێبدات، زەوتکاریی (إحتکـار) ریشەکێش بکات و خەزێنه (بیت المال)ی دەوڵەت بە سامانی خەڵك (رعایـا) بزانێت و زیاتر کردنی سامانی خەڵك بە پەرەسـەندنی دەسـەڵاتی خەزێنـەی دەوڵەت بزانێت. پێشەوا عەلی جەختدەکاتـەوە کـە دابـین کردنـی ئاسـایش یەکێکه لە هۆکارە بنـچینەییەکانی ئـاوەدانی و چەسـپاویی دەسـەڵات. ئـەو گرنگیـی سـەربەخۆیی سیـستمی دادوەریـی و سروشـتیبوونی جیـاوازیی لـە بڕیـاری دادوەرانـی رەچـاو کـردووە و لـە کۆتاییـدا بـۆ هـەموو جـەماوەری کۆمەڵگەو چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا ئاماژەی داوە.

---

٦ – کتێبــە ئینــسکلۆپیدییەکان کــە باســی فیکــر و بابەتــە جــۆراو جۆرەکانیان کردووە:

هەروەکو (صبح الأعشی)ی قەلەقشەندی و نوسراوەکانی ئەبو حەییانی تەوحیـدیی و (الآداب الـشرعیة)ی ئیبنـو مـوفلح. لـە چـەندین بەشـی ئـەم کتێبانەدا، ئاماژە بە دیاردەی سیاسەت کراوە، بـۆ نموونـە: ئیبنـو مـوفلیح چەند بەشێك لە کتێبەکەی تەرخان کردووە بـۆ راوێـژ (الـشوری)، بەڵێنـدان (البیعة)، دادپەروەریی، پێشەوایەتیی (الإمامة)، فەرمان بە چـاکە و رێگریـی لە خراپە، (ئیبنو عوقەیل)یش بیرکردنەوەو رامان (تأمل)ی خۆی سـەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێـوان شـەریعەت و سیاسـەت لـە کتێبەکەیدا (الفنـون) نووسیوە.

٧ – سەرچاوە مێژووییەکان:

ئـەم سەرچـاوانە لەسـەر بنـەمای شـێوەی باسـكردن لـە مەسـەلەی سیاسەت، دەكرێن بە چوار دەستەوە:

١ – مێژووە گشتییەكان كە باسی مێژووی ئیسلام لە ماوەی سەدەكانی رابردوودا باس دەكات. ئەو سەرچاوانە هەروەكو مێژووی تەبەریی، (البداية و النهاية)ی (إبن كثير) و (الكامل)ی (إبن الأثير)، بۆ تۆمار كـردن و بـە دوادا چـوون و پێـشكەوتنی ئۆرگـان و دامـەزراوە دەوڵەتییـەكان و گۆڕانكـاریی و پەیوەندییەكانی بەسوودن.

٢ – مێژووی سیاسیی دەوڵەتان، كە تەنها باس لـە كارنامـەی سیاسـیی دەكەن، هەروەكو كتێبی (الإمامة و السياسة)ی (إبن قتيبة)، (تاريخ الخلفـاء و المـلوك)ی (سيوطي)، (خلاصة الذهب المسبوك، مختـصر سـير الملـوك)ی (عبدالرحمن الأربيلي)، (تاريخ الدول الإسلامية بالجـداول المرضـية)ی (زيـني دحلان)، (رقم الحلل في نظم الـدول)ی (إبـن الخطيـب) و (المـن بالإمامـة علـى المستضعفين بأن جعلهم الله أئمة و جعلهم الوارثين)ی (إبن صاحب الصلاة).

٣ – مێـژووی سیـستمی سیاسـی و فـەرمانڕەوایان. كـە تایبـەتن بـە دەوڵـەتێ، یـان سـەردەمێكی سیاسـیی، یـان حـوكمڕانێكی دیـارییكراو، هەروەكو: (التحفة الملوكية في الدولة التركية)، (الروضتين في أخبار الـدولتين) (مێژووی نورەددین مەحموود و سەلاحەددینی ئـەییوبی))، (تـأريخ عمـر بـن الخطاب لإبـن الجـوزي، (سـيرة الملـك الظـاهر) یـا (سـيرة صـلاح الـدين) كـە نوسراوی (إبن شداد)ە.

٤ – مێـژووی ئۆرگـان و دامـەزراوەكان بـە تایبـەتی وەزارەت. لێـرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بەوە كە ئەم دامەزراوە وەكو گرنگترین دامـەزراوەی سیاسـیی و مێـژووی موسـوڵمانان دوو جـۆر سەرچـاوەی هەیـە، جـۆر و

دەستەی یەکەم، ئەو سەرچاوانەی کە دەستیان کردووەتە تیۆردانان و باسیان لە سروشت و جۆر و کارکردن و پەیوەندیی نێوان دامەزراوەکان لەگەڵ فەرمانڕەواو خەڵکیی کردووە. ئەم دەستە سەرچاوەیە بە سەرچاوەی راستەوخۆی کەلەپووری سیاسیی دەژمێردرێن. دەستەو جۆرەکەی تر لە سەرچاوە باسیان لە پێشکەوتنی ئەم دامەزراوە یان مێژووی وەزیرانیان باسکردووە، جا لێرەوە زیاتر لەوەی کە سیاسیی بن مێژوویین، ئەمانە دەچنە ژێر خانەی سەرچاوە ناڕاستەخۆکانەوە. گرنگترینی ئەو کتێبانەی کە لە بارەی وەزارەتەوە نوسراون بریتین لە: (أخبار الكتاب)ی (داود بن الجراح) كە لە سەدەی سێیەمی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە. (الوزراء) نووسینی (محمد بن داود بن الجراح) کە لە ساڵی (٢٩٦ ك) کۆچی دوایی کردووە. (الوزراء) نوسراوی (نفطورية إبراهيم بن محمد) کۆچکردووی ٣٢٣ ك، (الوزراء والكتاب) نوسراوی جەهشیاری (کۆچکردوو لە ٣٣١ ك)، (كتاب الوزراء) نووسراوی (محمد بن يحيى الصولي) کۆچکردووی ٣٣٥ ك، (مباسطة الوزراء) نوسراوی (إبن خلاد الرامهرمزي) کۆچکردووی ٣٦٠ ك، (أخبار الوزراء) نوسراوی (صاحب بن عباد) کۆچکردووی ٣٨٥ ك، (تحفة الأمراء من تأريخ الوزراء) نوسراوی (هلال بن حسن الصابي) کۆچکردووی ٤٤٨ ك، (الوزراء) نوسراوی (إبن ماكولا) کۆچکردووی ٤٨٥ ك، (الإشارة الى من نال الوزارة) نوسراوی (إبن الصيرفي)، (أخبار الوزراء) نوسراوی (محمد بن عبدالملك الهمداني) کۆچکردووی ٥٢١ ك، (أخبار الوزراء) نوسراوی (إبراهيم بن موسى الواسطي)، (تحفة الوزراء و بهجة النعماء) نووسراوی (محمد بن إبراهيم الأدرنهوي) کۆچکردووی ١١٣٦ ك، (النكت العصرية في أخبار الوزراء

المصرية) نوسراوی (عمارة اليمني) کۆچکردووی ٥٦٩ ك، (الوزراء) نوسراوی (خليل بن حسن)، (الوزراء) نوسراوی (محمد أقليدي) کۆچکردووی ٧٠٥ ك، (الوزراء) نوسراوی (علي بن فتح) ناسراو به (المطوّق)، (الوزراء) نوسراوی (أبي عبدالله محمد بن أحمد الفارسي)، (تحفة الوزراء) نوسراوی (أبي القاسم البلخي)، (غرر الخصائص الواضحة و عرر النقائص الفاضحة) نوسراوی (يحيى بن وطواط) و زۆر سەرچاوەی تریش.

٨ – ئەدەبیاتی جەماوەریی یا میژوونووسینی میللیی، زانایان و چاکخوازان:

ئەم سەرچاوانە لەوێدا کە باسی کۆمەڵگەو جەماوەری خەڵك یا زانایان دەکەن، مەعریفەی ئێمە سەبارەت بە هەردوو لایەنی پەیوەندیی سیاسیی واتە فەرمانڕەواو فەرمانبەردار تەواو دەکات و دەبنە ڕێگر لەوەی توێژەر تەنها بۆ مێژووە سیاسییەکان بگەڕێتەوە، چونکە مێژووە سیاسییەکان زیاتر لەسەر قووچەك (هرم)ی کۆمەڵگە راوەستاون هەتا بنکە جەماوەرییەکەیان.

٩ – کتێبەکانی پێناسە و فەرهەنگەکانی زمان:

ئەم سەرچاوانە بۆ تێگەیشتنی مانـاو چەمکەکانی دەستەواژەی سیاسیی لە گرنگترین سەرچاوە دەژمێردرێن، بەم هۆیەوە بە بێ ئەوەی چەمکی نوێی لەسەر بار بکەین، دەتوانین باسە سیاسیی و کەلەپوورییەکان بەبێ هـۆ و لە زمانی خۆیەوە وەربگرین. سوودوەرگرتن لە سەرچاوە پێویستەکان لە تەواوی قۆناغەکانی مامەڵە لەگەڵ فیکردا، پێویستە بۆ ئەوەی زەین بە هەڵەدا نەچێ و لەبارکردنی چەمکە نوێیەکان بۆ زاراوە کەلەپوورییەکان پێشگیریی بکرێت. بۆ نموونە گرنگترین سەرچاوە لەم

بارەیەوە بریتین لە: (تعريفات العلوم) نوسراوی (ملا أحمد الشرواني) کۆچکردووی ١٠٣٦ ک – ١٦٢٦ ز.[٢٨] (كشف إصطلاحات الفنون) نوسراوی (تهانوي)، (أبجد العلوم) نوسراوی (حسن صديق خان)، (التعريفات) نوسراوی (الجرجاني)، (أساس البلاغة) نوسراوی (الزمخشري)، (الفروق في اللغة) نوسراوی (أبي هلال العسكري)، (المفردات) نوسراوی (الأصفهاني)، (مفاتيح العلوم) نوسراوی (الخوارزمي)، (الفروق و منع الترادف) نوسراوی (الحكيم الترمذي) و سەرچاوەی زۆر زیاتری دیکەش.

بە گومانی نووسەر، ئەم سەرچاوە باسکراوانە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، باسیان لە دیاردەی سیاسەت کردووە، لێرەدا جەخت لەسەر ئەم خاڵە زۆر پێویستە کە پۆلێنکردنی سەرچاوەکان بۆ دوو دەستە کە باسی سیاسیی و پسپۆڕانەیان تێدایە، بە مانای گرنگیی و پێشخستنی دەستەی یەکەم یا دووەم نییە، بەڵکو بەم شێوەیە ئەو سەرچاوانەی کە باسی دیاردەی سیاسەتیان کردووە لە سەرچاوەکانی تر جیا کراونەتەوە.

---

[28] دەستنووسێکی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی نیشتمانیی تونسدا: چەند بەشێکی پەیوەندیدار بە پێناسەی زانستی سیاسەت لە گۆڤاری (الفكر العربي) بیروت، ژمارە ٢٣، نۆڤەمبەرو ئۆکتۆبەری ١٩٨١ ز چاپ کراوە.

# باسی دووەم

## سەرچاوە راستەوخۆکان، یان سەرچاوە تایبەتمەندەکان

هەر توێژینەوەیەك لە فیکری سیاسیی ئیسلامدا، یا هەر مەسەلەیەك لە مەسەلەکانی، ناچار دەبێ پشت بە سەرچاوەی پسپۆڕیانەی ئەو بابەتە ببەستێت، لەوێوە کە سەرچاوە پێشکەشکراوەکان لەم بەشەدا لەسەر بناغەی رەوشی باسکراو لە سەرەتای کتێبەکەوە کۆکراونەتەوە، ناتوانرێ ئەوە بە هەموو سەرچاوەکانی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی بژمێردرێ، چونکە هەموو پێڕستەکان (فهارس) مان دەست نەکەوتووە و لە چەند کتێبخانەیەکی سنوورداردا بۆ ناساندنی کتێبە دەسنووسەکان بەهرەمەند بووین. پێش ناساندنی سەرچاوە دۆزراوەکان دەبێ ئاماژە بە رەوشی پۆلێن و شێوەی خستنە بەر باسی بکرێت.

١ — رێکخستنی سەرچاوەکان لەسەر بنەمای رێکخستنی مێژوویی بە لەبەرچاوگرتنی کاتی کۆچی دوایی نووسەر، یا مێژووی نووسینی کتێبەکە ئەگەر خاوەنەکەی نادیار بوو. ئەو سەرچاوانەی کە مێژووی نووسین یا مێژووی مردنی نووسەریان نادیار بووە، لە کۆتایی کتێبەکەدا دانراون، هەرچەندە بە خستنە بەرباسی ئەو کتێبانە، گەڕانەوەی ئەوانە بۆ قۆناغێکی مێژوویی تایبەت دەربکەوێت.

٢ — لە سەرەتای ناودا، کورتەیەك لە راڤەی ژیان، گرنگیدانە زانستیی و لێوەشاوەییەکانی نووسەرو پاشان ناوی کتێبەکانی ئەو بە شێوەیەکی سەربەخۆ باس کراوە.

٣ – نووسەر بە هەموو ناوو نازناوەکانییەوە باسدەکرێت، هەتا نووسینی مێژووی ئەو لە لای تەواوی توێژەران ئاسان ببێت، چونکە نووسەرانی ژیانی ناوداران رەوشی جۆراو جۆریان گرتووەتە بەر، هەندێ لەسەر بنەمای ناو و ناوی باوك و مێژووی مردن و هەندێ لەسەر بنەمای نازناو و مێژووی مردن، نووسەرانیان پۆلێن و ریزبەندیی کردووە، لەم رووەوە ناو و نازناوی نووسەر بە شێوەی تەواو لەگەڵ مێژووی مردنی ئەواندا تۆمار کراوە.

٤ – تایبەتمەندییەکانی سەرچاوە وەکو نۆرەی چاپ و شوێنەکەی بۆ کتێبە چاپکراوەکان و ژمارەو شوێنی پاراستن بۆ نوسخە دەسنووسەکان، هاورێ لەگەڵ هەر سەرچاوەیەکدا پێشکەش کراوە. بۆ ئەو سەرچاوانەی کە شوێنی پاراستنی ئەوان بۆ ئەم توێژینەوەیە رۆشن نەبووەتەوە، بە ئاماژەی نووسەرانی وەکو ئیبنو نەدیم، حاجی خەلیفە و بەغدادیی لەم نووسراوانە باسمان کردووەو بەس.

٥ – لە سەرچاوە ناسێندراوەکان، ١٠٥ سەرچاوە (بەرانبەر بە ٣٤,٥ ٪) چاپ کراون و ١٢٧ سەرچاوە (بەرانبەر بە ٤١,٥ ٪) نوسخەی دەستنووسن کە شوێنی هەڵگرتنی ئەوانە دیارە. ٧٥ کتێب ماونەتەوە لە ٣٠٧ سەرچاوە، کە بەرانبەرە بە ٢٤ ٪ی سەرچاوە باسکراوەکان، باوەکو لەناو نەچوون، بەڵام بە هۆی ئەوەی دەستم رانەگەشتە تەواویی نوسخەکانی جیهان و تەنها چەند کتێبخانەیەکم بۆ پشکنرا، نەمتوانی شوێنی پاراستنی ئەوانە دیاریی بکەم.

٦ – کاتی ناساندنی نووسەران، چوونەوە سەر هەر چەمکێکی زانستیی و پلەیەکی بەرزیی ئەوان لە مێژووی موسوڵماناندا لەبەرچاو گیراوە،

هــەروەکو (نحــوي)، (أصــولي)، ئاشــنا لەگــەڵ فیقهــدا، نووســەر، وەزیــر، ئەمیندار (صاحب الـسر) و هـەروەها سـەر بـە ئـاینزا (مـذهب) بـوون وەکـو شافیعیی، حەنبەلیی، زەیدیی، ئیمامیی، موعتەزیلیی، ئەشعەریی، زاهیریـی (ظاهري) و.. هتد ئاماژەی پێدراوە.

٧ – تێبینیــی دەکرێــت کــە سەرچــاوە کۆکراوەکــان، تــەواوی قۆناغــە مێژووییــەکان و ســەرزەوییەکان و ئــاینزا ئیــسلامییەکان پۆشــش دەدەن و باس دەکەن. لەم رووەوە نوێنەرانی تـەواوی بەشـەکانی مێـژووی ئیـسلام و ســەرزەوییە جیاوازەکــانی ئیــسلامیی و گــرووپ و ئــاینزا ئیــسلامییەکانی بوونیان هەیە.

ئەو سەرچاوانەی کە نووسەر و مێژووی نووسینیان دیارە:

١ن– (عبدالحمید الکاتب) کۆچکردووی ١٣٢ کۆچی / ٧٥٠ زاینی.

عەبدولحەمید کوڕی یـەحیا کـوڕی سـەعدی عـامیریی ناسـراو بـە کاتـب (واتە: نوسەر) باپیری سەر بە (موالی) عەلائولعامری بـوو، بۆیـە پاڵدراوەتـە لای بــەنی عــامر، بنــەڕەتیان لــە قیــساریەی فەلەســتین بــووە و لــە شــام نیـشتەجێ بـوون و لـە نزیکـەکانی مـەروانی کـوڕی موحەممـەد بـوو – دوا پادشـای بـەنی ئومەیـە لـە رۆژهـەلات – لەگـەڵ مەروانـدا لـە سـاڵی ١٣٢ ی کۆچیدا بەدەستی عەباسییەکان کوژرا.[٢٩]

١ ک– نامەیەك بۆ ئامۆژگاریی جێنشین (رسالة في نصیحة ولي العهد).[٣٠]

---

[29] (الاعلام- الزرکلي) ب٣، ل٢٨٩- ٢٩٠.

[30] (عبدالرزاق الحصان) لە کتێبی (نظرة عابرة في شمال العراق) بەغداد:١٩٤٠ز ل ١٠٤ – ١٣٤.

٢ ك– ئامۆژگـاریی نووسـەران[٣١]، ئـەوەش کـە پێویـستە لەسـەریان کـە خاوەنی ئەخلاق و ئەدەب بن (نصیحة الکتاب وما یلزم أن یکونـوا علیـه مـن الأخلاق و الآداب)[٣٢].

٢ ن– (عبدالله ابن المقفع) (١٠٩ – ١٤٥ کۆچی / ٧٢٧ – ٧٦٢ ز).

نووسەر و شاعیر و وەرگێڕ بووە لە فارسییەوە بۆ عەرەبی، لە بنەڕەتدا فارس بووەو لە بەسرە پێگەیشت، کاری نووسەری دیوانی بەڕێوە دەبرد بۆ مەنسوری عەباسیی، تۆمەتبار کرا بە بێباوەڕیی (الزندقـة) و لـە بەسـرە لـە لایەن پێشەوای ئەو شارەوە (شعبان بن معاویة المهلبي)ـەوە کوژرا[٣٣].

---

٣ ك– تاکـە مرواریـی و گەوهـەری گرانبـەها (الـدرة الیتیمـة والجـوهرة الثمینة)[٣٤].

تیایدا بە وردیی و چڕیی، باسی ڕۆڵی زانایان و بە تایبـەتی ئـەهلی ئـاین (اهل الدین) و پیاوەتی (المرؤة) لە سیـستمی سیاسـییدا دەکـات، هـەروەها چۆن پێویستە لەسەر فەرمانڕەوا هەوڵ بدات بـۆ دەستخـستنی شـەرعییەت لێیان، جا ئەگەر لەسەر ئاستی وڵات بێت یا هەرێم یـان گونـدو لادێ، ئینجـا پادشا دابەشدەکات بۆ سێ جۆر: پاشای ئایین، پاشای ئامادەو بە ئـیرادەو هیممـەت، پاشـای ئـارەزوو و هـەوەس، هـەر ئـەو دابەشـکردنەیە کـە

---

[31] نووسەران کۆی نووسەرە و بەو کەسە دەوترێت کە بەرپرسە لە دیوانی نووسین (وەزارەتی دەرەوە) یا دیوانی دارایی.

[32] (إیضاح المکنون، البغدادي) ب٢، ل ٦٥٤.

[33] (معجم المؤلفین، رضا کحالة) ب٦، ل ١٥٦.

[34] موحەممەد کورد عەلی لێی کۆڵیووەتەوەو بڵاوی کردووەتەوە، قـاهیرە ١٩٤٥ ز، هـەروەها ئەحمـەد ڕەفعەت بەدراوی توێژیویەتیەوە، بەیروت – (دار النجاح ب.ت)، لەگەڵ پێشەکیی شەکیب ئەرسەلان، بە ٥٥ لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە.

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئیبنو خەلدون زیاتر گرنگیی پێدا و پێشی خست، ئینجا باسی دەسەڵاتداران و ڕۆڵیان لە بەسەر کردنەوەی ڕەعیەتدا دەکات، کە نابێ لەسەر بنەمای گومان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، پێویستیی دڵنیابوون پێش دەرکردنی فەرمان و بڕیارەکان.

٤ ک– نامەی هاوەڵان (رسالة الصحابة)[٣٥].

نامەی هاوەڵان، کە ئیبنو موقەففەع لەسەر داوای عیسای کوڕی عەلی و سولەیمانی برای (والی بەسرە) ئەم نامەیەی نووسی و ئاڕاستەی مەنسوری عەباسیی کرد و مەبەستی بڵاوکردنەوەشی نەبووە، باسەکەی بە چواردەوری ئەو خاڵەدا دەسوڕێتەوە کە سوپا نابێ دەست وەربداتە کاروباری مەدەنیی و پێویستە تەنها ئەرکی سەربازیی لەسەر شان بێت، نابێ سوودی لێ وەرگیرێت بۆ وەرگرتنی دارایی و باج، چونکە دەبێ مامەڵە لەگەڵ ڕەعیەتدا لەسەر بناغەی دادپەروەریی بێت و مافەکانی پارێزگاریی بکرێت، ئینجا باسی هەڵبژاردنی (فەرمانبەرانی) چواردەوری و مەرجەکانیان دەکات کە پێویستە دەسەڵاتدار چۆن چاودێریی دەست و پێوەندی بکات، تا دەگاتە والی (فەرماندار) و فەرمانبەران.

---

٣ ن– (محمد الأحول) (شيطان الطاق)، لە ١٤٨ ک – ٧٦٥ ز لە ژیاندا بووە. موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی نوعمان کوڕی ئەبی تەریفە (طريفة)ی بەجەلی فێڵزان، کوفیی و سەڕاف (الصيرفى) و نازناو کراو بە شەیتانی

---

[35] دکتۆر (حسن صعب) لە کتێبەکەیدا: (علم السياسة)، بەیروت، دار العلم للملايين ١٩٧٧ز، هەروەها لە نامەی ڕەوانبێژان (رسائل البلغاء) دا بڵاوکراوەتەوە، هەڵبژاردن و پۆلێنی موحەممەد کورد عەلی، قاهیرە: لیژنەی نووسین و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە (١٩٥٤ ز).

((تـاق تاقەکـەریّ))، قـسەزان بـووە و هـاوەڵێتی ئیمـام جەعفـەری سـادقی کردووە[٣٦].

٥ ك– الامامة (پێشەوایەتی)[٣٧].

٦ ك– بەرپەرچدانەوەی موعتەزیلە لە پپشەوایەتیی چاکتردا (الـرد علـى المعتزلة في إمامة المفضول)[٣٨].

٤ ن– (أبو يوسف) (١١٣– ١٨٢ ك / ٧٣١ – ٧٩٨ ز).

یـەعقوبی کـوڕی ئیـبراهیم کـوڕی حـەبیبی ئەنـساریی، ئـەبو یوسـف، زانایەکی فەقیهوو بنەڕەتزان (اصولی)، موجتەهید، قورئان لەبەر و پارێزەر، فەرموودەزان، زانا بە توێژینەوەی قورئان و جەنگەکان و مێـژووی عـەرەب، موحەممەدی کـوڕی حەسـەنی شـەیبانی نوسـەری کتـێبی "الـسير الكـبير و الصغير" لێی گێڕاوەتەوە کە بە یەکـەم نووسـەر دادەنرێـت لـە پەیوەنـدیی نێودەوڵەتیی ئیسلامییدا، هەروەها ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل ریوایـەتی لێ گێڕاوەتـەوە، هـاوەڵی پێـشەوا ئـەبو حەنیفـە بـووە، هـەروەها لـە مـاوەی تەمەنی سێ خەلیفەی عەباسیی (مەهدی و هادی و هارونە رەشید)دا قـازیی گەورەی بەغدا بووە و بە گەورەی دادوەران (قاضـي القـضاة) ناسـراوە، لـە بەغدا کۆچی دوایی کردووە[٣٩].

٧ ك– کتێبی خەراج (کتاب الخراج)[٤٠].

---

36 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب١١، ل٦٧-٦٨.

37 (الفهرست، إبن النديم) ل ٢٥٠، (هدية العارفين، البغدادي) ب٢، ل ٨.

38 (الفهرست، إبن النديم) ل ٢٥٠، (هدية العارفين، البغدادي) ب٢، ل ٨.

39 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب١٣، ل ٢٤٠.

40 لە قاهیرە چاپکراوە، (المطبعة السلفية) ١٣٥٣هـ، کە ٢١٧ لاپەڕەیە، "عبدالعزيز محمد الـرجبي" ئامادەی کردووە کە لە ١١٨٤ ك / ١٧٧٠ ز کۆچی دوایی کـردووە، پـاش توێژینـەوەی نـاوی: "فقـە

ئەم کتێبە لەسەر داوای پێشتری هارونە رەشید پێشکەشی کرا، هەر بۆیە نووسەر بە ئامۆژگارییەکی گشتگیرانەی میری باوەڕداران دەستی پێدەکات کە تەواوی کاروباری ژیانی ئامـاژە پێدەدات، لەوانە بەهاکانی دادپەروەریی و راوێژ (الشوری)، هەروەها کارکردن لەسەر بەرژەوەندیی بەندەکانی خوا، هەروەها چۆنییەتی رەفتار لەگەڵ خەڵکانی تایبەت و سەرجەمی خەڵکیدا، پاشان لە چەند بەشێکدا باسی سەرچاوەکانی دارایی دەوڵەتی کردووە کە کورت دەبێتەوە لە باج (الخراج) و دەسکەوتی بێ جەنگ (الفيء) و زیندووکردنەوەی زەویی مردوو دەسکەوتی جەنگ (غنائم) و مامەڵە ئابوورییەکانی تریش کە پەیوەندیدارن بە دەوڵەت و خەرجییەکانییەوە. پاشان باسی پارێزراوان (ذمي)ی ئاینەکانی تر دەکات لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامییدا و پاشان باسی پاراستنی یاساو سیستمی یاسایی دەکات لە بەرانبەر لە یاسا دەرچوان لەوانە تاوانکاران و دزو یاخیبوان و شەڕخوازان.

٥ ن– (هشام بن الحكم) کۆچکردووی ١٩٩ ك / ٨١٥ ز.

هیشامی کوڕی حەکەمی سەر بە (هۆزی) شەیبانی، کوفیە، شیعەیە، قسەزانە، گفتوگۆکارە، لە کوفە لە دایك بووە لە "واسط" پێگەیشتووەو لە بەغدا نیشتەجێ بووە، لە هەموان بچڕاوە بۆ یەحیای کوڕی خالیدی بەرمەکی و لە کوفەدا مردووە[41].

---

الملوك و مفتاح الرتاج، شرح كتاب الخراج"، هەروەها ئەحمەد کوبەیسی توێژیویەتیەوە و لە بەغدا لە دیوانی ئەوقاف لە ١٩٧٣ز دا بڵاوی کردووەتەوە.

41 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب١٣، ل١٤٨.

٨ ك– راجیایی خەڵكی لە پێشەوایەتییدا (إختلاف الناس في الإمامة)[٤٢].

٩ ك– تەگبیری پێشەوایەتیی (التدبیر في الإمامة)[٤٣].

٦ ن– (یحیی بن آدم القرشي) كۆچكردووی ٢٠٣ ك / ٨١٨ ز.

قورئانخوێن، فەرموودەناس، قورئانلەبەر بوو، فەقیه بووه و لە "فم الصلح" لە عێراق كۆچی دوایی كردووه[٤٤].

١٠ ك– خەڕاج (الخراج)[٤٥].

تیایدا لایەنە جیاوازەكانی سیاسەتی ئابووریی دەوڵەت لە دوو لایەنی داهات و خەرجییەوە باس دەكات، لە بەشی یەكەمدا باسی دەستكەوت (الفيء) و دەسكەوتی جەنگ (الغنیمة) و زەوی و باج و دە یەكەكان (العشور) دەكات، بەڵام لە بەشی دووەمدا باسی دابەشكردنی دەسكەوت (الفيء) و باری ئەهلی (ذمة) و چاكسازیی زەوی پشتگوێ خراو دەكات. بەڵام لە سێیەمدا دووبارە جەخت لەسەر ئەهلی "ذمة" دەكاتەوەو تیشك دەخاتە سەر گرنگیی رێزلێگرتنیان و چاك مامەڵە لەگەڵ كردنیان. پاش ئەوەش باسی زەوتكاریی (الإحتكار) و مافی ئاو و چۆنیەتی دابەشكردنی دەكات جا داخوا ئاوەكە هی كانیی بێت یا رووبار. لە بەشی چوارەمیشدا تیشك دەخاتە سەر زەكات.

٧ن – (طاهر الخزاعي) كۆچكردووی ساڵی ٢٠٧ ك / ٨٢٢ ز.

---

42 (ایضاح المكنون، البغدادي) ب١، ل٤٨، (هدیة العارفین، البغدادي) ب٢، ل٥٠٧.

43 (هدیة العارفین، البغدادي) ب٢، ل ٥٠٧.

44 (معجم المؤلفین، رضا كحالة ج) ب٣، ل١٨٥ – ١٨٦.

45 جۆینبۆل بڵاوی كردووەتەوە، لایدن، هۆڵەندا: ١٨٩٦ز، هەروەها دكتۆر حوسەین مونس پشكنینی بۆ كردووە، قاهیرە (دار الشروق) چاپی یەكەم ١٩٨٧ز، لە ١٣٤ لاپەڕەدا بڵاو كراوەتەوە.

تاهیر کوڕی حوسەین کوڕی موسعەبی خوزاعی، وەزارەتی بەدەست هێناوە[٤٦].

١١ ك – راسپاردەی رەوشتی دینیی و سیاسەتی شەرعی (الوصية في الاداب الدينية والسياسة الشرعية)[٤٧].

٨ ن –(سهل بن هارون) کۆچکردووی ساڵی ٢١٥ ك / ٨٣٠ ز.

ناوبراو لە "دەشت میسان" لە بنەچەیەکی فارسی لە دایك بووە، پەیوەندی کرد بە خەلیفە مەئمونی عەباسییەوە و ئەویش کردییە بەرپرسی خەزێنەی حیکمەت (دار الكتب)، ئەو وێژەوان، نووسەر، شاعیر و حەکیم بوو[٤٨].

١٢ ك –تەگبیری وڵات و سیاسەت (تدبير الملك و السياسة)[٤٩].

٩ ن – (عبدالملك الاصمعي) ١٢٢ – ٢١٦ ك / ٧٤٠ – ٨٣١ ز.

عەبدولمەلیکی کوڕی قەریبی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی عەلی کوڕی ئەسمەعی باهیلی ناسراو بە "الأصمعي"یە، وێژەوان، زمانەوان، نەحوی، هەواڵزان، فەرموودەناس، فەقیهو شەرعزان، ئوسوڵیی و خەڵکی بەسرەیە[٥٠].

---

46 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب٥، ل٣٥.

47 (ايضاح المكنون، البغدادي) ب٢، ل٧١١.

48 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب٤، ل٢٨٦.

49 (الفهرست، إبن النديم)، (البيان و التبيين للجاحظ)، بگەڕێرەوە بۆ کارل بروکلمان، سەرچاوەی پێشوو، ب٣، ل ٣٤ – ٣٥.

50 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب٦، ل١٨٧.

**١٣ ك – راستكردنەوەی سیاسەتی پاشایی و رەوشتی هەڵبژێردراو (تقويم السياسة الملوكية و الأخلاق الإختيارية)[٥١].**

**١٤ ك – كتێبی خەراج (كتاب الخراج)[٥٢].**

**١٠ن–(القاسم العجلي) كۆچكردووی ٢٢ / ٨٤١ ز.**

**قاسم كوڕی عیسا كوڕی ئیدریس ئەلعجلی، یەكێ لە سەركردەكانی مەئمون و دوای ئەویش موعتەسەم بیللا بووە[٥٣] ناسراو بە ئەبی دلف دامەزرێنەری دەوڵەتێك بووە لە وڵاتی كوردەكان و پایتەختەكەی كەرەج بوو ٢١٠ – ٢٨٥ ك / ٨٢٥ – ٨٩٨ ز[٥٤].**

---

**١٥ ك– سیاسەتی پاشاكان (سياسة الملوك)[٥٥].**

**١١ ن– (شهاب الدين بن أبي الربيع) كۆچكردووی ٢٢٧ ك / ٨٤٢ ز.**

**لە كەسانی خاوەن سیاسەت و حیكمەت بووە[٥٦].**

---

51 دەسنووسێكە لە ئیستانبوڵ، كتێبخانەی ئەحمەدی سێیەم، ژمارە ١١١٦ (٨٧) لاپەڕە، هەروەها كتێبخانەی نوری عوسمانیی ژمارە ٢٥٩٨ /١ (١٠١ لاپەڕە) زانكۆی ئەمەریكیی بەیروت (Mic-A-316).

52 (هدية العارفين، البغدادي) ب١، ل٦٢٣، (اعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب٦، ل١٨٧.

53 (معجم المؤلفين، رضا كحالة ج) ب٨، ل١٠٩.

54 حسن مؤنس، (اطلس تأريخ الاسلام) ل٢٣٢.

55 (ايضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل٣٢، (الفهرست، ابن النديم) ل ١٦٩، (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل ٨٢٥، دە ستنوسێ هەیە بە هەمان ناونیشان بەڵام بەبێ ناوی نووسەر لە یانەی كتێبی میسریی ١٣٨٦ تصوف طلعت (٨٧ لاپەڕەیە)، ١٧٦١ أدب (٤٤ق) لە وانەیە ئەم پەڕتووكە ئەوبێ چونكە هیچ پەڕتووكێكی تر نییە كە بەو ناوە بكات و بە هەمان ناونیشان نوسرابێ.

56 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢ ل ١٠١ – ١٠٢.

١٦ ك– رەفتار دەسەڵاتدار لە تەگبیری وڵاتاندا (سلوك المالك في تدبير الممالك)[٥٧].

ئەم کتێبە پێشکەش کراوە بە خەلیفە موعتەسەمی عەبباسیی، نووسەرەکەی بە شێوەیەکی خشتەیی و پەلوپۆدار ئامادەی کردووە، کردوویەتی بە چوار بەندەوە، یەکەمیان باس لە فەلسەفەی بوون وپێویستییەکانی دەکات، کە دەبێت بەدیهێنەرێك بۆ ئەم گەردوونە هەبێت کە یاساو ڕێسای بۆ دانابێت و پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێ بێت)یش هەبن و پێویستە مرۆڤەکانیش جێگە و پێگەیەکی دیاری کراویان هە بێت لەم گەردوونەدا، هەروەها دەبێت فەرمانڕەوا هەبن کە بە سیاسەتکردنیان خەڵکی ڕێك بخەن و بەرژەوەندییان بپارێزن. بەندی دووەمیش باسی حوکمەکانی ڕەوشت (أخلاق) و بەشەکانی و مرۆڤ و گیاندارانیشی بە فیکر و ڕەوشت و پلەوپایەی سیاسیی جیاکردووەتەوە. ئینجا باسی جۆرەکانی مرۆڤ دەکات کە چۆن بوونەتە سێ بەش، ناوەندو چەماوە لێی و چەماوە بۆی. ئەو ناوەندیان بە چاکترینیان دەبینێ و ئینجا چاکەکاری مرۆڤی کامڵ دیاریی دەکات کە بریتییە لە هەبوونی حیکمەت و پاکداوێنیی و ئازایەتیی و دادپەروەریی. لە بەندی سێیەمیشدا جۆرەکانی گەشتی ژیانی ژیریی (عقلی) کە پێویستە لەسەر مرۆڤ شوێنی بکەوێت و کاری پێ بکات، ماهیەتی مرۆڤیش دیاریی بکات و ڕۆڵی وەکو جێنشینی خوا لەسەر زەویدا و

---

[57] مامۆستای دکتۆر حامید عەبدوڵڵا ڕەبیع لێی کۆڵیوەتەوەو توێژینەوەیەکی سەرکەوتووی لەسەر ئامادە کردووە، قاهیرە (دار الشعب) ١٩٨٣ ز – هەروەها دکتۆر ناجی تکریتی لێی کۆڵیوەتەوە و لە بەغدا بڵاوی کردووەتەوە، (دار الشؤن الثقافية العامة) ١٩٨٧ ز، هەروەها پێشتریش بەبێ توێژینەوە لە قاهیرە (ساڵی ١٢٨٦ ك) چاپ کراوە.

ئەوەش ئەوە بەسەریدا فەرزی دەکات. ئینجا رەفتاری سیاسیی مرۆڤ کە دەبێتە هۆی ئاوەدانکردنەوە بە هۆی هاریکاریی یەکترەوە. لە بەندی چوارەمیشدا سیاسەتەکان دابەش دەکات و جۆرەکانی دیاریی دەکات و هۆکارەکانی ئاوەدانیی و چۆنیەتی دەرکەوتنی شار و تایبەتمەندییەکانی حکومەتی چاکەخواز و کۆڵەکەکانی پاشایەتیی باس دەکات کە بریتین لە پاشاو خەڵك و دادپەروەریی و تەگبیر (غەملێخواردنیان).

١٢ ن– (الحسين الكرابيسي) کۆچکردووی ٢٤٥ ك / ٨٥٩ ز.

حوسەین کوڕی عەلی کوڕی یەزیدی کەرابیسی، بەغدادیی، شافیعی، فەرموودەناس، فەقیهو ئوسولی، قسەزانە، پیاوناسە، فەرموودەی بیستووە، هاوەڵێتی پێشەوا شافیعی کردووەو زانستی لێوەرگرتووە لە ریزی گەورە هاوەڵانی دادەنرێت[٥٨].

١٧ ك – پێشەوایەتی (الإمامة)[٥٩].

١٣ن – (علي بن مهزيار الأهوازي) کۆچکردوو لە دەوروبەری ٢٥٠ ك/ ٨٦٥ ز.

عەلی کوڕی مهزیار، ناسراو بە ئەبولحەسەن، ئەددەورەقی، فەقیهی شیعەی ئیمامیی، پێشتر مەسیحیی بوو لەگەڵ باوکیدا موسوڵمان بوون، لە ئەهوازدا پێگەشت و لە هاوەڵانی ئەبولحەسەنی عەسکەریی بوو، ئەو فەقیهو توێژەری قورئان بووە و بەشداریش بووە لە هەندێ زانستدا[٦٠].

---

58 (معجم المؤلفين، رضا كحالة ج) ب٤، ل ٣٨.

59 (ايضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل ٢٧٢ – (اعلام المؤلفين)، ب٤، ل ٣٨.

60 (اعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب٧، ل ٢٤٧ – (الإعلام، الزركلي) ب ٥، ل ٢٥ – ٢٦.

١٨ ك– ئـەدەبی شـەریعەت و ئـەدەبی سیاسـەت (أدب الـشريعة و أدب السياسة)[٦١].

١٤ ن– (يعقوب الكندي) كۆچكردووی ٢٥٢ ك / ٨٦٧ ز.

یەعقوب كوڕی ئیسحاق كوڕی سەباح كـوڕی عیمـران كـوڕی ئیـسماعیلی كینـدی، فەیلەسـوف، زانـا بـە پزیـشكی و فەلـسەفە و ژمێـرە (حـساب) و مەنتیق و ئەندازیاریی و ئەستێرەناسی و زانستی تریش.لە واسـیت (واسـط) لە دایك بووە، لە بەسرە پێگەشت و گوێزایـەوە بـۆ بەغـداو لـە لای خەلیفـە مەئمون ڕێـزو پێگەیـەكی بـەرزی بەدەسـتهێنا و لـەلای خەلیفـە موتـەوەكل دووزمانییان لەسەری كـردو ئـەویش لێیـداو پـاش ماوەیـەك لـە زەوتكردنـی كتێبەكانی بۆیان گەڕاندەوە، لـــە بەغدا كۆچی دوایی كرد[٦٢].

١٩ ك– نامەی گەورە لە سیاسەتدا (الرسالة الكبرى في السياسة)[٦٣].

٢٠ ك– نامەیەك لە سیاسەتی گشتییدا (رسالة في السياسة العامة)[٦٤].

١٥ ن– (عمرو الجاحظ) ١٥٠–٢٥٥ ك / ٧٦٧ – ٨٦٩ ز.

زانا، وێژەوان، بەشدار لە چەندین جـۆر زانـستدا، موعتـەزیلی، گـرووپ و تاقمی (الجاحظية)ش دەدرێتە پاڵ ئەو[٦٥].

٢١ ك– تاجی ڕەوشتی پاشایان (التاج في أخلاق الملوك)[٦٦].

---

61 دەسنووسێكە لە خانـەی كتـێبی نیـشتمانی بـۆ دەسنووسـەكان (المخطوطـات) لـە تـونس، ژمـارە ٢٠٢٩، پێڕستی مامۆستای خوالێخۆشبوو حەسەن حوسنی عەبدولوەهاب.

62 (معجم المؤلفين، رضا كحالة)، ب ١٣، ل ٢٤٤.

63 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ٥٣٧-٥٤٤.

64 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ٥٣٧-٥٤٤.

65 (معجم المؤلفين، رضا كحالة)، ب ٨، ل ٧.

ئەم کتێبە پێشکەشی فەتح کوڕی خاقان کراوە، نووسەر لە سەرەتادا باسی هۆکاری دانانی کتێبەکەی کردووە، روونکردنەوەی ئەوەیە کە خەڵك چۆن مامەڵە لەگەڵ پاشاکانیاندا بکەن، هەروەها پاشاکانیش چۆن مامەڵە لەگەڵ رەعیەتدا بکەن، لەم بارەیەوە ئەم کتێبە لە تەواوی بەندەکانیدا باسی چاکسازیی پەیوەندیی سیاسیی – کە بریتییە لە کرۆکی زانستی سیاسیی لە هەر کات و شوێنێکدا – لە نێوان فەرمانرەواو فەرمانبەرداردا و لەسەر بنەمایەکی ئەخلاقی و بەهایی جەخت لەسەر مەودای روناکبیریی سیاسیی هەردوولا دەکاتەوە، هەر بۆیە دەبینین جەخت لەسەر دیاریکردنی چین و توێژە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەوکە پێویستە چۆن مامەڵە لەگەڵیاندا بکرێت، بە پێی شوێنی هەر چینێك و پێگەیان، لەگەڵ روونکردنەوەی ئەوەدا کە ئامانجی دەسەڵات چاکسازیی باری خەڵکە و مەترسیدارترین گرفتیش حەزو شەهوەتی خۆسەپاندنی پاشایانە.

٢٢ ك– عوسمانییەکان (العثمانية)[٦٧].

ئەم کتێبە لە چوارچێوەی تیۆری پێشەوایەتیی (الإمامة)دا –وەکو تەوەرەی فیکری سیاسیی ئیسلامیی لەو کاتەدا – دەسوڕێتەوە، راو بۆچوونی زۆربەی گرووپ و تاقمە ئیسلامییەکان نیشان دەدات، ئەم کتێبە رووبەڕووی زۆر کاردانەوە هاتووە، کە من گەشتمە دوانیان، یەکەمیان

---

[66] ئەحمەد زەکی توێژینەوەی لەسەر کردووەو لە قاهیرە لە چاپخانەی ئەمیرییە (١٩١٤ز) چاپیکردووە، هەروەها (فەوزی عەتوی)ش توێژینەوەی لەسەر کردووە و لە بەیروت: کۆمپانیای لوبنانی بۆکتێب (١٩٧٠ز) چاپی کردووە.

[67] عەبدوسسەلام هاروون لێی کۆڵیوەتەوە، لە یانەی کتێبی عەرەبی قاهیرە لە ساڵی ١٩٥٥ ز چاپیکردووە، هەروەها "حەسەن سەندوبی"یش لە چوارچێوەی نامەکانی "جاحظ"دا لە کتێبخانەی بازرگانیی گەورەی قاهیرە ١٩٣٣ز و لە ٢٨٠ لاپەڕەدا چاپی کردووە.

"نقض العثمانية"[٦٨] كە نوسراوی ئەبو جەعفەر موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵای ئیسکافی (کۆچکردوو لە ٢٤٠ ك / ٨٥٤ ز) کە ناوبراو قسەزانێکی بەغدایی موعتەزیلیی[٦٩]، دووەمیشیان "بناء المقالة العلوية في نقض الرسالة العثمانية للجاحظ"[٧٠]، کە نوسراوی ئەحمەد کوڕی موسا کوڕی جەعفەر کوڕی تاوس (کۆچکردووی ٦٧٣ ك /١٢٧٤ ز)، ناوبراو لە فەقیهەکانی شیعەی دوانزە ئیمامییە، لە فەرموودەناسانە و بە فەقیهی ئەهلولبەیت[٧١] ناسراوە، هەردوو کتێبەکە رەخنە لەو وتانەی "جاحظ" دەگرن کە لەم کتێبەدایە.

٢٣ ك- شایستەیی (گونجاویی) پێشەوایەتیی (إستحقاق الإمامة)[٧٢].

هەروەها ئەمیش لە چواردەوری مەسەلەی پێشەوایەتیی و بەلام لە گۆشەنیگایەکی ترەوە دەست پێدەکات و باسی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی دەکات کە پێویستە دەسەڵاتێکی سیاسیی هەبێت کە ژیان رێك بخات و یاخییبوان بەرپەرچ بداتەوە و پێویستییەکانی کۆمەڵگە دابین بکات. لەم رووەوە باسی چاکترینی پێشەوایەتیی دەکات، باسی خزمایەتیی و

---

68 عەبدوسسەلام هارون لە چوارچێوەی نامەکانی "جاحظ"دا بڵاوی کردووەتەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە پاشکۆی کتێبی عوسمانییەو لە ٦٠ لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە.

69 (الاعلام، الزركلي)، ب ٦، ل ٢٢١. (اعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٠٠.

70 دەستنووسە لە کۆڕی زانیاریی عێراقیی لە ژێر ژمارەی ٣ / بیروباوەڕ- رێڕەو - تاقمەکان (فرق) - وەڵامدانەوەکان.

71 (الاعلام، الزركلي) ب ١، ل ٢٦١.

72 حەسەن سەندوبی لە چوارچێوەی نامەکانی "جاحظ"دا توێژینەوەی لەسەر کردووە، لە کتێبخانەی بازرگانیی گەورە، قاهیرە ١٩٣٣ ز، لە ٣١٠ لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها عەبدوسسەلام هارون لە دوو نامەدا لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە کە یەکەمیان ناونیشانی "إستحقاق الإمامة" و دووەمیشیان "الجوابات في إستحقاق الإمامة" و لە چوارچێوەی نامەکانی "جاحظ"دا لە کتێبخانەی خانچی قاهیرە لە ساڵی ١٩٧٩دا چاپ کراوە، بەشی چوارەم.

هەبوونی زیاتر لە پێشەوایەك دەكات و ئاماژە بە مەترسیی ئەوە دەكات بۆ سەر یەكگرتوویی موسوڵمانان. چونكە مەبەست لە بەرپاكردنی دەسەڵات پێشەوایەك دامەزراویی كۆمەڵگەو هەڵسانەوەی كۆمەڵگەیە، چونكە كاتێ خەڵكی بەبێ پێشەوا هێڵرانەوە خراپ دەبن، دەبێ یەكبگرن و بۆ دەستەبەركردنی ئامانجەكانیان كۆببنەوە. هەموو ئەم مەسەلانە سەرنجی زەین بۆ لای تیۆری گرێبەستی كۆمەڵایەتیی رادەكێشن كە لە ئەورووپا دوای دە سەدە دەركەوت.

٢٤ ك- كتێبی بەربەست (كتاب الحجاب)[٧٣].

((جاحظ)) لە سەرەتای كتێبەكەیدا جەخت دەكاتەوە لەسەر ئامۆژگاریی و گرنگیی ئەو مەسەلەیە بۆ بەردەوامی سیستمی دەسەڵات، پاشان لێكۆڵینەوە لەسەر كێشەی بەربەست (الحجاب) دەكات كە بریتییە لە هەبوونی بەربەستێكی مرۆیی یا مادیی لە نێوان دەسەڵاتدار و خەڵكدا كە رێگرە لە پەیوەندییەكانی دەسەڵاتدار و رەعیەت، ئەمە سەرەڕای هەبوونی چەندین فەرموودەو وتەی پێشینانی چاكە خواز، بێگومان خۆ شاردنەوەی فەرمانڕەوا لە جەماوەر سەرەتایە بۆ نادادگەریی و ستەمكاریی، هەروەها دەبێ پێویستە هۆ و رووڵێنەر (واسطە)ی پەیوەندی نێوان فەرمانڕەواو خەڵك خاوەنی كۆمەڵە مەرجێك بێت كە نەبێتە هۆی ئەوەی بەرژەوەندییەكانی جەماوەر لە فەرمانڕەوا بشارێتەوە. لەم حاڵەتەدا حیجاب تەنها كردار (عملیة)ی چوونە ژوورەوەو دەرچوون بۆ دیوانی فەرمانڕەوا رێك دەخات.

---

73 عەبدوسسەلام هارون توێژیویەتەوە لە چوارچێوەی نامەكانی "جاحظ"دا و لە قاهیرە، خانچی ١٩٦٥ ز چاپیكردووە، بەشی دووەم ٥٠ لاپەڕەیە.

٢٥ك– ئاگاداركردنەوەی پاشایان و فێڵەکان ((تنبيه الملوك وَالمكايد))[٧٤].

هەموو کتێبەکە جەخت لەسەر وریایی و توانای سیاسیی دەکاتەوە لە هەموو کاروبارەکانی ناوخۆیی و دەرەکیی و جۆرەکانی پەیوەندییەکانی دەوڵەتدا، هەروەها جەخت لەسەر بەها جیاوازە سیاسییەکان دەکاتەوە کە پێویستە فەرمانڕەوا لە سیاسەتدا لێی بەهرەمەند بێت.

٢٦ك– رەوشتی پاشایان (أخلاق الملوك)[٧٥].

٢٧ك– دەسەڵاتدار و رەوشتی دەوروبەری (السلطان وأخلاق أهلهُ)[٧٦].

٢٨ك– ئەدەبی پاشایان کە بە هاوەڵی پاشایان ناسراوە (أدب الملوك وَيَعرف بصحبهِ الملوك)[٧٧].

٢٩ك– کتێبی دادوەران و فەرمانڕەوایان (كتاب القضاة والولاة)[٧٨].

٣٠ك– پەسنی بازرگانیی و خراپیی کاری دەسەڵاتدار (مدح التجارة وَ ذم عمل السلطان)[٧٩].

١٦ن– (محمد الزيات) کۆچکردووی ٢٦٢ ك/ ٨٧٦ ز.

---

74 دەستنووسێکە لەخانەی کتێبی میسری، ژمارە ٥٩٦٠،٢٣٤٥، ٤٧٩٧ ئەدەب هەروەها مایکرۆفیلمی ژمارە ١٧٧٠، وێنەگیراو لە کتێبخانەی کۆبلرلی لە تورکیا کە بریتی یە ٤٣٨ لاپەڕە. هەروەها لە پەیمانگای دەستنووسی عەرەب لە قاهیرە بە ژمارە ٦٤٠ وێنەگیراوە، هەروەها لە قوتابخانەی ((عبدالرحمن الصائف)) لە موسڵ (عێراق) بە ژمارە ١٠٦٥ تۆمارکراوە.

75 دەستنووسێکە لە ئەیاسۆفیا لە تورکیا، ٢٨٢٨، بروکلهان ل ١١٥.

76 لەنامەکانی (جاحظ)ی سەندوبی دا بلاوکراوەتەوە، ژمارە ١٨٣ بروکلمان ل ١٢٤.

77 دەستنووسێکە لە مۆزەخانەی بەریتانیا OR–9446 ، بروکلمان ل ١٢٧.

78 لە نامەکانی (جاحظ)ی سەندوبیدا بلاوکراوەتەوە، ژمارە ١١٥، بروکلمان ل ١٢٤.

79 لە نامەکانی (جاحظ)دا بلاوکراوەتەوە، کۆمەڵەی ((محمد ساسي المغربي)) ١٥٥ – ١٦٠ کۆمەڵەی ریشەر ١٨٦-١٨٨، خەزێنەی تەیموریيە ٣٧٦-٣٧٩، مۆزەخانەی بەریتانی ٦٥ و ٢٦٨ و، لە پەراوێزی "الكامل"ی لاجرد (١٢٦-٢٥١) چاپ کراوە.

محمد کوڕی حوسەینی کوڕی زیاتی هەمەدانی، قسەزانێکی شیعە و فەرموودەناسێکی گێڕانەوە (ریوایە) زۆرە[80].

٣١ک– کتێبی پێشەوایەتی (کتاب الأمامة)[81].

١٧ن– (علي الطاطري) لە ژیاندا بووە لە ٢٦٣ک / ٨٧٧ز دا.

عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی محەممەدی تائیی، کوفیی، ناسراو بە (طاطري)، فەقیهو فەرموودەناس بووە[82].

٣٢ک– پێشەوایەتی (الأمامة)[83].

١٨ن– (أحمد بن سهل الأحول الكاتب) کۆچکردووی ٢٧٠ک/٨٨٣ز.

لە پێشەنگانی نووسەران و چاکەکارانیان بووە، ناوبراو زانابووە بە پیشەی خەراج[84].

٣٣ک– کتێبی خەڕاج (کتاب الخراج)[85].

١٩ن– (أبو عبدالله بن مسلم بن قتيبة الدينوري) ٢١٣–٢٧٦ک/٨٢٤–٨٨٩ز.

---

[80] (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٩، ل ٢٤٠.

[81] (إيصناح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل ٢٧٢، (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ١٧، (أعلام المؤلفين، رضا كحالة)، ب٩، ل ٢٤٠.

[82] ((معجم المؤلفين، رضا كحالة))، ب ٧، ل ٦٨.

[83] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل ٦٨.

[84] (الفهرست، إبن نديم) ل ٩٤، ((الأعلام، الزركلي)) ب ١، ل ٢٠٥.

[85] (هدية العارفين، البغدادي)، ب ١، ل ٥١،)–(الفهرست، إبن النديم)، ل ٩٤، (الأعلام، الزركلي)، ب ١، ل ٢٠٥، کە وتەی ئیبن خەلەکانی گوێزاوەتەوە، ئاگام لەحاڵ و ژیانی نییە، بەڵام کتێبەکەی بەناوبانگەو ناوم تەنها لەبەر کتێبەکەی هێناوە.

یەکێکە لە زاناو وێژەوان و قورئانلەبەرەکان، پێشەوا لە زمانەوانییدا، زانا بووە بە مەسەلەکانی قورئان و فەرموودەی نامۆ و وردەکاریی شیعر. ئەو یەکەم کەس بووە کە وێراویەتی بە رەخنەی ئەدەبیی، ئەو کتێبی پێشەوایەتیی و سیاسەتی هەیە کە بریتییە لە مێژووی دامەزراوەی خیلافەت، هەندێ گومانیان هەیەکە کتێبی ئەوبێت، کە یەکەمیان خۆرهەلاتناسی غانیغۆسی مجریتی و دووەم دکتۆر دوزی[٨٦].

٣٤ك- کتێبی فەرمانڕەوا (كتاب السلطان)[٨٧].

تیایدا باسی گەشتی ژیانی فەرمانڕەواو سیاسەت و چۆنیەتی هەڵبژاردنی کاربەدەستان و رەوشتی هاوەڵانی دەسەڵاتدارو راوێژو راو مەترسی شوێنکەوتنی هەوەس و گومان دەکات، پاشان باسی دامەزراوە جۆرەکانی دەوڵەت وەکو نووسەران، کاربەدەستان و دادوەران دەکات، هەروەها چۆنیەتی هەڵبژاردنیان و مەرجەکانی کارکردن و چاودێرییان باس دەکات و ئینجا باسی مەسەلەی حیجاب و مەترسی ستەمکاریی و گرنگیی گوێڕایەڵیی و ئامۆژگاریی دەکات.

٢٠ن- (أحمد طيفور) ٢٠٤-٢٨٠ ك /٨١٩-٨٩٣ ز.

---

86 لە پێشەنگی توێژەرانی کتێبی (عيون الأخبار)ی ئیبنو قوتەیبەیە، قاهیرە، زنجیرەی کەلەپوورمان، ١٩٦٣ز.

87 لە بەرگی یەکەمی (عيون الأخبار) دا بلاوکراوەتەوە، قاهیرە، دامەزراوەی گشتیی میسریی بۆ دانان و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە، زنجیرەی کەلەپوورمان (١٩٦٣ز) کە بریتییە لە ١٠٦ لاپەڕە. بە سەربەخۆیی لەو میسر چاپ کراوە (ساڵی ١٣٢٤ك/١٩٠٧ز) چاپخانەی موحەممەد ئیبراهیم ئادەم کوتوبی.

ئەحمەدی کوڕی تاهیر تەیفوری بە بنەچە مەرزەوییە، کە یەکێکە لە ڕەوانبێژان و شاعیران و گوێزەرەوان (الرواة)، لە بەغدا لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٨٨].

٣٥ك– پاشای چاکەکارو وەزیری دیاریکراو (الملك الصالح والوزير المعين)[٨٩].

٣٦ك– هەواڵی پاشای دادگەر لە تەگبیری وڵات و سیاسەتدا (خبر الملك العادل في تدبير المملكة والسياسة)[٩٠].

٢١ن– (إبراهيم الثقفي) کۆچکردووی ٢٨٣ك/٨٩٦ز.

ئیبراهیم کوڕی موحەممەد کوڕی سەعید کوڕی هیلالی سەقەفیی کوفیی شافیعیی، فەقیهو فەرموودەناس، مێژوونووس، پێشتر ڕاوبۆچوونەکانی لەسەر ئاینزای زەیدیی بوو، بەڵام دواتر ڕایەکانی لەسەر مەزهەبی دوانزە ئیمامی دامەزرا[٩١].

٣٧ك– کتێبی پێشەوایەتی (كتاب الأمامة)[٩٢].

٣٨ك– کتێبی ڕاوێژ (كتاب الشورى)[٩٣].

٢٢ن– (أحمد بن الطيب السرخسي) کۆچکردووی ٢٨٦ك / ٨٩٩ز.

ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی مەڕوانی تەیبی سەرخەسی، زانا، حەکیم، وێژەوان (أديب)، فەلسەفەی بە کینديی فەیلەسوف وتووەتەوە و

---

88 (معجم المؤلفين،رضا كحالة) ب ١، ل٢٥٦-٢٥٧.

89 (هدية العارفين، البغدادي) ب١، ل٥١-٥٢.

90 (هدية العارفين، البغدادي) ب١، ل٥١-٥٢.

91 (معجم المؤلفين، رضا كحالة)، ب ١، ل٩٥.

92 (ايضاح المكنون،البغدادي) ب ٢،ل ٢٧٢، (الأعلام،الزركلي) ب١، ل٦٠.

93 (ايضاح المكنون،البغدادي) ب ٢،ل ٣٠٦، (الأعلام،الزركلي) ب١، ل٦٠.

ناوبراو له لای وانەی خوێندووه. هەروەها خەلیفه (المعتـضد)ی فێرکـردووه و هاوڕێی تایبەتی بووه (بۆ فێرکردنی)، دامـەزراوەی حەسـبەی لـه بەغـداد بەڕێوه بردووه[٩٤].

٣٩ك– کتێبی سیاسەت (كتاب السياسة)[٩٥].

٤٠ك– حەسبەی گەوره (الحسبة الكبرى)[٩٦].

٤١ك– حەسبەی بچووك (الحسبة الصغرى)[٩٧].

٢٣ن– ((يحيـى بـن الحـسين الهـادي الى الحـق)) (٢٤٥–٢٩٨ك/٨٥٩–٩١٠ن).

ئەبولحوسەین یەحیا کوڕی قاسم کوڕی ئیبراهیم هادی ئیلحەق، ئەو بـوو کە بناغەی پێشەوایەتیی زەیدی له یەمەن دامەزراند[٩٨].

٤٢ك– مەسەلەیەك له پێشەوایەتی (مسألة في الأمامة)[٩٩].

٤٣ك– له چەسپاندنی پێشەوایەتییدا (في تثبيت الأمامة)[١٠٠].

٢٤ن– (عبدالله الخزاعي) کۆچکردووی ٣٠٠ك–٩١٣ز.

---

94 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢، ل ١٧٥.

95 (كشف الظنون، حاجي خليفة) ل٦٦٥، (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢، ل٦٠.

96 (كشف الظنون، حاجي خليفة) ل٦٦٥.

97 (كشف الظنون، حاجي خليفة) ل٦٦٥.

98 بروکلمان، ب ٣، ل٣٢٦.

99 دەستنووسێکه لـه مۆزەخانـەی بـەریتانی، ژمـاره ٢٠٦، XI (III،E57, II ) بروکلمـان، ب ٣،ل٣٢٦.

100 دەستنووسـێکه لـه مۆزەخانـەی بـەریتانی، ژمـاره ٢٠٦، XI، III،، XXX، 123، III2363XVI، ئەمبرۆزیانا، بڕوانه بروکلمان، ب ٣، ل٣٢٦.

عەبدوڵڵا کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی تـاهیر کـوڕی حوسـەین کـوڕی موسـعەب کوڕی زەریق کوڕی ماهانی خوزاعی بەغدادی، شاعیر، نامەنووس (مترسل)، ئەمیر. بەرپرسی پـۆلیس بـوو لـە سـەردەمی خیلافـەتی موحەممـەد کـوڕی عبدولا کوڕی تاهیر له بەغداد[١٠١].

٤٤ك– نامەیــەك لــە سیاســەتی پاشــایەتییدا (رســالة في الــسیاسة الملوكیة)[١٠٢].

٢٥ن– (عبدالله بن شرشیر) کۆچکردووی ٣٠٣ك/٩٠٦ز.

عبــدوڵڵا کــوڕی موحەممــەد ئــەنباری ((الناشــيء))، ناســراو بــە ئینــو شەرشیر، قسەزان، شاعیر، مەنتیقیی، عەروزیی و نەحویی، کە بنەچـەی بـۆ ئەنبار دەگەڕێتەوە، لە بەغدا ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە پاش ئەوە دەرچووە بۆ میسرو هەتا کۆچی دوایی هەر لەوێدا ماوەتەوە[١٠٣].

٤٥ك– مەسەلەکانی پێشەوایەتی (مسائل الأمامة)[١٠٤].

٢٦ن– (الحسن الأطروش) ٢٣٠–٣٠٤ك/٨٤٥–٩١٧ز.

حەسەن کوڕی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی عومەر کوڕی عەلی کـوڕی حوسـەینی کـوڕی عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) حوسـەینی هـاشمی، ئـەتروش، سـێیەمین پاشـای دەوڵـەت عەلـەوی لـە

---

101 ((معجم المؤلفين، رچا كحاله)) ب ٦، ل٢٤٠.

102 (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٦٤٥ (الفهرست، إبن نـديم) ل١٧٠، (كـشف الظنـون حـاجي خليفة) ل١٤٤١، به ناوی (كتاب الرياسة في السياسة) باس كراوه.

103 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٦، ل١١١.

104 ڤـان ئـێس Van Ess بلاویكردووەتـەوە، بـە بـڕوت: پـەیمانگای ئـەڵمانیی بـۆ توێژینـەوە خۆرهەڵاتییەكان ١٩٧١ز.

تەبەرستان، زانای هاوبەش لە توێژینەی قورئان و قسەزانیی و فیقهو فەرموودەو ئەدەب و هەواڵ و زمان و شیعردا[105].

٤٦ك- پێشەوایەتیی (الأمامة)[106].

٤٧ك- کاروباری حەسبە (الأحتساب)[107].

٢٧ن- (محمد الواسطي) کۆچکردووی ٣٠٦ك / ٩١٨ز.

موحەممەد کوڕی زەید کوڕی حوسەینی واسیتیی، بەغدادیی، موعتەزیلیی، لە زانا قسەزانەکانە[108].

٤٨ك- پێشەوایەتیی (الأمامة)[109].

٢٨م- (الحسين الحلاج) کۆچکردووی ٣٠٩ك-٩٢٢ز.

حوسەینی کوڕی مەنسوری حەللاجی فارسیی، بەیزاویی (البیضاوی) بەغدادیی، سۆفی، قسەزان، کە لە بەغداد کوژرا[110].

٤٩ك- سیاسەت و خەلیفە و فەرمانداران (السياسة والخلفاء والأمراء)[111].

---

105 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل ٢٥٢.

106 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل٢٥٢.

107 دەستنووسێکە لە مۆزەخانەی بەریتانیی، پاشکۆ ٤١٣، دەستنووسگەلی خۆرهەڵاتیی ٣/٣٨٠٤ لاپەڕەکانی ٢٨٥-٢٩٢، فوئاد سزگین باسی کردووە/ ب یەکەم، بەشی سێیەم ل٣٤٢.

108 ((معجم المؤلفين، رضا كحالة)) ب ١٠، ل١٣. (إحتساب) بەمانای ئەو ڕێگرییە دێت لەسەر ئەوەی کە لە شەرعدا قەدەغە بێت.

109 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ((فيض الله)) لە ئەستەنبوڵ، ژمارە ١١٧٢، ناوی نووسەرەکەی سڕاوەتەوە و لە کۆتاییدا نوسراوە: بەخەتی ((محمد الواسط)) نوسراوەتەوە هەروەها ((هدية العارفين- البغدادي)) لە ب ٢، ل٢٥ باسی کردووە، هەروەها لە (كشف الظنون)ی حاجی خەلیفە لە ل١٣٩٨ دا باسی کراوە.

110 (معجم المؤلفين، رضاكحالة) ب ٤، ل٦٣-٦٤.

111 (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل ٣٠٤-٣٠٥.

٢٩ن– (علي بن الماشطة) له (٣١٠ك / ٩٢٢ن)دا زیندوو بووه. عەلی کوڕی حوسەین ناسراوه بە (إبن الماشطة)، نووسەرێکه پێشەنگە لە ژمێرەو پیشەی خەڕاجدا[١١٢].

٥٠ك– کتێبی خەڕاج (کتاب الخراج)[١١٣].

٣٠ن– (أحمد بن سليمان بن بشار الكتاب) کۆچکردووی ٣١٢ك / ٩٢٤ز[١١٤].

٥١ك– کتێبی خەراج (کتاب اخراج)[١١٥].

٣١ن– (قدامة بن جعفر) له (٣٢٠ك/٩٣٢ن)دا زیندوو بووه.

جەعفەر کوڕی قودامە کوڕی زیادە، ناسراوه بە قودامەی کوڕی جەعفەر بووه، لە نووسەران بووەو کتێبێکیشی لە پیشەی نووسیندا داناوه[١١٦].

٥٢ك– خەراج و پیشەی نووسین (الخراج و صناعة الكتابة)[١١٧].

ئەم کتێبە نیوەی یەکەمی ونبووه، پێکهاتووه لە هەشت پێگە (منازل)، هەر پێگەیەك چەند بەندێك لەخۆ دەگرێت، تەنها چواری کۆتایی ماوه، نەزانراوه پێگەی یەکەم و دووەم چی لەخۆ دەگرن. بەڵام سێیەمیان لە رەوانبێژیدایە. چوارەمیان باسی "دیوان الأنشاء" دەکات کە کاتی خۆی رۆڵی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی گێڕاوه.

---

112 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل٦٨.

113 (الفهرست، إبن نديم) ل١٩٥، (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٦٨٠.

114 (الفهرست، إبن نديم) ل١٩٥، (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٥٧.

115 (الفهرست، إبن نديم) ل١٩٥، (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٥٧.

116 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل١٤٢.

117 دکتۆر موحەممەد حوسەین زوبەیدی توێژینەوەی لەسەر کردووه، بەغداد، رەشید ١٩٨٨ ز لە ٤٦٥ لاپەڕەدا بڵاوی کردووەتەوه.

پێنجەم یەکەم بەشی چاپکراوی کتێبەکەیە کە بریتییە لە یانزە بەند، کە باسی دامەزراوە بنچینەییەکانی دەوڵەت دەکات لە ڕێگەی باسکردنی وردی و باسی پێکهاتە ناوخۆییەکەی و ئەرك و پەیوەندیی بە یەکەوە، لەگەڵ گرنگیدان بەوەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت سیاسەتە گشتییەکان ئەمەشی پەیوەست کردووە بە خەراجەوە، یان بە شێوەیەکی تر بڵێین کە ناوبراو خەراجی کردووەتە دێباچە بۆ لێکۆڵینەوەکەی، کە تیایدا دیوانەکانی: سوپا، خەرجیی، خەزێنە (بیت المال)، نامەکان، ئیمزا، پارەلێدان، لێکۆڵینەوە لە ستەمەکان (المظالم)، پۆلیس، پۆستەو هێڵ و ریگاکانی باس کردووە. لە پێگەی شەشەمدا کە لە حەوت بەند پێکهاتووە باسی جوگرافیای سیاسیی خانەی ئیسلام (دار الإسلام) دەکات و بە بەشی ئاوەدانیی و باسی گەلان کە تیایدا دەژین و پێگەی ئوممەتی ئیسلامیی تیایدا دیاریی دەکات. لە پێگەی حەوتەمیشدا دانەر باسی ئابووریی سیاسیی دەوڵەت دەکات کە هەموو ڕووەکانی سەرچاوەی دارایی گشتیی و دەسەڵاتە ستراتیژەکانی دەوڵەت لە سەردەمی خۆیدا باسدەکات. لە پێگەی هەشتەمیشدا کە لە نێوەڕۆکی ئەو دەستنووسەدا توێژراوەدا نییە، بەڵکو توێژەر وەکو پاشکۆ لە کتێبی "تحفة الوزراء"ی "الثعالبي" بەدەستی هێناوە، دانەر باسی هۆکارەکانی کۆبوونەوەی مرۆیی و پێداویستییە بنچینەییەکان دەکات کە مرۆڤی پەلکێش کردووە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەی سیاسیی، هەروەها هۆکاری دروستکردنی پاشا و پێشەوای باس کردووە کە خەڵکیان کۆکردووەتەوە. پاش ئەوەش باسی پەیوەندیی نێوان فەرمانڕەواو جەماوەرو ئەو ڕێکخەرو مەرجانەی کە پێویستە هەردوولا پابەند بن پێوەی دەخاتە ڕوو.

٣٢ن– (الشلمغاني) كۆچكردووى ٣٢٢ك / ٩٣٤ز.

موحەممەد كوڕى عەلى كوڕى جەعفەرى شەلمغانى ناسراوە بە (إبن أبي العزاق)، خوداناس (متألـه)، بيدعەچيى، كە لـە سـەرەتادا ئيمـاميى بـووە بەڵام دواتر ئيديعيان ئـەوەى كـرد كـە خـودا لەگـەڵ بـوونى ئـەوەدا تێكـەڵ بووە، شەريعەتێكى دروست كرد كە نێوەڕۆكى ئەوەبوو كە خودا لـە بـوونى هەر مرۆڤێكدا بە ئەندازەى ڕێزى تێكەڵ دەبێت، ((ئيبنـو فـورات))ى وەزيـر يارمەتى دەداو بەهێزى دەكـرد، زانايـانيش خوێنيـان حـەڵاڵ كـرد، (راضـي بـالله)ى عەباسـى كوشـتى و لاشـەكەى سـوتاند بـۆ ئـەوەى شـوێنكەوتوانى گۆڕەكەى پيرۆز نەكەن[١١٨].

٥٣ك– كتێبى پێشەوايەتى (كتاب الأمامة)[١١٩].

٣٣ن– (أحمد البلخي) ٢٣٥–٣٢٢ك / ٨٤٩–٩٣٤ز.

ئەحمەد كوڕى سەهل ئەبو زەيدى بەڵخيى، زانايەكە لە نووسـينەكانيدا ڕێگەى فەيلەسوفانى گرتووەتە بەر، لە سەرەتادا مامۆستاى منداڵان بووە و زانست بەرزى كردووەتەوە[١٢٠].

٥٤– سياسەتى بچووك (السياسة الصغيرة)[١٢١].

٥٥ك– سياسەتى گەورە (السياسة الكبيرة)[١٢٢].

---

118 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ١١ ل٦٦، (الأعلام، الزركلي) ب ٦، ل٢٧٣.

119 (ايضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل٢٧٢، (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل٣٣.

120 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل٢٤٠.

121 (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٥٩. (الفهرست، إبن نديم) ل١٩٨.

122 (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٥٩ (الفهرست، إبن نديم) ل١٩٨.

٣٤م– (أبو الحسن الأشعري) ٢٧٠–٣٢٠ك / ٨٨٣–٩٤٢ز. عەلی کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیسحاق کوڕی سالم، کە ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەبو موسای ئەشعەریی یەمانیی، بەسریی، قسەزانان (متکلم)، بەشدار لە هەندێ زانستدا، بنچینەی گرووپ و تایفەی ئەشعەریی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، لە بەسرە لە دایك بووە و لە بەغداد نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[١٢٣].

٥٦ك– کتێبی پێشەوایەتی (كتاب الأمامة)[١٢٤].

٣٥ن– (أحمد بن عقدةَ الكوفي) ٢٤٩–٣٣٢ك / ٨٦٣–٩٤٤ز. ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی سەعید کوڕی عوقدەتولکوفی، لایەنگری بەنی هاشم، فەرموودەناس و قورئانلەبەر[١٢٥].

٥٧ك– کتێبی ڕاوێژ (كتاب الشورى)[١٢٦].

٣٦ن– (علی بن الجراح) ٢٤٥–٣٣٤ك / ٨٥٩–٩٤٦ز. عەلی کوڕی عیسای کوڕی داوود کوڕی جەڕڕاح بەغدادیی، وێژەوان، پەخشاننووس، توێژەری قورئان، مێژوونووس، سیاسیی، وەزیر، وەزارەتی (المقتدر بالله)ی دووجار یا سێ جار وەرگرتووە[١٢٧].

٥٨ك– نووسەران و سیاسەتی وڵات و گەشتی ژیانی خەلیفەکان (الكتاب وَ سياسة المملكة وَ سيرة الخلفاء)[١٢٨].

---

123 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب٧، ل٣٥.

124 (إيضاح المكنون، البغدادي) ب٢، ل٢٧٢. (هدية العارفين، البغدادي) ب١، ل٦٧٧.

125 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب٢، ل١٠٦.

126 (هدية العارفين، البغدادي) ب١، ل٦٠، (إيضاح المكنون، البغدادي) ب٢، ل٣٦.

127 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب٧، ل١٦٢.

128 (هدية العارفين، البغدادي) ب١، ل٦٧٨.

٣٧ن– (أحمد بن الداية) كۆچكردووى ٣٣٤ك / ٩٤٦ز.

ئەحمەد كوڕى يوسف كوڕى ئيبراهيم كوڕى دايە، لە نووسەران و وەزيرانى ميسرە و كتێبێكى لەبارەى ژيانى (ئەحمەد كوڕى تۆلۆن)ەوە داناوە[١٢٩].

٥٩ك– سياسەتى فەرمانداران و فەرماندەى سەربازان، پێكهاتوو لە سێ سەردەم، (سياسة الأمراء ولاة الجنود المتضمن لثلاثة عهود)[١٣٠].

ئيبنو دايە دەڵێت كە ئەم كتێبەى لە هێماكانى كتێبى سياسەتى ئەفلاتون هەڵێنجاوە و كورت كردووەتەوە. بەڵام دكتۆر عەبدوڕڕەحمان بەدەوى جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە خۆى نووسەرى كتێبەكەيە و لە ژێر كاريگەريى فيكرى يۆنانييدا داينـاوە و وەرى نەگێڕاوە. نووسەر ئەم كتێبەى دژى ئەوانە دەركردووە كە دەمارگير بوون بۆ حيكمەتى فارسيى و يۆنانييەكان بە كەموكورت لەقەڵەم دەدەن لە سياسەتدا، هەر بۆيە ئيبنو نەديم بۆ يارمەتيدانى يۆنانييەكان و سەلماندنى ئەوەى كە ئەهلى حيكمەت سياسيى بوون و لەهەر حاڵەتێكدا كەمتر نەبوون لە فارسەكان. كتێبەكە دابەش بووە بۆ سێ بەش: يەكەميان پەيماننامەى پاشايە بۆ كوڕەكەى كە

129 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢، ل٢٠٧.

130 لە ژێر ناونيشانى (الفلسفة السياسة عندَ العرَب) لێكۆڵينەوەى دكتۆر عومەر ماليكيى بڵاو كراوەتەوە، جەزائير، كۆمپانياى نيشتمانيى بۆ بڵاوكردنەوە (١٩٧١)، بە دەستنووسيش بە ناوى دانەرانى ترەوە هەيە، بۆ نمونە: نوسخەى ئەسكوريال لە ئيسپانيا ژمارە ٧١٩ ناونيشانى (كتاب سياسة الأمراء وَ ولاة الجنود المتضمن لثلاثة عهود) كە نووسراوى ئيبراهيمى كوڕى عەبدولواحيد كوڕى ئەبو نوورە، كە بۆ (المؤيد بنصرالله) ميرى ئيمانداران ئەبو يەحيا كوڕى ئەبوبەكرى نووسيوە كە فەرمانڕەواى ئەفەريقاى كردووە و شوێنى نيشتەجێبوونى تونس بووە (٧١٨-٧٤٧ك / ١٣١٨-١٣٤٦ز) كە بريتييە لە ٨٢ لاپەڕە.

تیایـدا هـەموو ئـەو ئـەرك و فـەرمان و خەسـڵەت و تایبەتمەندییانـەی کـە پێویـستە لـە پاشـادا هـەبێت ئامـاژەی پێـدەدات. پاشـان پەیماننامـە و ئامۆژگاریی وەزیر بۆ کوڕەکـەی کـە تیایـدا خەسـڵەت و تایبەتمەندییـەکانی پۆسـتی وەزارەت و خەسـڵەتەکانی وەزیـرو ڕۆڵ و ڕەوشـتی بـاس دەکـات. پاشان پەیماننامەو ئامۆژگاریی تاکی خەڵکییە بە گشتی بۆ کوڕەکانیان، کە تیایدا باسی ئەوە دەکات کەچی لەسەر هاووڵاتی پێویستە ئەنجامی بدات و خەسڵەتە سیاسییەکان دیاریی دەکات. وەکو بڵێی ئەم کتێبە بـەم شـێوازە ڕەگەزەکانی پەیوەندیی سیاسیی لەنێو کۆمەڵگـەدا باسـدەکات ئەمـەش لـە ڕێگەیەکی دەروونیەوە جەخت لەسەر هەڵسوکەوتی سیاسیی و ڕووناکبیریی سیاسیی دەکات.

٣٨ن- (أبـو نـصر الفـارابي) ٢٦٠-٣٣٩ك / ٨٧٤-٩٥٠ز. موحەممـەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی ئۆزلـغ کـوڕی تۆرخـانی فارابییـە، ڕەچـەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ شـاری فـاراب لـە زەوی کازاخستان، بـە مامۆسـتای دووەم نـاوی دەرکـردووە، حـەکیم، بیرکـارییزان، پزیـشك، مۆزیکـار، شـارەزای زمانەکانی تورکی، فارسی و یۆنـانی و سـریانیی بـووە، لـە فـاراب لـە دایـك بووە و عەرەبیی چاك فێربوو، لەگەڵ ((مەتای کوڕی یـونس))دا ئاشـنا بـوو زانستی لێوەرگرتووە و سـەردانی ((حـەڕانی)) کـردووە و بوویـە هاونـشینی یوحەننا کوڕی جیلان، دواتر سـەردانی میـسری کـرد و دواتـر گەڕایـەوە بـۆ دیمەشق و لەوێ نیشتەجێ بوو، هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد[١٣١].

[131] (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ١١، ل١٩٤.

٦٠ك- سیاسەت (السياسة)[١٣٢].

ئامــانجی نووســەر لــە نووســینی ئــەم کتێبــە باســکردنی ئــەو یاســا سیاســییانەیە کــە بەرژەوەنــدیی هــەموو بەکارهێنــەرانی تێدایــە، هــەموو چینەکانی کۆمەڵگە لـە رەفتاریانـدا لەگـەڵ ئەنـدامانی خۆیـان و چـینەکانی سەرووی خۆیان و خوارووییانـدا دەتـوانن سـوودی لێـوەربگرن. چـونکە هـەر دەسـتەو چـینێك لەمانـە لەگـەڵ دەسـتەکەی تـردا سیاسـەتێکی جیاوازیـان هەیە، پاشان هێزی فیکریی و زیندووە و باسی دەکات و ئەویش پەیوەست دەکات لەگەڵ رەفتاری سیاسـییدا. پێکهێنـانی کۆمەڵگـەی سیاسـیی رۆڵـی پێغەمبـەران و خـستنەبەرباسی رەفتـاری سیاسـیی مـرۆڤ لـە چوارچـێوەی کۆمەڵێك بەهادا وەکو دادپەروەریی، راوێژ، ئامۆژگاریی و رازداریـی چـەندین بابەتی تر کە ئەو باسی کردوون.

٦١ك- سیاسەتی شارستانیی (السياسة المَدنيةَ)[١٣٣].

ئەو لەسەرەتادا وتەی خۆی بە باسکردنی ژێری کاریگەر (العَقْل الفعّـال) واتــە پــەروەردگار دەســت پێــدەکات، جیــاوازیی دەکــات لــە نێــوان مــرۆڤ و زیندەوەرانـــدا لـــەڕووی رۆڵـــی ژیرییـــەوە، پاشـــان باســـی کۆمەڵگـــە شارســـتانییەکان دەکـــات و ئـــەوان دەکاتـــە ســـێ دەســـتە، گـــەورەکان، ناوەنجییـــەکان و بـــچووکەکان. یەکـــەم لـــە حـــاکمی فەیلەســـوفدا کـــورت

---

[132] دکتۆر فوئاد عەبدولمونعیم ئەحمەد لە چوارچێوەی (مجموعـة في الـسياسة)دا توێژینـەوەی لەسـەر کردووە، ئەسکەندەریە، (مؤسسة شباب الجامعة) ١٩٨٢ز بڵاوی کردووەتـەوە.. پـێش ئـەوەش لـویس شێخۆ توێژینەوەی لەسەر کردووە، بەیرووت ١٩١١ز و لە ٢٨ لاپەڕەدا.

[133] لە چوارچێوەی (رَسائِل الفارابي) دا چاپکراوە، حەیدەرئاباد، هینـد، (مَطبوعـات دائـرةَ المَعـارِف العثمانيةَ) ١٩٢٦ز لە ٧٧ دا لە ژێر ناونیشانی (السياسات المدنيةَ) دا چاپکراوە، ئینجا فەوزی نەجار توێژینەوەی لەسەر کردووە بەیروت، چاپخانەی کاتۆلیکی ١٩٦٤ز.

دەکاتــەوە، ئینجـا فـارابی شـاری سـەنگین (المدنیـة الفاضـلة) و شـارە پێچەوانەکانی وەکو فاسق، ستەمکار، نەفام و.. هتد پۆلێن دەکات. پێگەی مـرۆڤیش لـە کۆمەڵگـەدا بـە دوو حاڵـەت سـنووردار دەکـات، یەکـەمیان سەرۆکێك کە کەس بە سەریدا سەرۆکایەتی ناکات، دووەمیش سـەرۆکایەتی دەکات و سەرۆکایەتیش بە سەریدا دەکرێت.

٦٢ک– بەدەستهێنانی بەختەوەریی (تَحصیل السَعادةَ)[134].

فـارابی لـەم کتێبـەدا بـەدوای دابینکردنـی بەختـەوەریی و چـۆنیەتی دەستەبەرکردنی ئەو بۆ گەلان و مرۆڤەکانە. فـارابی چـاکەخوازی (فَـضائِل) دەکاتە چوار رەگەز: چاکەخوازیی تیۆریی، چاکەخوازیی رەفتاریی، فیکریی و کرداریـی، پاشـان پێویـستی چـاکەخوازیی هـەر چـینێك لـە چـینەکانی کۆمەڵگـە دیـاریی دەکـات، بـۆ نموونـە کەسـی سـەربازیی دەبێـت جـەخت بکاتەوە و گرنگیی بدات بە چاکەخوازیی هێزی فیکریی و هێزی جەسـتەیی، ئینجـا ئـەو رۆڵـی پاشـا لـە پـەروەردەی گەلەکـەی و رەعیەتەکـەی لەسـەر چاکەخوازیی باس دەکات کە هەتا بەختەوەرییان بۆ دەستەبەر دەکات.

٦٣ک– بۆچـوونەکانی خـەڵکی شـاری چـاکەکاریی، (آراء أهـلْ المَدینـةَ الفاضِلةَ)[135].

سـەرەتا کتێبەکـە بـە دێباچـەیەکی فەلـسەفیی لەسـەر بـوونی یەکـەم و خەسڵەتەکانی دەست پێ دەکات و پاشان لە خودی مرۆڤ و تواناو شـێوازی

---

[134] لە چوارچێوەی نامەکانی فارابیدا لە حەیدەرئابادی هینـد چـاپ کـراوە (مَطْبوعـات دار المَعـارِف العثمانیةَ).

[135] دکتۆر ئەلبێر نەسری نادر لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە. بەیروت: چاپخانەی کـاتۆلیکی ١٩٥٩ز، ١٩٧٦، لە ٤٧ لاپەڕەدا چاپکراوە. بریتییە لە ١٣٠ لاپەڕە.

پێکهێنانی ئەو، هۆکاری پێکهێنانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی، هۆی پێویستی مرۆڤ بە کۆمەڵگە، هۆکاری پێویستیی بوونی سەرۆك، تایبەتمەندیی شاری چاکەخوازیی و شارەکانی بەرانبەر ئەو و هونەرو پیشەی پێویستی ئەم شارەو بۆچوونەکانی دانیشتوانی شاری نەفامیی (جاهلة) و درۆزی (فاسقة) باس دەکات، بە پێی بۆچوونی فارابی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی دەکرێت بە دوو دەستەوە، گروپی کامڵ و گروپی ناتەواو، کۆمەڵگەی تەواو و کامڵ، خۆیان سێ دەستەن: گەورە و ناوەنجی و بچووك کە ئەو بە ئاوەدانیی، ئوممەت و شار باسیان دەکات.

ئەو سەبارەت بە کۆمەڵگە ناتەواوەکان باسی گوند، گەڕەك و کۆڵان و شەقام و ماڵ دەکات. ئەو بڕوای وایە کە لەپێشترینی چاکییەکان لەشار یا کۆمەڵگە پێگەیشتووە بچووکەکاندا بەدەست دەهێنرێت، نە لە ئاستی خوارووتردا.

٣٩ن– (محمد بن عبدالله أبوبكر البرذعي) کۆچکردووی ٣٤٠ك / ٩٥١ز.

لە یەکێ لەناوچەکانی ئازەربایجاندا لەدایك بووەو لە یاخییبوان (الخوارِج)ە[١٣٦].

٦٤ك– کتێبی پێشەوایەتیی (کتاب الأمامة)[١٣٧].

٦٥ك– پووچەڵکردنەوەی کتێبی ئیبن راوەندیی (نقض کتاب ابن الراوندي في الأمامة)[١٣٨].

٤٠ن– (محمد غُلام ثعلبْ) ٢٦١–٣٤٥ك / ٨٧٥–٩٥٦ز.

---

[136] (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ٢، ل٤٠-٤١.

[137] سەرچاوەی پێشوو.

[138] سەرچاوەی پێشوو.

موحەممــەد کــوڕی عەبدولواحیــد کــوڕی ئــەبی هیــشامی بەغــدادیی، خوانــاس، ناســراو بــە غــولام (ثعلــب)، زمــانزان، لــە بەغــدا کۆچــی دوایــی کردووە[139].

٦٦ك– کتێبی راوێژ (کِتاب الشوری)[140].

٤١ن– (إخوان الَصفاء وَ خلان الوفا) سەدەی چوارەمی کۆچی بەرامبــەر بە سەدەی دەیەمی زاینی.

ئەمانە کۆمەڵێك بوون لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دروست بــوون، کــە بەرانبەر بە دەیەمی زاینییە، شوێنیان بەسرە بوو لقێکی ئــەوان لــە بەغــدادا بوو. (إخوان الصَفا) بە تەواوی نەناسراون، تەنها پێنج کەس لەوانە ناسراون کە هەتا ئێستاش گومان و دوودڵی زۆر لەبارەیانــەوە هەیــە کــە بــریتین لــە: ئــەبو ســولەیمان موحەممــەد کــوڕی نەســر (نَــصر) ناســراو بــە مەقدیــسی، ئەبولحەسەن عەلی کوڕی هــارونی زەنجــانی، ئــەبو ئەحممــەدی نــەهرجوری، عەوەزی (عوضي) و زەیدی کــوڕی رەفاعــە. ئەنــدامانی ئــەم رێکخــستنە لــە چــوار پلــەدا رێکــدەخرێن، لــە پلــەی یەکەمــدا لاوانــێ زیــاتر لــە پانزەســاڵ رێکــدەخران کــە پیــشەو کــارێکی تایبــەتیان ئــەنجام دەدا. بەمانــە دەوتــرا ((إخوان الأبرار))، لە پلەی دووەمدا سەرۆك و بەڕێوەبەرانێ دادەنران کە بە لایەنی کەمەوە تەمەنیان سی ساڵ بێت، حیکمەت و ژیریــی ئــەوان وەرگــیرا بێت (تەجروبــە کرابێــت)، بــەم دەســتەیە دەوتــرا ((الأخیــار الفــضلاء))، لــە پلەی سێیەمدا پاشایانی خاوەن دەسەڵات دادەنران کە چڵ ساڵی تــەواویان پڕکردبێتەوە و وەکو کەسانێ کە بۆ پارێزگاریی یاساکانی خودا تێدەکۆشــن

[139] (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٠، ل٢٦٦-٢٦٧.

[140] (كَشف الظَنون، حاجى خَليفةَ) ل١٤٣١. (هديةَ العارفين، البَغدادي) ب ٢، ل٤٢.

**و بەو شێوەیەش ناسرابن، کە بەمانیش دەوترا (الأخـوان الفـضلاء الكـرام)، لە پلەی چوارەمدا هەڵبژێردراوانێك بوون کە بە لایەنی کەمەوە دەبێ پـەنجا ساڵ بن[141].**

**٦٧ك– نهێنییـــەکان بـــۆ دامەزرانـــدنی سیاســـەت و رێکخـــستنی سەرۆکایەتیی[142].**

**ئەم کتێبە چەندین باسی وەکو جۆری پاشایان و رەفتار و هەڵسوکەوتی پاشایانە، سیمای دادپەروەریی، ژمارەی وەزیران، رەوشتی بەڕێوبەرایەتیی و سیاسـەتی ئـەوان، بـاڵیۆزان، نووسـەران، چـاودێرانی خـەڵکی، خـەراج، سیاسـەتی بـەڕێوەبردنی فەرمانـدەو سـەربازان و سیاسـەتی جەنگـەکانی کردووە.**

**٤٢ن– (أبو القاسم البَغدادي) کۆچکردوو لە ٣٤٥ك / ٩٥٦ز.**

---

[141] (بطرس البستاني) پێشەکی نامـەکانی (إخـوان الـصَفا وَ خـلان الوَفـاء) بـەیروت: (دار صـادر) ١٩٥٧ز.

[142] دکتۆر ئەحمەد ترێکـی لێکۆڵینـەوەی لەسـەر کـردووە، بـەیرووت: (دار الحکمـة) چـاپی یەکـەم، ١٩٨٣ز. ئەم کتێبە بەدەستنووسی لە کتێبخانەی (رفاعة الطهطاوي) لە سوهاج لە میسر بـە ژمـارە ١٦٧ مێژوو پارێزراوە، بەڵام دراوەتە پاڵ ئەرەستۆ. لە زانکـۆی ئەمـەریکی بەیرووتـدا بـە ناونیـشانی (Mic-A-331) پـارێزراوە. هـەروەها لـە ئەیاسـۆفیا لـە تورکیـاش هەیـەو دراوەتـە پـاڵ ئەحمـەد یەمەنی و لەژێر ژمارەی ٢٨٩٠ دا دانراوە. هەروەها لە پاریس بەخـەتی (محمـد بـن صـالح المرعـشي) کۆچکردوو لە ٩٦٨ك دا هەیە. دکتۆر ترێکی بڕوای وایـە...کـە (إخـوان الـصَفا) خـاوەنی نامەیـەکی زانستی شەرعیین کە هەمان پەنجاهەمین نامەی ئەوان بێت، کە لـەوەدا باسـی جۆرەکـانی سیاسـەت و بەڕێوەبردنی مرۆڤ بۆ کاروباری خۆی و جەستەی هاوەڵانی دەکات.

عەبـدوڵڵا کـوڕی ئەحمـەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی عەبـدوڵڵا کـوڕی حوسەین کوڕی حەسەن کوڕی فەیروزی کلۆزانی، لـە چـاکەکاران (أفاضـل) بووە، خاوەنی ((دیوان السواد)) بووە[١٤٣].

٦٨ك– خەڕاج (الخراج).

دووجـار نووسـیویەتی، لـە یەکـەمیان سـاڵی ٣٢٦ی کۆچـی و لـە دووەم جاریشدا ساڵی ٣٣٦ کۆچی[١٤٤].

٤٣ن– (محمد الكندي) ٢٨٣–٣٥٠ك / ٨٩٧–٩٦١ز.

موحەممـەد کـوڕی یوسـف کـوڕی یـەعقوبی کینـدی، تـەجیبی، مێـژوونووس، ڕەگـەزناس، فـەرموودەناس، لـە میـسر لـەدایك بـووە و لـە ((الفسطاط)) کۆچی دوایی کردووە[١٤٥].

٦٩ك– کتێبی فەرمانداران و دادوەران (كتاب الولاة والقضاة)[١٤٦].

٤٤ن– (عبدالعزيز بن حاجب النعمان) کۆچکردوو لە ٣٥١ك / ٩٦٢ز[١٤٧].

عەبدولعـەزیز کـوڕی ئیـبراهیم کـوڕی حـاجبی نوعمـان، لـە نووسـەری دیوانەکانە، لە سەردەمی (معز الدولة)دا بەرپرسی (دیوان السواد) بووە.

٧٠ك– خودی چاکەکاران لە فەرمانداریی و لاداندا (أنـس ذوي الفَـضْل في الولايَة والعزل)[١٤٨].

---

143 (كَشف الظنون) حاجی خەلیفە، ل٦٤٦.

144 سەرچاوەی پێشوو.

145 (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٢،ل١٤٢.

146 بە هەوڵی (ڕڤن کیست)، لیدن، ١٩١٢ چاپ کراوە، هەروەها لە بەیرووت چاپ کراوە، چاپخانەی یەسوعییەکان، هەروەها بە ئۆفسێت لە کتێبخانەی (المُثَنى) وە لە بەغداد (١٩٤٦ز) چاپ کراوە.

147 (معجم المؤلفين، رضا كحالة) ب ٥ ل ٢٣٩ / ٢٤٠.

148 (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل٥٧٧. (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٥، ل٢٣٩.

٤٥ن– (علي الفراء) کۆچکردوو له ٣٥٢ك / ٩٦٣ز.

عەلی کوڕی حوسەین کوڕی عەلی عیسا، فەڕا، مێژوونووسێکی میسرییە و له زانایانی شەرعزانی مالیکییە[١٤٩].

٧١ك– چاکەی پاشایان (محاسن الملوك)[١٥٠].

٤٦ن– (إبراهيم القلانسي) کۆچکردوو له ٣٥٩ك / ٩٤٠ز.

ئیبراهیم کوڕی عەبدوڵڵا ناسراو بە قەلانسی زوبەیدیی، فەقیهو زانای قسەزان[١٥١].

٧٢ك– پێشەوایەتیی (الأمامة)[١٥٢].

٤٧ن– (محمد القمي) ٣٦٨ك / ٩٧٨ز.

موحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی داوود کوڕی عەلی قومی، فەقیهو فەرموودەناس، له پیاوماقوڵانی قوم بووە[١٥٣].

٧٣ك– نامەیەك له کرداری دەسەڵاتدار (الرسالة في عمل السلطان)[١٥٤].

٤٨ن– (إسحاق بن شريح)٣٠٠–٣٧٧ك / ٩١٣–٩٩٢ز.

ئیسحاقی کوڕی یەحیا کوڕی شورەیحی نسرانی، ناسراو بە (إبن الزرقالة) ناوبراو زانیاریی زۆر بووە بە کاروباری دیوانەکان و گفتوگۆی کاربەدەستان[١٥٥].

---

149 (معجم المؤلفين، رَضا حكالة) ب ٧، ل٧٦.

150 دەستنووسێکە لەخانەی کتێبی میسریی، ژمارە ٤٧٨٦ (أدب طلعت)، ٥٤ پارچەیە.

151 (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١، ل٥٤.

152 سەرچاوەی پێشوو.

153 (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٨، ل٣٥٩.

154 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل٤٨، (الأعلام، الزركلي) ب ٥، ل٣١٢.

155 (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب٣، ل٢٣٩.

٧٤ك- كتێبی خەراج (كِتاب الخراج) لە دوو بەرگدا نووسیویەتی[١٥٦].

٤٩ن- (إبن بابويه القمي) ٣٠٦-٣٨١ك / ٩١٨-٩٩١ز.

موحەممەد كوڕی عەلی كوڕی حوسەین كوڕی موسای بابەوەیهی قـومیی ناسراو بە شێخی سـەدووق (الـشيخ الـصدوق)، فەرمووەدەناسـێكی ئیمـامیی گەورەیە و خاوەنی كتێبی ((محمد لايَحضرةَ الفقيةَ))ـە، كە ئیمام خومـەینی تیـۆری ولایـەتی فـەقیهی لەسـەر ئـەو بناغەیـە دامەزرانـد، لـە قومییەكانـدا وێنـەی نـەبووە، لـە ((ڕەی))دا ژیـاوە و لـە خۆراسـاندا پلـەو پایـەی بـەرز بووەتەوە، لە شاری رەیدا نێژراوە، نزیكەی ((٣٠٠)) نوسراوی هەیە[١٥٧].

٧٥ك- پێشەوایەتیی و ڕێنماییی لە چاكەخوازان (الأمامـةَ وَ التبَـصَرةَ مـن الخَيرةَ)[١٥٨].

٧٦ك- كتێبی دەسەڵاتدار (كِتاب السلطان)[١٥٩].

٧٧ك- كتێبی راوێژ (كِتاب الشورى)[١٦٠].

٥٠ن- (الصاحِب بن عباد) ٣٢٦-٣٨٥ك / ٩٣٧-٩٩٥ز.

ئیـسماعیل كـوڕی عوبـاد كـوڕی عـەبباس كـوڕی عوبـاد كـوڕی ئەحمـەد كوڕی ئیدریس تاڵەقانی ناسراو بە (صاحِب)، نووسەر، ئەدیب، سیاسیی، لە چـەندین زانـستدا بەشـدار بـووە، لـە ئیـستەخر (إسـطخر) لـەدایك بـووەو

156 (الفُهرسْت إبن النَديم) ل ١٩٥. (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ١، ل٢٠٠.

157 (الأعلام، الزركلى) ب ٦، ل٢٤٧. (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١ ل٣.

158 لە بەیرووت (دار المرتضى))١٩٨٥ز چاپ كراوە.

159 (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ٢، ل٥٢-٥٣. (ايضاح المكنون،البَغدادي) ب ٢، ل ٣٠٢.

160 هەمان سەرچاوە.

وتراویشه له تالّەقان (طالقان) بووه، وەزارەتی مەلیك (مؤيد الدولة بـن بويـة بن ركن الدَولةَ))ی وەرگرتووەو لەشاری ((ڕەی)) كۆچی دوایی كردووه[١٦١].

٧٨ك– كتێبی وەزارەت (كِتاب الوزارةَ)[١٦٢].

٧٩ك– كتێبی پێشەوایەتی (كِتاب الأمامة)[١٦٣].

٥١ن– (محمد القزاز) ٣٤٢–٤١٢ك/٩٥٣–١٠٢١ز.

موحەممـەدی كـوڕی جەعفـەر كـوڕی ئەحمـەدی تـەمیمیی قـەیرەوانیی، ناسـراو بـە قـەزاز، ئـەدیب، نـەحوی، زمانـەوان، زمـان پـاراو و شـاعیر. لـە قەیرەوان لەدایك بووەو هەر لەوێش كۆچی دوایی كردووه، ئەو كاربەدەستی ((عەزیزولعەبیـدی)) فـەرمانڕەوای میـسر بـووه، زۆر خـاوەن شـكۆ و بـەڕێز بووه له لای پاشایان و زانایان و بە تایبەتی خەڵكی[١٦٤].

٨٠ك– وێژەی فەرمانڕەوا (أدب السلطان)[١٦٥].

٥٢ن– (الحسين المَغربي) ٣٧٠–٤١٨ك / ٩٨٠–١٠٢٧ز.

حوسـەین كـوڕی عـەلی كـوڕی حوسـەین كـوڕی عـەلی كـوڕی موحەممـەد كوڕی یوسف كوڕی نەحر كوڕی بەهرام ناسراو بە وەزیری مەغریبی و ئیبنو مەغریبی، وێـژەوان، پەخـشانووس، شـاعیر، بەشـدار لـە چـەندین زانـستدا،

---

[161] (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٢، ل ٢٤٧.

[162] (الفهرست، إبن نديم) ل ١٩٤، (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٢، ل٢٤٧.

[163] دەستنووسێكە لە كتێبخانەی شارەوانی ئەسكەندەرییە (میسر) ژمارە (٣٨٤٣ج) هەر لەوێشەوە نوسخەیەكی وەرگیراو لە پەیمانگای عەرەبی قـاهیرە هەیـەو خـاوەنی (الفهرسـت) لـە ل١٩٤ دا باسـی كردووه.

[164] (معجم المؤلفين،رَضا كحالةَ) ب ٩، ل١٤٨-١٤٩.

[165] (إيضاح المكنون، ابَغدادي) ب ١، ل ٥٠. (هدية العارفين، البَغدادي) ب ٢، ل٦١.

وەزارەتی وەرگرتووەو لە ((میافارقین)) کۆچی دوایی کردووە لە کوفە نێرژاوە[١٦٦].

٨١ک– سیاسەت (السیاسةَ)[١٦٧].

ئەم کتێبە پێشکەش بوەیهییەکان کراوە لە بەغدا، کراوە بە سێ بابەتەوە: سیاسەتی فەرمانڕەوا بۆ خۆی و رەفتارەکانی، ئەو بەها و رەوشتانەش کە پێویستە هەیبێت وەکو دادپەروەریی و چاکەکاریی و ئەنجامدانی کارەکان لە کاتی خۆیاندا فەرمانداری خودا و بەدەستهێنانی وەکو بەها شایستەکانی فەرمانڕەوا باس کراوە، لەبەشی دووەمیشدا تەکبیرو رەفتاری ئەو لەگەڵ دەستوپێوەندەکان و چواردەوری دا بە تایبەت ئەو کاروبارانەی راستەوخۆ پەیوەندیان بە خەڵکەوە هەیە باس کراوە. لەبەشی سێیەمیشدا پەیوەندیی فەرمانڕەوا لەگەڵ خەڵکیدا بەتایبەتی رەفتاری چاك لەگەڵ خەڵك و ئاشنایی و ناسینی چینەکانی خەڵك و رێزگرتن کە بناغەی ستەمکاریی و گەندەڵییە، باس کراوە.

٥٣ن– (محمد الأسكافي) کۆچکردووی ٤٢٠ك / ١٠٢٩ز.

موحەممەد کوڕی عەبدوڵڵا ناسراو بە دواندەری ئیسکافی (الخَطیب الأسكافي)، وێژەوان، نووسەر، شاعیر و زمانەوان خەڵکی ئەسفەهان بووە[١٦٨].

[166] (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٤، ل٣٠.

[167] دکتۆر فوئاد عەبدولمونعم ئەحمەد لە چوارچێوەی ((مجموع في السياسةَ)) توێژینەوەی لەسەر کردووە، ئەسکەندەرییە، دامەزراوەی لاوانی زانکۆ ١٩٨٢ز لە ٢٢ لاپەڕەدایە چاپی کردووە.

[168] (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٠، ل ٢١١.

٨٢ك– لوتفی تەگبیر لە سیاسەتی پاشادا (لطف التدبیر في سياسةَ المَلِك)[١٦٩].

٥٤ن– (أحمد بن مسكويةَ) كۆچكردوو لە ٤٢١ك/١٠٣٠ز.

ئەحمەد كوڕی موحەممەد كوڕی یەعقوب، نازناوی مەسكویە بووە، خەزنەدار، لەئەسڵدا خەڵكی (ڕەی) بووە، لە ئەسفەهاندا دەژیا، ئەبو عەلی، فەیلەسوف، مێژوونووس، وێژەوان بووە[١٧٠].

٨٣ك– نامەیەك سەبارەت بە ماهیەتی دادگەریی (رسالةَ في ماهيةَ العدل)[١٧١].

٥٥ن– (يحيي الناطق بالحَقْ) كۆچكردووی ٤٢٤ك/١٠٣٣ز.

یەحیا كوڕی حوسەین كوڕی موحەممەد كوڕی هاروون كوڕی حوسەین كوڕی موحەممەد كوڕی هارون بەتخانی هاشمی، حەسەنی، فەقیهو ئوسوڵی، قسەزان، لە پێشەوایانی زەیدییە، لە دوای (المؤيد بالله أحمد بن الحسين)ی برای بەیعەتی درایەو هەڵسا بە راستكردنەوەی ئاینزا (مذهَبْ)ی هادی كوڕی یەحیای كوڕی حوسەین[١٧٢].

---

169 دەستنووسێكە لە كتێبخانەی ئەحمەدی سێیەم لە ئەستەمبوڵ، ژمارە: ٢٦٣٣، لە ٥٨ لاپەڕەدا چاپ كراوە. هەروەها لە زانكۆی ئەمەریكی بەیرووت بە ناونیشانی (Mic-A-319) وێنەی گیڕاوەتەوە. هەروەها ئەحمەد عبدولباقی توێژینەوەی لەسەر كردووەو لە قاهیرە (١٩٦٠ز) بڵاوی كردووەتەوە.

170 (معجم المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٢، ل١٦٨.

171 موحەممەدخان بڵاوكردووەتەوە، ليدن: بريل ١٩٦٤ز، لە ٣٨ لاپەڕەدا بڵاوكردووەتەوە.

172 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١٣، ل١٩٢-١٩٣.

٨٤ك- كۆڵەكەی چەسپاندنی پێشەوایەتیی (الرعامة في تَثبيت الأمامة)[١٧٣].

٥٦ن- (إبن سيناء) ٣٧٠-٤٢٨ك/٩٨٠-١٠٣٧ز.

حوسەین کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی سینای بەڵخی بوخاری، بە (شیخ الرئیس) ناسراوە، فەیلەسوف، پزیشك، شاعیر، بەشدار لە زانستی جۆراوجۆردا، لە خورمیش کە گوندێکە لە گوندەکانی بوخارا لەدایك بووەو لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە[١٧٤].

٨٥ك- نامەیەك لە سیاسەتدا (رِسالةَ في السياسةَ)[١٧٥].

ئیبن سینا نامەکەی خۆی لەسەر سوننەتی جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان دەست پێدەکات، کە چۆن دەبێتەهۆی مانەوەیان، پاشان جەخت لەسەر پێویستیی هەبوو سیستمێکی سیاسیی دەکاتەوە، ئەمەش بە هۆی پێویستی کۆمەڵایەتی و سروشتی خۆڕسکیانەی مرۆڤ و پێکهاتەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، کە هیچ شتێ جگە لە فەرمانڕەوایی و تەگبیر شتێکی تر بەکەڵك نییە، ئەو بناغەی چاکسازیی دەبەستێتەوە بە ژیرییەوە. هەروەها ئەو بوونی ئەویتر بە پێویست و گرنگ دەزانێت بۆ بوونی من، چونکە دۆزینەوەی ناتەواویی (عَیبْ) پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی چاکسازیی، هەروەها ئیبن سینا جۆر و گرووپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان دەخاتە ژێر لێکۆڵینەوە، لە خوێندنەوەی نووسینەکەی

---

173 دەستنووسێکە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ژمارە ٧١٣.

174 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٤، ل ٢٠.

175 د. فوئاد عەبدولمونعیم ئەحمەد لێکۆڵینەوەی لە سەر کردووە، ئەسکەندەرییە (مؤسسة شباب الجامعة) ١٩٨٣ز بریتییە لە ٣١ لاپەڕە.

ئــەودا وا دەردەكــەوێت كــە ئــەو سیاســەت بــەمانای گــشتیی ئەوەیــە كــە چاكسازیی لەسەر ئاستی هەموو ژیانی مرۆڤایەتییدا ئەنجام بدرێت.

٥٧ن– (عبدالمَلِك الثَّعالبي) ٣٥٠–٤٢٩ك/٩٦١–١٠٣٨ز.

عبدولمــەلیكی كــوڕی موحەممــەد كــوڕی ئیــسماعیل ســەعالیبی، لــە نەیــشاپوور لــەدایك بــووە، وێــژەوان، پەخــشاننووس، ڕێكخــەر، زمانــەوان، هەواڵزان و قسەزان (بیاني)[١٧٦].

٨٦ك– دیاری وەزیران (تحفة الوَزراء)[١٧٧].

ئــەم كتێبــە لــە پێــنج بەشــدا ڕێكخــراوە، لــە بەشــی یەكەمــدا بــە مانــای زمانەوانیی و قورئانیی باسی وەزارەت و مێژووی سەرەتای ئــەو لــە گــەلانی تردا هەروەكو هیندو ئــەوانی تــر، تایبەتمەندییــەكانی وەزیــری چــاكەخواز و پێویستیی بە هەبوونی یەك وەزیر باس دەكات، لە بەشــی دووەمــدا چــاكەو قازانجــەكانی وەزارەت و لــە بەشــی ســێیەمدا، ڕەوشــت، مەرجــەكان و پێداویستییەكانی وەزارەت و پەیوەندیی نێوان وەزیرو پاشا باس كراوە، لە بەشی چوارەمیشدا، جۆرەكــانی وەزارەت و پێناســەی هەریەكــەیان كــراوە. هەروەها وەزارەت دابەش كــراوە بــە وەزارەتــی ڕەهــا (مطلــق) و وەزارەتــی مەرجــدار (مقیــد) و تایبەتمەندییــەكان و ئــەركی وەزیــری ڕەهــاو جــێ بــەجێكردنی ئــەم دوو جــۆرە وەزارەتــە، تێگەیــشتن و پێویــستیی ڕاوێــژ و دیــارییكردنی ڕاوێــژكار ئامــاژەی پێــدراوە، لــە بەنــدی پێنجــەمی كتێبەكــەدا

---

١٧٦ (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب٦، ل١٨٩.

١٧٧ حەبیب ڕاوی و ئیبتسام مەرهون سەفار لێكۆڵینەوەیان لەسەر كردووە، بەغدا، وەزارەتی ئەوقاف (١٩٧٧ز) لە ١٣٠ لاپەڕەدا بڵاوكراوەتەوە.

**سەبارەت بە شایستەی وەزیرانی پێشوو، مێژووی هەندێك لەوان باس دەكات.**

**٨٧ك– ڕەوشتی پاشایان (آداب الملوك)[178].**

**٥٨ن– (أبو نَعيم الأصفهاني) ٣٦٦–٤٣٠ك/٩٤٨–١٠٣٨ز.**

**ئەحمەد كوڕی عەبدوڵلا كوڕی ئیسحاق كوڕی موسای میهرانی ئەسفەهانیی، شافیعیی، فەرموودەناس، مێژوونووس، سۆفی بووە و لە ئەسفەهان كۆچی دوایی كردووە[179].**

**٨٨ك– كتێبی پیشەوایەتیی و بەرپەچدانەوەی پشتهەڵكەران.**

**٨٨ك– (كِتاب الأمامة وَ الرَد على الرافضةَ)[180].**

**٥٩ن– (عبدالمجيد الأخشيدي) لە (٤٣٥ك/١٠٤٤ز)دا زیندوو بووە.**

---

178 دكتۆر خەلیل عەتییە لێكۆڵینەوەی لەسەر كردووە، بەیرووت: (دار الغرب الإسلامي)، هەروەها لە ژێر ناونیشانی (سَراجْ الملوك) لە مۆزەخانەی بەریتانییدا دەستنووسێك بە ژمارە ٢٣٦٨ پارێزراوە. هەروەها لە زانكۆی ئەمەریكی بەیرووت بە ناونیشانی (Mic-A-372). هەروەها وەكو ژیانی پاشایان باسی كردووە، (كَشف الظنون) ل ١٠١٦، هەروەها بەغدادی لە (هديـةَ العـارفين)دا باسی كردووە.

179 (معجم المؤلفين، عمر رَضا كحالةَ) ب ١، ل ٢٨٢.

180 دەستنووسە لە كتێبخانەی (كوبلرلی) لە توركیا، ژمارە: ١٦١٧، بریتییە لە ٤٨ لاپەڕە، لەوەش نوسخەیەكی كۆپیكراوی لە زانكۆی ئەمەریكی بەیرووت بە ناونیشانی (Mic-A-168) پارێزراوە.

* لە مێژوودا بە گرووپێ لە شیعە وتراوە كە بەیعەتیان دابوویە ((زەیدی كوڕی عەلی كوڕی حوسەین)) و پاشان پێیان وت: دەبێ خۆت بەریی بكەیت لە ئەبوبەكر و عومەر هەتا هاوكارییت بكەین، بەڵام زەید قبوڵی نەكرد و ئەوانیش پشتیان تێكرد و بە تەنها لە گۆڕەپاندا مایەوە و حەجاج شەهیدی كرد. هەندێ لە سونییەكانیش هەموو شیعە بە ((رافضی)) ناو دەبەن، چونكە پشتیان هەڵكردووە لە رای كۆمەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر و تەنها ژمارەیەكی كەم بە هاوەڵ قەبووڵ دەكەن.

عبدولمەجیـد کـوڕی یـونس کـوڕی کـافووری ئەخنـشیدی بورهـانیی، میسریی حەنەفیی[١٨١].

٨٩ک– چنراوی ئەو ڕێگایەی کە پاشا بەرهەم دێنـێ (المحبـوك بـالطريق المسلوك فيما يَصنَع الملوك)[١٨٢].

٦٠ن– (محمد بن علي بن الطيب البصري) کۆچکردووی ٤٣٦ک/١٠٤٤ز.

قـسەزان، ئوسـولّیی، لـە بەغـداد نیـشتەجێ بـووە و هـەر لـەوێش خوێندوویەتی هەتا کۆچی دوایی کردووە[١٨٣].

٩٠ک– کتێبی پێشەوایەتی (كتاب الأمامة)[١٨٤].

٦١ن– (علي المرتَضى) ٣٥٥–٤٣٦ک/٩٦٦–١٠٤٤ز.

عەلی کوڕی حوسەین کوڕی موسا کوڕی موحەممەد کـوڕی موسـا کـوڕی ئیبراهیم کوڕی ((موسى الكاظم)) کوڕی ((جعفر الصادق)) کوڕی موحەممەد باقر کوڕی عەلی زینولعابدین کوڕی حوسەین کوڕی عەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب (ڕەزای خوایان لێ بێت)، ناسراوە بە شـەریفی مورتـەزا، قـسەزان، فـەقیهو ئوسولّیی، توێژەری قورئان، وێژەوان، نەحویی و زمانەوان[١٨٥].

٩١ک– مەسـەلەی کـارکردن لەگـەلّ فـەرمانڕەوادا ((مـسألةَ في العَمَـلْ مَـعْ السُلطان))[١٨٦].

181 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٦، ل١٧١.

182 (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ١، ل٦١٩–٦٢٠.

183 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل٢٠.

184 (كَشف الظنون، حاجى خَليفةَ) ل١٣٩٨.

185 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٧، ل٨١.

186 (وێلّفرێد مادلۆنگ) توێژینەوەی لەسەر کردووە دکتۆر (رضوان السيد) وەرگێـڕاوە بـۆ عـەرەبی، بەیرووت: (الفكر العرَبي) ئۆکتۆبەر، نۆڤەمبەر) ١٩٨١ ز ژمارە: ٢٣.

سـەيد مورتـەزا لـەم كتێبـەدا باسـی كـاركردن لەگـەڵ فەرمانـدارانی ستەمكارو فریكـار و شـەرعییەت لـە بەشـدارییكردنی بەڕێوبەرایەتییـەكان و هاوكارییـان دەكـات، دوای ئـەوەی كـە مەسـەلەكەی لەگـەڵ حوسـەین ئەلمەغریبی–خاوەنی كتێبی ((السیاسةَ)) – باس كـردووە و رای هاتووەتـە سەر نووسینی ئەم نامەیە.

٦٢ن – (الحسین بن علي الأهوازي) ٣٦٢–٤٤٦ك/٩٧٣–١٠٧٤ز.

حوسـەین كـوڕی عـەلی كـوڕی ئیـبراهیم كـوڕی یـەزداد كـوڕی هورمـوزی ئەهوازی، ئەبو عەلی، قورئان خوێن، فەرموودە ناس و قسەزان، لـە ئـەهواز لەدایك بووە لە ساڵی ٣٩١ك دا چووەتە دیمەشق و لـەوێ نیـشتەجێ بـووە، ناوبراو لەسەر ئاینزا (مذهَبْ)ی سالمیە بووە، ئەو بەڕواڵەت قسەی دەكـرد و دەستی دەگرت و پشتی بە فەرموودە بێهێزەكانەوە دەبەستەوە[١٨٧].

٩٢ك– سـوودەكان و ملوانكـەكان: سـوودەكانی ئـەو رەوشـتانەی كـە پاشاكان پێویستیان پێیەتی (الفوائد وَ القلائـد: فوائـد الـسلوك فیمـا یحتـاج الیهِ الملوك).

لە هەشت بەندا رێكی خستووە، كە لە كۆتاییدا دەڵێت: ((چوار شت لە چوار شت بێ نیاز نابن: رەعیەت لە سیاسەت، سوپا لە فەرمانـدەیی، را لـە راوێژ و مەبەست و بڕیار (عزم) لە داوای خێركردن (الأستخارةَ)[١٨٨].

---

[187] (معجم المؤلفین، رَضا كَحالةَ) ب ٣، ل٢٤٧.

[188] دەستنووسـێكە لـە خەزێنـەی حوسـەینی (ربـاط)دا، ژمـارە: ٦٤٨١، هـەروەها لـە كتێبخانـەی (ئەمبرۆزیانا) لە میلانۆ بە هەمان ناونیشان و بە ژمارە (D359) نوسەرەكەشی (أبی الحَسن محیـي بن یحیی الأهوازي)یە، لە كتێبخانەی كۆڕی زانیاریی عێراقییش بە ژمارە ٣٨ ئەدەب، بـەبێ نووسـەر پارێزراوە، لـە غـدامس (لـە لیبیـا) كتێبخانـەی بەشـیر قاسـم یوشـەع ژمـارە: 8/50 بـەبێ دانـەر. برۆكلمان بڕوای وایە كە كتێبی (أبی الحسن بن علي بن إبارهیم الأهوازي)یە كە كۆچكردووی ٤٤٦ك–

٦٣ن – (أبو العلاء المعري) ٣٦٣–٤٤٩ك/٩٧٣–١٠٥٧ز.

ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی سولەیمان کوڕی موحەممەد کوڕی سولەیمانی موعەڕی، شاعیر، حەکیم، وێژەوان، زمانەوان و نەحوی[١٨٩].

٩٣ك–سەروای فەرمانڕەوا بۆ دواندنی پاشایان (السجع السلطاني في مخاطبات الملوك).

کە بەڕێوەبردن و تەگبیری پەیوەندیدار بە سەربازان، فەرمانداران و وەزیران لە هەشتا بەندا تیایدا باس کراوە و لەخۆی گرتووە[١٩٠].

٦٤ن– (أبو الحسن الماوردي) ٣٦٤–٤٥٠ك/٩٧٥–١٠٥٨ز.

عەلی کوڕی موحەممەد کوڕی حەبیب بەسری، ناسراو بە ماوەردیی، ئەبولحەسەن، فەقیهی شافیعیی، ئوسوڵیی، توێژەری قورئان، وێژەوان، سیاسیی، لە بەسرەوەو بەغداد وانەی وتووەتەوە ، پۆستی دادوەریشی لە زۆر ناوچەدا وەرگرتووە. لە لای پاشایانی بوەیهیی پێگەیەکی بەرزی بەدەستهێناوە، لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە[١٩١].

٩٤ك– فەرمانە پاشاییەکان (الأحكام السُلطانيةَ)[١٩٢].

ئەو لەم کتێبەدا ئەو بابەتە بنچینەییانەی کە موسڵمانان لە زانستی سیاسییدا باسیان دەکەن خستووەتە ژێر لێکۆڵینەوە. پێشەوایەتی

---

١٠٥٥ز، هەروەها (كَشف الظنون) ١٣٠٣ باسی کردووە بە هەمان ناو، هەروەها (غەزالی)یش لە (نصيحة الملوك)دا بە هەمان ناو باسی کردووە.

189 (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ١، ل٧٧.

190 (كَشف الظنون، حاجى خليفةَ) ب ٢، ل٩٧٩، (هَديةَ العارفين، البَغْدادي) ب ١، ل٧٧.

191 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٧، ل١٨٩.

192 چەندین جار چاپکراوە لەوانە (مصطفى البابي الحلبي) سەرپەرشتی چاپکردووە، قاهیرە: ١٩٧٣ز.

(الأمامـة) و مـەرج و شـێوەی گرێـدانی، وەزارەت و جـۆرو بریکارەکـانی و ئەوانەی کە شایستەی ئەو پۆستەن، ئەمیرایەتیی بـە تایبـەتی ئەمیرایـەتیی جیهاد و میرایەتییەکانی تـری وەکـو سەرپەرشـتیی دادوەریـی و میرایـەتیی لێپێـچینەوەی سـتەمکاریی (مظـالم) و پێـشەوایەتیی لەسـەر خـاوەن رەچـەڵەکەکان (نـاوداران)، پـاش ئـەوەش باسـی مـەودا ئابوورییـەکانی تایبەتمەندیی دەسکەوت و غەنیمـەت و جزیـە و خـەراج دەکـات، دواتـریش حوکمی تاوانەکان و حوکمی حەسبە.

٩٥ك– یاسـاکانی وەزارەت و سیاسـەتەکانی پاشـا (قـوانین الـوزارة وَ سیاسةَ المَلِك)[193].

ئەم کتێبە سەبارەت بە پۆستی وەزیر و گرنگیی و پێگەی لـە سیـستمی سیاسـییدا بـاس دەکـات، باسـی بنـەماکانی وەزارەت دەکـات هـەروەکو پابەنـدبوون بـە دیـن و چـاکەکردن و دامـەزراوی دادپـەروەریی و ویـژدان و چاکەخوازیی لە هەموو بوارەکانـدا لـە گوفتـارو کـردار و شایـستە سـالاریی، پـەیمان بردنەسـەر بەرانبـەر بـە بـەڵێن و هـەق و راسـتگۆیی، ئینجـا مانـای وەزارەت دەکات لە رووی تێگەیشتن و بناغە و جۆرەکانیـەوە، کـە دەیکـات بــە دوو بەشــەوە وەزارەتــی دەســەڵاتپێدان (تفــویض) و وەزارەتــی جێبەجێکردن (تَنفیذ).

---

193 دکتۆر (رضوان السید) توێژینەوەی لەسەر کردووە، بـەیرووت: (دار الطلیعـةَ) ١٩٧٩ز. هـەروەها دکتـۆر فۆئـاد عەبـدولمونعم و دکتـۆر موحەمـەد سـولەیمان داد توێژینـەوەیان لەسـەر کـردووە، لـە ئەسکەندەرییە لە ((مؤسسةَ شباب الجامعةَ)) ١٩٧٨ چـاپکراوە. هـەروەها پێـشتر بـەبێ لێکۆڵینـەوە بڵاوکراوەتەوە لە قاهیرە: کتێبخانەی خانچی (١٩٢٩ز) بەناونیشانی (أَدب الوَزیر) و بریتییە لە ١٢٣ لاپەڕە.

لە بەشەكانی دواتردا باسی جیاوازییەكانی نێوان ئەو دوو وەزارەتە دەكات و تایبەتمەندیی و ئەركی هەر كامەیان باس دەكات. كۆتایی كتێبەكەشی بە ژماردنی ژمارەیەك بەها دێنێ كە پشكدارن لە گۆڕینی پۆستی وەزارەت بۆ چاكتر كاركردن، لەوانە راوێژ (الشوری)، چاكەخوازیی و سوربوون لەسەر كاركردن و دادپەروەریی و دووركەوتنەوە لە ستەمكاریی لە دووری و پێداهەڵگوتن.

٩٦ك– ئامۆژگاریی پاشایان (نَصیحةَ الملوك)[١٩٤].

ماوەردیی ئەم كتێبەی بە ئامۆژگاریی پاشایان دەست پێدەكات و خەڵكی هان دەدات، بە تایبەتی زانایان لەسەر گرنگیی ئەو خەسڵەتە، دواتر باسی پلەی مرۆڤ و ئەوەی كە لە دروستكراوەكانی تری جیادەكاتەوە دەكات، هەروەها باسی ئەو خەسڵەتانە دەكات كە پاشایان وا لێدەكات كە شایستەی ئەو پۆستەبن. هەروەها باسی ئەو هۆكارانە دەكات كە دەبنەهۆی گرفت و گەندەڵیی لە وڵاتان و رۆڵی دەسەڵاتداران و سیاسەت وەكو هۆكاری چاكسازیی باس دەكات. دوای ئەوەش باسی بابەتگەلی جێنشینی بۆ كوڕو نەوەكان دەكات، كە چۆن هەموو گەلان تیایدا بەشدارن ئەو سیاسەت دەكات بە چوار بەشەوە: سیاسەتی خۆ بە تێكۆشان بۆ بەدەستهێنانی زانست و دانیشتن لەگەڵ زانایان و سیاسەتی دەستوپێوەند و تایبەتەكان (خاصةَ) بە پەروەردە و فێركردنیان لەسەر جێبەجێكردنی فەرمانەكانی خوای گەورە، سیاسەتی جەماوەر بە گشتیی و پێویستی دادگەریی و چاكسازیی كاروباری خەڵك و كردنەوەی دەرگاكان

[194] (حمد جاسم الحدیثي) توێژینەوەی لەسەر كردووە، بەغداد، (دار الشؤون الثَقافیةَ العامةَ) ١٩٨٦ز، كە بریتییە لە ٥٣٣ لاپەڕە.

لەبەردەمیانـدا، پاشــان سیاســەتی دارایــی و تــەگبیری ســامان لــەڕووی سەرچاوەکانی و ڕێگاکانی خەرجکردن.

٩٧ك– سانابینی و خێرسەرخستن لە ڕەوشتی پاشـاو سیاسـەتی وڵاتـدا (سهيل النَظر وَ تَعجيل الظفر في أخلاق المَلِك وَ سياسةَ المُلْك)[195].

ئەم کتێبـە دوو بابـەتی سـەرەکی بـاس دەکـات، ڕەوشـت (الاخـلاق) لـە لایـەنی تیۆرییـەوە، کـە جـەخت دەکاتـەوە لەسـەر ڕەوشـتی خـۆ کـە لـە سروشتی مرۆیی و ئیرادەوە بەرهەمدێت، خودی ئەوەش لـە هۆکـاری وەکـو چێری، بیروباوەڕ و ویست (هوس)ـەوە سەرچاوە دەگرێت.

لـە باسـی دووەمـدا کـە بابەتەکـەی فەرمانڕەواییـە، باسـی کۆڵەکـەکانی دەسەڵات، شێوەی درووستبوون چۆنیەتی هەڵبـژاردنی شـێوەی چـاودێریی ئەوان باسدەکات. لە درێژەدا ماوەردیی هۆکاری گەندەڵیی حکومەت لە دوو هۆکاری خـودایی و مرۆییـدا کورتدەکاتـەوە. کـە ئـەوە بـەهۆی کورتکـاریی (تقصیر)ی هاوکاران و نەمانی ڕاو ڕاوێژو فێڵی دوژمنانەوە دەزانێت.

٩٨ك– حەسبە (الحسبةَ)[196].

٦٥ن– (إبن حَزم الأندلسي) ٣٨٤–٤٥٦ك/٩٩٤–١٠٦٤ز.

---

[195] توێژینەوەی (محی الدین السرحان) بەیرووت: (دار النَهضةَ العربيةَ)١٩٨١ز، هەروەها (د. رضـوان السيد) لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە، لە بەیرووت و لە لایـەن (دار العلـوم العَرَبيـةَ)وە سـاڵی ١٩٨٧ز بڵاوکراوەتەوە.

[196] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی فاتح لـە ئەسـتەمبوڵ، ژمـارە: ٣٤٩٥ لـە ٣٨ پارچـە پێکهـاتووە هەروەها نوسخەیەکی وێنەگیراوی لە پەیمانگای دەستنووسی عەرەبیە بەناونیـشانی (الرَغبـةَ في طَلَـبْ الحـسبةَ) هەنـدێ بڕوایـان وایـە ئەمـە بەشـی کۆتـایی (الأحكـام الـسُلطانيةَ)یـە، بـەڵام قـەبارەی دەستنووسەکە ئەوە پشتڕاست ناکاتەوە.

عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەزمی فارسیی، ئەندەلوسیی، قورتـوبیی، یەزیـدیی، فـەقیهو ئوسـوڵیی ، ئـەدیب، فـەرمووناس، قـسەزان، پـارێزەر (حافظ)ی قورئان، بەشدار لە مێژوو و رەگەزناسین و نەحو و زمان و شیعرو پزیشکیی و مەنتیق و فەلسەفەدا. زۆرێك لە زانایـان رەخنـەیان لێگرتـووە و کۆ دەنگ بوون لەسەر لادانی و دەسەڵاتدارانیان ئاگادار کردووەتـەوە لێـیّ، دوورخراوەتەوەو دەرکراوەو نێردراوە بۆ بیابـانی ((لیلـة)) لـە ئەنـدەلوس و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[197].

٩٩ك- کتێبی سیاسەت (كِتابْ السياسةَ)[198].

سەرەڕای گرنگیی ئەو کتێبـەو رۆڵـی لـە دانـانی سیاسـیی لـە خۆرئـاوای ئیسلامییدا کاریگەریی لەسـەر ئـەوەی دوایـی خـۆی هـاتووە، کەچـی هـەتا ئێستا ونە. دکتۆر (إبراهيم الكناني) هەوڵی کۆکردنەوەی هەندێ لەو وتانەی داوە کە لە کتێبی (الـشَهب اللامعـةَ)ی ئیبنـو رزوانـی (رِضـوان)ی مـالیقی و (بـدائع الـسلك)ی ئیبنـو ئـەزرەق دا هـاتووە، بـەڵام نـاکریّ بڵـێین ئـەوە بـە کورتکردنەوە یا نیشاندان و پێشکەشکردنی ئـەو کتێبـە دادەنرێـت، چـونکە گوێزەرەوە (ناقل) ئەوە دەگوزرێتەوە کە گونجاو بێت لەگـەڵ چوارچـێوەی باسەکەیدا.

گرنگترین ئەو بابەتانەی کە ئەوانـەی دوای خـۆی لـەویان گوێزراوەتـەوە دەکریّ پێویستی هەبوونی خیلافەت و حیکمەت و ئەرکـەکانی و ئەرکـەکانی پێشەواو وەزارەت و راوێژ و پێویـست بـوونی و هانـدانی ئـاوەدانیی و رۆڵـی

---

197 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٧، ل١٦.

198 چەند بەشێك لەوە لە لایەن دکتۆر ئیبراهیم کەنانی لە گۆڤاری (تَطوان)، لە مەغریب ژمارە (٥) ساڵی ١٩٦٠ ز. بڵاوکراوەتەوە.

پێشەوا لەمەدا باسکراوە. هەروەها باسی هەندێ دامەزراوەی وەکو کاربەدەستانی زەکات و نامە گەیەنەران و خەراج وەرگران و سەرپەرشتیارانی حەسبەو پۆلیس و زیندانیشی کردووە.

٦٦ن – (أبو يعلى الفراء) ٣٨٠–٤٥٨ك/٩٩٠–١٠٦٦ز.

موحەممەد کوڕی حوسەینی کوڕی موحەممەد کوڕی خەلەفولفەرای بەغدادیی حەنبەلیی، فەرموودەناس، فەقیهو ئوسولّیی، زۆر فەرموودەی بیستووە و گێڕاویەتەوە و فەتوای داوە و وانەی وتووەتەوە، لە بەغدا داوەریی پێ سپێردراوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[199].

١٠٠ك– حوکمە پاشاییەکان (الاحكام السلطانیة)[200].

ئەم کتێبە نوسخەیەکی تەواو وێکچووی کتێبی ((الاحکام السلطانیة))ی ماوەردییە، سەرەڕای ئەوەی هاوچەرخ بوون و مەزهەبیان جیاواز بووەو ماوەردی شافیعی و ئەبو یەعلا حەنبەلیی بووە، وایکردووە لە مامۆستا موحەممەد حامد فەقیّ کە لە یەك کتێبدا چاپیان بکات و جیاوازییەکانیان لە پەراوێزدا بخاتە روو، هەتا ئێستاش توێژینەوەیەکی ئەکادیمی جێی متمانە نەکراوە کە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە بکات کە لێکچوونی نێوانیان روون بکاتەوەو دەری بخات کە ئایا گوێزانەوە هەیە لە نێوانیاندا؟ یان قوتابییەکانی ئەبو یەعلا ئەم کتێبەیان داوەتە پاڵ ئەو؟ یان یەکبوونی سەرچاوەی مەعریفە و پەیڕەوی ئوسولّیی و واقیعی سیاسیی هەردووکیانی

199 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٩، ل٢٥٤-٢٥٥.

200 موحەممەد حامید فەقی بە لێکۆڵینەوە بڵاوی کردووەتەوە. قاهیرە: ((البابي الحلبي)) ١٩٦٦ز، بریتییە لە ٢٩٠ لاپەڕە.

گەیاندووەتـە ئـەو یـەك ئەنجامییـە؟ ئەمـە مەسـەلەیەكە كـە پێویـستی بـە باسێكی مەعریفی قووڵ هەیە.

١٠١ك- پێشەوایەتی (الإمامة)[٢٠١].

٦٧ن - (إمام الحرمين الجويني) ٤١٩-٤٧٨ك/١٠٢٨-١٠٨٥ز.

عەبدولمـەلیك كـوڕی عەبـدوڵڵا كـوڕی یوسـف كـوڕی موحەممـەدی جوەینیی، رەچەڵەكی دەگەڕێتەوە بـۆ گونـدی ((جـوەین)) لـە نەیـساپوور، شافیعیی، ئەشعەریی، ناسراو بە ئیمـامی حەرەمـەین، ئەبولمـەعالی فـەقیهو ئوسوڵیی، قسەزان، توێژەری قورئان و وێژەوان[٢٠٢].

١٠٢ك- فریادڕەسـی گـەلان لـە پیـسی سـتەمدا (غيـاث الامـم في تيـاث الظلم)[٢٠٣].

ئەم كتێبە پێشكەشی خواجە نیزامولمولكی وەزیـری ئـەلپ ئەرسـەلان و مەلەكشای سەلجوقیی كردووە، ئەم كتێبە لە سـێ كۆڵەكـەو هەریەكەشـیان لە چەند گۆشەو بەش پێكهاتوون.

لـە گۆشـەی یەكەمـدا باسـی دیـارییكردنی پێـشەوایان و حوكمەكـەی و بەرپەچـدانەوەی ئـەوەش كـە بـە پێویـستی نازانێـت كـراوە، هۆیـەكانی دیاریكردنی پیشەو پێویستی رابەرایەتیی و پێشەوایەتیی بـە دەق، ئـەهلی كردنەوەو گرێدان (أهل الحـل وَ العَقـد) و دەنگـدەران (ئەوانـەی كـە پێـشەوا

---

[201] دەستنووسێكە لە كتێبخانەی ((الظاهريةَ))ی دیمەشق، (ضمن المعتمد في أُصول الـدين)ی ژمـارە: ٢٩٥٤، ٨٧ لاپەڕەیە.

[202] (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٦، ل١٨٤-١٨٥.

[203] (د. مصطفى حلمي) توێژینەوەی لەسەر كردووە، ئەسكەندەرییە:(دار الدَعوةَ) ١٩٧٩ز. هەروەها (د. عبدالعظيم أَديب)یش لێكۆڵینەوەی لەسەر كردووە (١٤٠٤ك) و لە ٥٢٨ لاپەڕەدا بڵاوكراوەتەوە.

دیـاریی دەکـەن) و ژمارەیـان، خەسـڵەتەکانی پێـشەوا، شـێوەی لادانـی پێشەواو هۆیـەکانی ئـەم مەسـەلەیە، پێـشەوای چـاك هـەبێت و رێگریـی لـە هەبوونی دوو پێشەوا لە یەك سەردەمدا بـاس کـراوە. لـە گۆشـەی دووەمـدا باسی ئەنجامەکانی دروستبوونی کەم و کورتی خەسڵەتە متمانەدارەکان لـە پێشەوایان و لە گۆشەی سێیەمدا بوونی زانایانی تێکۆشەر (موجتەهیـد) لـە هەر چەرخێکدا و خاڵیبوونی کات و سەردەم لەوانی باس کردووە.

٦٨ن- (نظام الملك الطوسي) ٤٠٨-٤٨٥ك/١٠١٨-١٠٩٢ز.

حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاقی تووسی، نیزامولمولـك، لـە گونـدی ((تۆقان)) لە ((توس)) لەدایك بووە، دامەزرێنـەری زۆر قوتابخانـە بـووە لـە جێگـــا جۆربەجۆرەکانـــدا، نـــاوی قوتابخانـــەی ((النظامیـــةَ)) کـــە حوججەتولئیـسلام غـەزالی تیایـدا دەیخوێنـد یەکێکـە لەوانـە، وەزارەتـی مەلەکـشای سـەلجوقیی دراوەتـیێ، سەرپەرشـتیی رێکخـستنی دەوڵـەتی سەلجوقیی بە شێوەیەکی رێکخراو و کارگێڕیانە بە ئەنجام گەیاند[٢٠٤].

١٠٣ك- سیاسەتنامە (سیاسةَ نامە)[٢٠٥].

دوای ئەوەی کە سوڵتانی سەلجوقیی داوای لە زانایـان کـرد کـە کتێبێـك سەبارەت بە سیاسەت بنووسن، کێبەڕکێیەك لە نێوان زانایاندا روویدا، ئـەم کتێبە لەو کتێبانەیە کە ئەو بە داخوازیی پاشا نووسی، ئەم کتێبە لەپـەنجا بەشدا رێکخراوە کە لەودا هەموو مەسەلەکانی سیاسەت باس کراوە، لەوانـە

---

[204] (معجم المـؤلفین، رَضـا کحالـةَ) ب ٣، ل٢٤٩. ئەتلەسـی مێـژووی ئیـسلام دانـراوی حوسـەین موئنیس، ل ٢٣٧.

[205] ئەم کتێبە لـە قـاهیرە بـەبێ هـەبوونی ناونیـشانی خانـەی بڵاوکردنـەوەو سـاڵی چـاپکردنی بـڵاو کراوەتەوە، لە زانکۆی قاهیرە بە ژمارە ٧٧٣١٦/٧٧٢٣٦ پارێزراوە.

چەمكی دادپەروەریی، گرنگیی جێبەجێكردنی دادپەروەریی، بەكارهێنانی دیدی راست و دروست بۆ كۆنترۆڵكردنی وەزیران و كارمەندان، نوسەران، دادوەران، بەرپرسانی كۆكەرەوەی باج و لێكۆڵینەوە لە كارەكانیان، هەروەها كاروباری پەیوەندیدار لەگەڵ هەواڵ، پۆستە، چاودێریی و دەستەبەركردنی ئاسایشی رێگاكان، رێكخستنی هێزی سەربازیی، پێكهێنانی ئەنجومەنی گشتیی و تایبەتیی، چاودێریی كاروباری رەعیەت، دانانی خەزێنەی پاراستنی بنكەكانیان، وەڵامدانەوەی ستەملێكراوان و ماف وەرگرتنەوە بۆیان و دەستەبەركردنی كاروبارەكانیان و دادپەروەریی لەگەڵیاندا و شتی تریش باسكراوەو روون كراوەتەوە.

٦٩ن- (محمد الحميدي) ٤٢٠-٤٨٨ك/١٠٢٩-١٠٩٥ز.

موحەممەد كوڕی فتوح كوڕی عەبدوڵلا كوڕی فتوحی حەمیدی ئەندەلوسیی، فەرموودەناس، قورئانلەبەر، ئوسوڵیی، مێژوونووس، وێژەوان، زانا بە زمانی عەرەبیی، رەچەڵەكی قورتوبییە، لە دورگەی میورقە لە ئەندەلوس لەدایك بووە، لەسەر دەستی ئیبنوحەزمی ((ظاهري)) خوێندوویەتی، هەر لەسەر مەزهەبی ئەویش بووەو لە ئەفەریقا و مەككەو میسر و شام و عێراق زانستی وەرگرتووە و لە بەغداد نیشتەجێ بووە[٢٠٦].

١٠٤ك- ئاڵتوونی داڕێژراوە لە ئامۆژگاریی پاشایاندا (الذهب المسبوك في وَعظ الملوك)[٢٠٧].

---

[206] (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب١١، ١٢١-١٢٢.

[207] (أَبو عبدالرحمن بن عقيل الظاهري) و (د. عبدالحليم عويس) توێژینەوەیان بۆ كردووە، (الرياض، عالم الكتُبْ) ١٩٨٢ز بریتی یە لە ١٠٢ لاپەڕە.

نووسەر لە گۆشەنیگایەکی دەروونناسییەوە دیاردەی سیاسەتی باس کردووە، بەو شێوەیەی کە مەوداکانی باوەڕی فەرمانڕەواو دەست و پێوەندی ئەوی باسکردووە و لەم ڕێگەیەوە چاکسازیی سیستمی سیاسیی گرتووەتە بەر. لەسەر بناغەی ئەمە، ئەو لەسەرەتادا جەختدەکاتەوە لەسەر ڕۆڵی زانایان بۆ ئامۆژگاریی فەرمانڕەوا. ئینجا ئاماژە دەکات بە مەسەلەکانی دادپەروەریی، ئاوەدانیی، راوێژ، ڕێکخستنی دارایی و دەستکەوتنی خەرجییەکانی حکومەت، خۆپاراستن لە هەڵخەڵەتاندنی خەڵك ئەو لە جێگەیەکی تردا (ل١٩٤) رەوەندی گەندەڵیی سیاسی دەبەستێتەوە بە گەندەڵیی فەرمانڕەوا و گوێزرانەوەی بۆ نوخبە سیاسییەکان و لەوێشەوە بۆ تەواوی خەڵکی ئاماژە پیّ دەدات. کاربەدەستانی ستەمکار و پێویستی لادانیان، مەترسی کارمەندانی بەربەست (الحِجابْ) و مەترسییان لەسەر رەعیەت و بوونە بەربەستی هاوڕێیانی فەرمانەڕەوا لە ڕێگەی چاکسازییدا چەند مەسەلەیەکی ترن کە ئەو باسی کردوون.

٧٠ن- (الحسن المرادي) لە ساڵی ٤٨٧ك/١٠٩٤ز. زیندووبووە.

موحەممەد کوڕی حەسەن (الحضرمي) و ناسراو بە موراديی، فەقیهو قسەزان، بێژەر، چویە ئەندەلوس و زانستی تێدا وەرگرت، لە ساڵی ٤٨٧ك دا چوویە قورتووبە، دادوەریش لە بیابانی ئەفەریقیادا وەرگرت[208].

١٠٥ك- کتێبی سیاسەت یا ئاماژە بۆ تەگبیری فەرمانڕەوایی (كِتاب السياسةَ أو الإشارةَ في تَدبير الإمارةَ)[209].

---

208 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٩، ل٨٨.

209 (د.علی سامی النشار) لێکۆڵینەوەی لە سەر کردووە، (دار البَيصاء)، (دار الثَقافةَ) ١٩٨١ز، بریتییە لە ١٠٨ لاپەڕە.

کتێبـی نـاوبراو کـە پێـشنیازێکی سیاسـیی بـۆ پێکهێنـانی دەوڵەتـە پێشکەشی ئەبوبەکری کوڕی عومەر یەکێك لـە ئـەمیرانی (المـرابطین) پـێش یوسف کوڕی تاشفین-کراوە، کە دەوڵەتەکەی لە بیابـانی ئەفـەریقادا بـوو، پێش ئەوەی دەست بە سەر وڵاتی مەغریبـدا بگرێـت، کتێبەکـە بریتییـە لـە نەخـشەیەکی سیاسـیی پێـشکەشکراو بـۆ فـەرمانڕەوا لـە سـەرەتای دروستکردنی دەوڵەتەکەیدا.

نووسەر بە باسکردنی گرنگیی زانـست و هانـدان بـۆ فێربـوونی زانـست و ناسـین، گرنگیـی راوێـژکردن، خەسـڵەتەکانی راوێـژکار، ئاسـتی جیـاوازیی سیاسەت، لەوانە سیاسەتکردنی خودی فەرمانڕەواو سیاسەتی هاوڕێیـانی و نووسـەرانی و بەربەسـتان، جۆرەکـانی پاشـایەتیی و ژیـان هەریەکـەیان، جۆرەکانی خـەڵکی و چـی بەرانبـەری چینەکانیانەو شـتی تـریش لەبابەتـە باسکراوەکانی ئەم کتێبەن.

٧١ن- (..بن...بن علی بن عبدالعزیز بـن حاجـب النعمـان) کۆتاییـەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی بەرانبەر بە سەدەی یانزەهی زاینی.

نووسەر نەناسراوە، کتێبەکەش لە ژێر خانەی نووسەرانی نادیاردا پۆلێن کـراوە، بـەڵام لـە کتێبەکەیـدا جارێـك باسـی بـاپیری بـاوکی ((أبـو الحـسین عبدالعزیز بن حاجب النعمـان)) و جـارێکی تـر باسـی بـاپیری خـۆی دەکـات ((أبو الحسن علی بن عبدالعزیز بن حاجب النعمان)) دەکات باپیری باوکی لە (٣٥١ك/٩٦٢ز) و بـاپیری خۆیـشی لـە ٤٢٣ك بەرانبـەر بـە ١٠٣٢ز کۆچـی دواییان کردووە.

١٠٦ك- زانستی وەزارەت (علم الوَزارةَ).

لەم کتێبەدا رێکخستنی کاروباری کاربەدەستان و وەزیران و ناسینیان و متمانەکانی پاشاو مەرجەکانی دیوانی خراوەتە بەرباس و توێژینەوە[210].

٧٢ن – (أبو حامد الغَزالي) ٤٥٠/٥٠٥ك/١٠٥٨–١١١ز. موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی ئەحمەد، تووسیی، شافیعیی، ناسراو بە غەزالی، حوججەتولئیسلام، حەکیم، قسەزان، فەقیهو ئوسوڵیی، سۆفی، بەشدار لە چەندین جۆری زانستدا، لە (طابران) کە یەکێکە لە گوندەکانی تووس لە خۆراسان لە دایك بووە، بە دوای فیقهدا دەگەڕا و پاش ماوەیەك چوویە نەیشاپوورو چوویە بەردەستی ئیمامی حەرەمەینی جوەینی و لەلای سەرگەرمی وانە خوێندن بوو، پاشان لە کۆڕی کۆبوونەوەی خواجە نیزامولمولکدا بەشداریی کرد، خواجە ئەوی پەسەند کرد و بۆ وانەوتنەوە ئەوی بانگهێشتی خوێندنگەی (نظاميةّ)ی بەغداد کرد، پاش ئەوە دەستی کرد بە خواپەرستیی و گەڕان بەم شێوەیە سەردانی حیجاز، دیمەشق و ئەسکەندەرییەی کرد، پاش ئەوە گەڕایەوە بۆ تووس[211].

١٠٧ك– زێڕی داڕێژراو بۆ ئامۆژگاریی پاشایان (التبر المسبوك في نَصيحةَ الملوك)[212].

کتێبەکە پێشەوا غەزالی بە زمانی فارسیی بۆ سوڵتان موحەممەد کوڕی مەلیکشای سەلجوقیی داناوە، دواتر وەرگێڕاوە بۆ عەرەبیی و تورکیی، غەزالی لە سەرەتادا بەو بەڵگە نەویستانە دەست پێدەکات کە پێویستە لە

210 دەستنووسە لە کتێبخانەی سۆفیای نیشتمانی لە بۆلگاریا، ژمارە: ١٦٩٢.

211 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل٢٦٦.

212 شێخ موحەممەد مستەفا ئەبولعەلا، لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە، قاهیرە: (مكتبةَ الجندي)، بریتییە لە ١٦٥ لاپەڕە.

زەینی وەرگر (المتلقي)دا رەگو ریشەی دابکوتیٚ، وەکو داننان بـە نیعمـەتی خواو مافی هەستان پێی و پێناسەی باوەڕو بیرخستنەوەی سوڵتان بـەوەی ئەویش دروست کراوەو خودا خوڵقێنەری ئەو و بوونەوەریـشەو هتـد. ئینجـا باسی بنـەمانکانی دادگـەریی و دادپـەروەریی (العَدلْ والأنـصاف) دەکـات و دەیکـات بـە دە بنـەماوە، شـوورا و گرنگیـی گـوێگرتن لێـی و داواکردنـی ئامانجەکانی، بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوا بەرانبەر بە خەڵك، غافلٚ نەبوون لـە کاروباری خەڵك بەهۆی نەناسین و نـەزانینی رەوشـت و نەریتیانـەوە، خـۆی سەرگەرمی شەهوەت و ئارەزووبازییـەکان نـەکات، هەوڵـدان بـۆ رازیکردنـی رەعیەت بە رێگەی شەرعیی نـەك بـە دەرچـوون لێـی، پێویـستی بـاوەڕ بـە جیهـانی پـاش مـردن و رۆڵـی ئاوەهـا باوەڕێـك لـە چـاککردنی رەفتـاری دەسـەڵاتدار و رووکردنـە دادگـەریی و دادپـەروەریی و چـاکبوونەوەی بارودۆخی خـەڵك، لـەم نوسـراوەدا باسـکراوە. ئینجـا کتێبەکـەی بـە وتـەی وەزیـران، نووسـەران، چـاودێرانی دادگـەریی و شـێوەی هەڵـسوکەوتیان و پێویست بوونیان کتێبەکەی کۆتایی پیٚ دەهێنیٚ.

١٠٨ك– نهێنیی دووجیهان و دەرخستنی ئەوەی تیایاندایه (سر العـالمين وَ كَشفْ مافي الدارينْ)[٢١٣] .

غەزالی لە پێشەکی ئەم کتێبە (ل٤)دا دەڵێت: لـە جـاری دووەمـداو دوای گەڕانەوەم لە گەشتەکەم، یەکەمین کەسیٚ کە ئەم کتێبەی پەسـەندکردو بـە

[213] شێخ موحەممەد موستەفا ئەبولعولا توێژینەوەی لە سەر کردووە، قاهیرە (مَكتبْ الجندي، د.ت) و بریتییە لە ١١٢ لاپەڕە.

شێوەی نهێنی لـە خوێندنگـەی نیزامیـەی بەغـدا خوێنـدنی پیاوێـك بـوو لـە مەغریب بەناوی ((موحەممەد کوڕی تومرت)) [٢١٤].

کتێبەکە لە سەرەتادا بابەتێکی باسکردووە کە دوای ئەو ئیبنو خەلدوون بە شێوەیەکی قوڵترو وردتـر توێژینـەوەی لـە سـەر کـردووە. بـە بۆچـوونی غەزالی دەستکەوتنی دەسەڵات و پێکهێنانی دەمارگیریی پشتیوانیی بۆی بە رێکخستنی قوتابیان و موریدو شـوێنکەوتوان و وەرگرتنـی متمانـەی ئـەوان دەسـت پێـدەکات و بـە نیـشاندان و پێـشکەشکردنی واقیعـی دەرەکـی و رەخنـەلێگرتنی درێـژە پەیـدا دەکـات. مامۆسـتا دەبـێ لـە چوارچـێوەی هۆکارگـەلێکی دەروونییـدا ئـەوان قەناعـەت پـێ بکـات کـە دەبـێ گـۆڕان درووست ببێت. ئەو لەم زەمینەدا لەگەڵ هەر دەستەیەك لە هاوەڵانی خۆیدا دەبێ رەوشتێکی تایبـەت بگرێتەبـەر، ئەگـەر دەسەڵاتیـشی گرتـە دەسـت، دەبێ ئاوەدانیی، دادپەروەریی و پیشەسازیی بگرێتە بەر. غەزالی پاش ئـەم مەسەلەیە شێوەی بەڕێوەبردنی وڵات، وەزیران، فەرمانـداران، هەڵبـژاردەی سەربازان، نانەوا، قەسـاب و کـارە پێویـستییەکانی خـەڵکی بـاس دەکـات. شـێوەی دڵڕاکێـشانی خـەڵك بـۆ فەرمانبـەرداریی لـە رێگـەی پاککردنـەوەی دەروون و پارێزگـاریی و خواپەرسـتیی فـەرمانڕەواو راهێنـانی دەروونـی خەڵکی لە سەر پارێزگاریی و فێرکردنی شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ هـەموو خەڵك و زیندەوەران و رووەکەکان لە بابەتگەلی جێگەی باسی غەزالییە لـەم کتێبەدا. خاڵێ کە نابێ لێی بێ ئاگابین ئەوەیە کە ئەم کتێبـە بـە هـەبوونی کاریگەرییـەکی زۆر بۆچـی لـە سـەر دامەزرانـدنی دەوڵـەت لـە مەغریبـدا بـە ئەندازەی ((التبر المسبوك)) گرنگی پێ نەدراوە؟

---

214 دامەزرێنەری دەوڵەتی (الموحدین) لە مەغریب.

**١٠٩ك– رسوايي ناواخنييەكان و چاكەی دەرخەران (فضائع الباطنيةَ وَ فَضائل المستظريةَ)[٢١٥].**

**ئەم كتێبەشی پێشكەشی خەليفە ((المستظهر باللە))ی عەبباسی (٤٨٧–٥١٢ك/١٠٩٤–١١١٨ز) كرد. پێشەوايەتيی و رەخنەی بۆچوونی نارِازييەكانی و مەوداكانی و ئەركەكانی روون دەكاتەوە.**

**٧٣ن– (أحمد بن الصَفي الميموني) كۆچكردووی ٥٠٥ك/١١١ز[٢١٦].**

**١١٠ك– ئالّتونی دارِێژراو لە خەسلّەتی پاشاياندا (التبر المسبوك في صفات الملوك).**

**ئەم كتێبەی بۆ (مَلِك الأشرَف) عومەری كوری يوسفی رەسولی نووسی[٢١٧].**

**٧٤ن– (محمد بن اللبانةَ) كۆچكردووی ٥٠٧ك/١١١٣ز.**

**موحەممەد كوری عيسای كوری موحەممەد، ئەللەخمی، دانی، ئەندەلوسی ناسراو بە ئيبنو لەببانە، وێژەوان، شاعير، هەوالّزان، لە ميورقە كۆچی دوايی كردووە[٢١٨] (هاوچەرخی دەولّەتی مورابيتان بووە لە ئەندەلوس).**

---

[215] نادی فەرەج دەروێش لێكۆلّينەوەی لە سەر كردووە. قاهيرە (المكتَبُ الثَقافي)، بريتی يە لە ٢٢٣ لاپەرە.

[216] وەكو ئەوەی ئاگادارېم وەرگێردراوی ئەم كتێبەم دەست نەكەوتووە.

[217] دەستنووسێكە لە مۆزەخانەی بەريتانی، ژمارە ٧٤٦، لەوەش وێنەيەكی لە زانكۆی ئەمەريكی بەيرووت بە ناونيشانی (Mic-A-373) هەيە. هەروەها نوسخەيەكيشی لە مزگەوتی گەورەی سەنعا بە ژمارە: ٢٢٣٣ پارێزراوە.

[218] (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل١٠٨.(الأعلام، الزركلي) ب ٦، ل ٣٢٢.

١١١ك– ڕێکخستنی ڕەفتار لە ڕێوڕەسمی پاشایاندا (نظم السلوك في آداب الملوك). لە پێشەکی و پێنج بەند پێکهاتووە[٢١٩].

٧٥ن – (الطرطوشي) ٤٥١–٥٢٠ك/١٠٥٩–١١٢٦ز.

موحەممەد کوڕی وەلید کوڕی موحەممەد کوڕی خەلەف کوڕی سولەیمان، فەهریی، مالیکیی، ناسراوە بە تەرتوشی، بە ئیبنو ڕەندەقەش ناسراوە، فەقیهـ و ئوسولّی، فەرموودەناس، توێژەری قورئان، لە (طرطوشە)ی ئەندەلوس لەدایك بووە و هەر لەوێش پێگەیشتووە، بەرەو خۆرهەڵات کۆچی کردووە، چووەتە بەغدادو بەسرەو لە شام نیشتەجێ بووەو دواتر چووەتە ((قودس)) و لە ئەسکەندەرییەش کۆچی دوایی کردووە[٢٢٠].

١١٢ك– چرای پاشایان (سراج المُلوك)[٢٢١].

ئەم کتێبە پێشکەشی ئەبو عەبدوڵلا موحەممەدی ئەمەویی کراوە، نووسەر ئەم کتێبەی کردووە بە شەست و چوار بەندەوە، بە پێگەی زانایان و چاکەخوازان لە لای فەرمانداران و دەسەڵاتداران دەستی پێکردووە، پاشان گرنگیی هەبوونی فەرمانڕەواو سوودەکانی و زیانەکانی دیاری دەکات، هەروەها ئەو خەسڵەتانەی کە پێویستە بۆ پەیوەندیی نێوان فەرمانڕەواو ڕەعیەت تۆمار بکرێن، ئەو بناغانەش کەشەرع بۆ ڕێکخستنی

---

219 دەستنووسێکە لە خەزێنەی حەسەنی لە (رِباط) بە ژمارە: ٨٧٩٧ لە چوارچێوەی کۆمەڵی (١)، هەروەها (كَشف الظنون)ی حاجی خەلیفە لە لاپەڕە ١٩٦٣دا.

220 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١٢، ل ٩٦.

221 لە قاهیرە بە بێ لێکۆڵینەوە بلاوکراوەتەوە، (المطبعةَ الأزهريةَ) ١٣١٩ك، بریتییە لە ١٨٠ لاپەڕە.

دەوڵەت و وڵات، هەروەها باسی ئاوابوونی دەوڵەتان و رووخانیان و هۆکاری مانەوەو دامەزراوییان دەکات و جەخت لەسەر گرنگیی زانست و ژیریی و بەها رەوشتی و دادگەریی و راوێژ دەکات، وەکو بناغەی چاکسازیی دەوڵەت و بەردەوام بوونیان، دواتر بە جیاو بە دوورو درێژی باسی دامەزراوەکانی دەوڵەت دەکات، بە فەرمانداران و دادوەران و رۆڵیان لە دەستەبەرکردنی دادپەروەرییدا، پاشان باسی وەزیران و فەرماندەی سەربازان و بەرپرسانی خەراج و خەزێنە (بيت المال) و دیوانە جیاجیاکان و ژیانی گەورە کاربەدەستان و پێویستی تێگەیشتنیان لە حوکمە شەرعییەکانی ئەهلی زیممە (ذمة) دەکات، هەروەها ئەو خەسڵەتە پێویستانەش کە دەبێ لە کاربەدەستاندا هەبێت و ئەو مەرج و بەڵێنانەی کەپێویستە لێیان وەربگرێت وەربگرێت و مەترسیی وەرگرتنی بەرتیل و دیارییان بۆ باس دەکات و بە باسی مەترسیی ستەم و بەدەمەوەهەڵبەستن و دووڕوویی (النَميمةَ) و بوختانکردن (السعايةَ) باسەکەی کۆتایی پێ دەهێنێ.

٧٦ن– (أبو الحسن علي بن محمد الأهوازي الحَنَفي) لە ساڵی ٥٤٢ك/١١٤٧ز دا لە ژیاندا بووە[٢٢٢].

١١٣ك– ئاڵتونی داڕێژراو بۆ تەگبیری پاشا یا چاککردنی سەرۆکایەتیی و رێکخستنی سیاسەت (التبر المنسبك في تدبير الملك أو تَهذيب الرياسةَ وَ ترتيب السياسةَ)[٢٢٣].

---

[222] وەرگێڕدراوم دەست نەکەوت، زۆر ناوهەن کە نازناوی (ئەهوازی) یان هەڵگرتووە، لەناویاندا ئەم ناوەم پەیدا نەکرد، ئەوەشم نەدی کە ئەم کتێبە درابێتە پاڵ هیچ کامەیان، ئاشکرایە کە میسرییە، چونکە بە زۆری جەخت لە سەر کشتوکاڵ دەکاتەوە لەو وڵاتەدا.

ئەم کتێبە دابەش کراوە بۆ حەوت بەند، کە تیایدا چەمکی ژیریی (عقیل) و چۆن کە ژیریی بناغەی پێسپاردن و داوالێکردن (التکلیف)ە، پاشان پێویستی راوێژو دادگەریی و ئەوەی پێویستە لە سەر فەرمانداران کە کاری پێ بکەن و ئەوەش کە پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن، ئینجا باسی مەترسی کاربەدەستانی بەربەست (حِجابْ)ی دەسەڵاتدار دەکات، کە ئەو لە رەعیەت دادەبڕن، گرنگیدان بە چاککردنەوەی پردو کشتوکاڵ و بەسەرکردنەوەی رەعیەت و جەماوەر بە تایبەتی لە کاتی گرانییدا، باسەکانی ئەم کتێبە پێکدەهێنن.

٧٧ن– (عدنان العين زربي) کۆچکردووی ٥٤٨ك/١١٥٣ز.

عەدنان کوڕی میسر کوڕی مەنسورولعەین زربی، پزیشك، حەکیم، ئەستێرەناس و خەڵکی عەین زربە لە تورکیا، لە بەغداد نیشتەجێ بووە سەرگەرمی پیشەی پزیشکیی و زانستەکانی حیکمەت بە تایبەتی ئەستێرەناسیی بووە، دواتر چووە بۆ سەر زەویی میسر و خزمەتی خەلیفەکانی کردو هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد[٢٢٤].

١١٤ك– نامەیەك لە سیاسەتدا (رسالةَ في السياسةَ)[٢٢٥].

---

[223] لە قاهیرە چاپکراوە، (مَطبعةَ التمدن) ١٣١٧ك/١٩٠٠ز، پاشان لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەمە کتێبی (التحفةَ الملوكيةَ في الآداب السلطانيةَ)ی ئەبولحەسەنی ماوەردییە، لێکۆڵینەوەی د. فوئاد عەبدولمونعیم ئەحمەد، ئەسکەندەرییە، (مؤسسةَ شَباب الجامِعةَ) ١٩٧٧ز، لە دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، ژمارە: ٦٦٩ د، توێژەر بۆی دەرکەوتووە کە دەقەکە هەمان دەقی (التبر المنسبك)ی ئەهوازییە.

[224] (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٦، ل ٢٧٣.

[225] دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمارە: ١٦ (إجتماع تيمور) مایکرۆ فیلم ٢٧١٤٣ بە بێ دانەر، بڕوام وایە کە کتێبێکی تر بەو ناونیشانەو ئەوەی ئەو باسەی کردووە دەست ناکەوێت جگە

٧٨ن– (أحمد بن عبدالله بن عبدالرؤوف الأندلسي) لە کۆتایی سەدەی پێنجەم و سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوە[٢٢٦].

١١٥ك– نامەیەك بۆ ڕێوڕەسمی حەسبەو کاربەدەستانی (رسالة في آداب الحسبةَ وَ المُحتَسِبْ)[٢٢٧].

تیایدا بە وردیی و بە درێژایی باسی دامەزراوی حەسبە وەکو دامەزراوەیەکی چاودێریی لە ناو کۆمەڵگەدا باسی دەکات کە هەموو بوارەکانی چالاکیی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی دەگرێتەوە کە لە سەردەمی هاوچەرخدا لە ژێر خانەی زاراوەی سیاسەتە گشتییەکاندا جێگەی دەکرێتەوە.

٧٩ن– (محمد بن أحمد بن عبدون النجيبي الأندلسي الإشبيلي).

لە کۆتایی سەدەی پێنجەم و سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوە[٢٢٨].

١١٦ك– نامەیەك لە دادگەری و حەسبەدا (رسالةَ في القَضاء وَ الحَسبةَ)[٢٢٩].

---

لە کتێبی ئیبن سینا نەبێت، ئەم دەستنووسەش ئەوە نییە. خاوەنی (هديةَ العارفين)یش لە ب ١، ل ٦٦٢ دا باسی کردووە.

226 وەرگێڕدراوێکم بۆ نەدۆزرایەوە. عەبدوڕڕەحمان فاسی لە کتێبەکەیدا (خطةَ الحسبةَ في النَظَر وَ التَطبيق وَ والتَدوين) بڕوای وایە کە ئیبنو عەبدوڕەئوف پێش ئیبنو عیدون ژیاوە لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچییدا، پاش ئەوانیش ((السَقطي المالِكي)) هاتووە هەر بۆیە بەم شێوەیە ڕیزکم خستن. (دار البَيضاء: دار الثَقافةَ ١٩٨٤ز).

227 لیڤی پرۆڤینسال بلاوی کردووەتەوە، قاهیرە، پەیمانگای فەرەنسیی بۆ کەلەپووری خۆرهەڵاتیی (١٩٥٥ز)، بریتییە لە ٤٦ لاپەڕە.

228 وەرگێڕدراوێکم بۆ نەدۆزرایەوە، جگە لەوەی کە پێشتر عەبدوڕەحمان فاسی ئاماژەی پێدابوو.

بــە پێــشەکییەك ســەبارەت بــە دادگــەریی و چاکــسازیی و دژایــەتیی گەندەڵیی و رۆڵی سەرۆك کـە بریتییـە لـە تـەوەر و چـەقی ئـەو بازنـەی کـە ســەلامەتیی و بــەردەوامیی جگــە بــە بــەردەوامیی چــواردەوری بازنەکــە دەستەبەر نابێت وتەی خۆی دەست پێکـردووە، لـە سـەر زانایـان و ئـەهلی زانـست بـە پێویـستی دەزانێـت کـە رەوشـتی فـەرمانڕەوا لـە سـەر بنـەمای شایستەی بخەنە ژێـر ئەزموونـەوە. ئیبنوعەبـدون پاشـان بـە رۆڵـی راوێـژ و مەترسـییەکانی رای خۆپەسـەندی ئامـاژە دەکـات و لـە بەنـدی چـاندن و سیاسـەتی کـشتوکاڵی دەوڵەتـدا پەیوەنـدیی دروسـت دەکـات لـە نێـوان دادوەریی و چاودێریی خەزێنە و یارمەتییدەران و دەسـت و پێوەندیـەکان و فەرمانڕەوا، ئینجا بە هەمان شێوە باسی دامەزراوە و ئۆرگانەکانی دەوڵـەت هەروەکو وەزارەت، شارەوانی، حەسبە، پاسەوان، خاوەنی میراتەکان.

٨٠ن– (أبـو عبـدالله محمـد بـن أبـي محمـد الـسَقطي المـاِقي الأندَلُـسي) کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەم و سەرەتاکانی سەدەی شەشەمی کۆچی[٢٣٠].

١١٧ك– رێوشوێن و چەمکەکانی حەسبە (آدابْ الحَسْبَةَ)[٢٣١].

نوسەر پاش ئەوەی لە سەرەتادا لە حەسبەو بەرپرسی حەسبەو مەرج و تایبەتمەندییــەکانی و ئەرکــەکانی ئــەم ئۆرگانــە قــسە دەکــات، راســتەوخۆ دەچێتە ناو باسی دەرمـانی ژیـان و گەندەڵییـە کۆمەڵایـەتیی و سیاسـیی و ئابوورییەکانەوە.

---

229 لیڤی پرۆڤینسال بلاوی کردووەتەوە لەگەڵ نامەی پێشوودا و لە (٦٥) لاپەڕە پێك دێت.

230 وەرگێڕدراوم دەست نەکەوت جگە لەوە نەبێت کە عەبدوڕەحمان فاسی پێشتر ئاماژەی پێکرد.

231 لیڤـی پرۆڤیــسنال بــلاوی کردووەتــەوە لــە پــاریس، بــە بــێ مێــژوو، بریتییــە لــە ٧٢ لاپــەڕە، دەستنووسێکیشی لە زانکۆی قاهیرە بە ژمارە ٢٤٢٥٤ پارێزراوە.

٨١ن- (إبن حمدون) ٤٩٥-٥٦٢ك/١١٠٢-١١٦٢ز.

موحەممەد کوڕی حەسەن کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەمدونی بەغدادیی وێژەوان، شاعیر، نووسەر، مێژوونووس و نزیك لە ((مستنجد العباسي)) بوو، موستەنجد دیوانی زمامی پێ سپارد و نازناوی ((کافي الکفاءة))ی دایە، ناوبراو لە چەند مەسەلەیەکدا سەرپێچیی لە خەلیفە کرد کە لە ((تَزکرةَ))دا ئاماژەی پێداوە، خەلیفە دەستگیر و زیندانیی کرد، ئینجا هەر لە دوای ئەوە لە بەغداد کۆچی دوایی کرد[٢٣٢].

١١٨ك- بیرخەرەوەی حەمدوونی (التذکرة الحمدونيةَ)[٢٣٣].

ئەم کتێبە هۆکاری زیندانییکردن و مەرگی نووسەرەکەی بووە. تەنها بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەی لە سەر کراوە، کە نووسەر لەوێدا چەند باسی جۆراوجۆری یاسا دونیاییەکان، پاککردنەوەی دەروون کە پێویستە لەسەر فەرمانڕەواو فەرمانداد و ماف پێویستی رەعیەت لە سەر فەرمانڕەوا، خەسڵەتەکانی دەسەڵاتدار، کارگێڕیی وەزیران و نزیکانیان بە هەبوونی جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا، باسی کردووە، بەڵام لەو بەندانەی کە توێژینەوەکەیان لە سەر نەکراوە، هەروەکو: راوێژ و رادەربڕین، ستەم و دادگەریی، دووریی فەرمانڕەوا لە رەعیەت و ئەو مەترسییانەی لێی دەکەونەوە.

٨٢ن- (إبن ظفر الصقلي) کۆچکردووی ٥٦٨ك/١١٧٣ز.

---

232 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٩، ل ٢١٧.

233 دکتۆر ئیحسان عەبباس توێژینەوەی لەسەر کردووە. بەیرووت: (معهد الانهاء العربي) ١٩٨٣ز، هەروەها پێشتر لە قاهیرە چاپکراوە (مكتبةَ الخانجي) ١٩٢٧ ز، بەندی یەکەم و دووەم بە ناونیشانی (تذكرة ابن حمدون)، (السياسةَ وَ الآداب الملوكيةَ)).

ئەبوعەبدوڵڵا موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی قوڕەشی ناسـراو بە (إبن ظفر الصقلي)، حوججەتوددین، نەحویی[234].

١١٩ك– سەبووریی گوێڕایەڵییکراو بۆ خۆ و دوژمنەکانی (سلوان المطـاع في عدوان الطباع)[235].

بۆ هەندێ لە فەرماندەکانی دورگـەی سـقلیەی نووسـی لـە سـاڵی ٥٥٤ی کۆچیدا، سەردەمی حوکمی موسڵمانان تیایدا، پاشان لە لایەن ((تاج الـدين أبو عبدالله عبدالله بـن علـي الـسنجاري (کۆچـکردووی (٧٩٩ك) – کـراوە بـە شیعر. ئەم نووسینە لە پێـنج بەنـدو بـەش و سـەرەتایەك پێکـدێت، لەسـەر زمـانی باڵنـدەو دڕندەکانــەوە مەســەلە سیاسـییەکان پێـشکەش دەکـات، دواتریش ئەم کتێبە لە ژێر ناونیشانی ((رياض الملوك في رياضات الـسلوك)) بۆ زمانی فارسیی وەرگێڕدراوە.

٨٣ن– (عبدالله المالقي) کۆچکردووی ٥٧٤ك/١١٧٨ز.

عەبدوڵڵا کوڕی موحەممـەد کـوڕی عیـسای ئەنـساری، ئـەبو موحەممـەد مالقی، بنەچەی لە مالیقەی ئەندەلوسەوە هاتووەو لە مـەراکیش نیـشتەجێ بووە، پلەو پایەیەکی باشی لـە لای خەلیفـە (عبـدالمؤمن) و خەلیفـە ((أبـی یَعقوب)) هەبووە[236].

---

234 (كَشف الظنون، حاجی خليفه)، ل ٩٩٨.

235 دەستنووسـێکە لـە کتێبخانـەی ئـەوقافی سـلێمانی (عێـراق)، ژمـارە: (ن/مجـاييع ١٨٥-١٩٠) لەوێشەوە نوسخەیەکی لە مۆزەخانەی بەریتانیادایە ١٥٣، نوسخەیەکیش لە (جوتا) لە ئەڵمانیایە بە ژمارە: ٢٦٨٨ ئەمە لە قاهیرە چاپ کـراوە (١٢٨٧ ك)، هـەروەها لـە تـونس: ١٢٧٩ ك، بـەیرووت: (١٣٠٠ ك)، هەروەها وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و ساڵی ١٨٥١ ز چاپکراوەو بریتییـە لـە ١٦١ لاپەڕە.

236 (الأعلام، الزركلي) ب ٤، ل ١٢٣.

١٢٠ك– ئەستێرەكانی سیاسەت (أنجم السياسةَ)[٢٣٧].

قەسیدەیەكی شیعرییە و لە شێوەی ئەلفیەی ئیبنو مالیكدا و لە ٩٩ دێڕدا دانراوە، كە سەرەتاكانی سیاسەت، دادگەریی، راوێژ بە زانایان، نەهێشتنی مەودا لەگەڵ رەعیەت، چاودێریی لە بەرژەوەندییەكانی خەڵك، گرنگیدان بە زانست و كتێب بە شێوەیەكی كورت لەوەدا باس كراوە.

موحەممەد كوڕی عەبدوڵڵا (زیندوو لە ١٢٠٥ك) لە كتێبەكەی خۆیدا ((الماهِب الرَبانيةَ في شرح قَصيدةَ السياسة السلطانيةَ)) ئەو قەصیدەی راڤە كردووە[٢٣٨].

٨٤ن– (إبن الجوزي) ٥١٠–٥٩٧ك/١١١٦–١٢٠١ز.

عەبدوڕڕەحمان كوڕی عەلی كوڕی جەعفەری تەمیمی بەغدادیی حەنبەلیی، ناسراو بە ئیبنولجەوزیی، فەرموودەناس، قورئانلەبەر، توێژەری قورئان، فەقیهو و ئامۆژگار، وێژەوان، مێژوو نووس و بەشدار لەچەند جۆرو زانستدا، لەبەغداد لەدایك بووەو هەرلەوێش كۆچی دوایی كردووە[٢٣٩].

١٢١ك– چاكبوونەوە لە ئامۆژگاریی پاشاو خەلیفەكاندا (الشفاء في مواعظ الملوك وَ الخُلَفاء)[٢٤٠].

كتێبەكە لە دە بەند پێكهاتووە، تیایدا باسی شەرەفی فەرمانڕەوایی و مەترسییەكانی و گرنگیی دادگەریی و مەترسیی ستەمكاریی دەكات،

[237] دەستنووسێكە لە گەنجینەی حەسەنییدا لە ریبات، ژمارە: ٥٤٢٤ (مجموعةَ ٢) هەروەها عەبدوڵڵا كنون لە گۆڤاری كۆڕی زمانی عەرەبی لە دیمەشق بڵاوی كردووەتەوە.

[238] دەستنووسێكە لە گەنجینەی حەسەنییەدا لە ریبات، ژمارە: ١٢٤٩٥ ز (مجموع ٧).

[239] (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٥، ل ١٥٧.

[240] د.عەبدولمونعم ئەحمەد راڤەی كردووە، ئەسكەندەرییە، (مؤسسةَ شَبابْ الجامِعةَ) ١٩٧٨ ز بریتییە لە ١٣٦ لاپەڕە.

ئەوەش کە پێویستە لەسەر دەسەڵاتدار بەکاری بهێنێت لە مامەڵەدا لەگەڵ چینە جۆربەجۆرەکانی خەڵکدا، ئینجا باسی مەسەلەکانی تێکۆشان لە ڕێی خوادا (الجهاد) دەکات و چیرۆکی ژیانی هەندێ لە دەسەڵاتداران بە تایبەتی خەلیفەکانی ڕاشیدین پێشکەش دەکات، کۆتایی کتێبەکەش بەوە دەهێنێ کە زۆر گرنگە ئامۆژگاریی پاشایان بکرێ، بانگ بکرێن بۆ پارێزگاریی و نزیککەوتنەوە لە چاکخوازان و پارێزگاران.

٨٥ن- (شیث (شبیب) بن الحاج) ٥١٠-٥٩٨ك/١١١٦-١٢٠٢ز.

شیس یا شەبیب کوڕی ئیبراهیم کوڕی موحەممەد کوڕی حەیدەرە قەنناوی قەفەتیی ناسراو بە ئیبنولحاج، وێژەوان، نەحویی، زمانەوان، شیعرناس، فەرموودەناس، لە گوندی (قفط) لە گوندەکانی (صعید)ی میسر لەدایك بووەو لە ئەبو تاهیری سەلەفیی ئەوانی تریش زانستی زۆری وەرگرتووە، فەرموودەی گێڕاوەتەوەو وانەشی وتووەتەوە[٢٤١].

١٢٢ك- پاككردنەوەی زەینی بانگخواز بۆ چاكسازیی ڕەعیەت و شوان (تزیب ذهن الراعي في إصلاح الرَعیةَ وَ الراعي).

ئبنولحاج ئەم کتێبەی بۆ سەلاحەددینی ئەیوبیی نووسی[٢٤٢].

١٢٣ك- میهرەبانییەکانی سیاسەت لە فەرمانەکانی سەرۆکایەتییدا (لطائف السیاسةَ في أحکام الریاسةَ)[٢٤٣].

٨٦ن- (بَدل بن اسماعیل التبریزي) لە ساڵی ٦٠١ك/١٢٠٥ ز دا زیندوو بووە. فەرموودەناس و قورئانلەبەر بووە[٢٤٤].

---

241 (معجم المؤلفین، رَضا کحالةَ) ب ٤، ل ٣١١. (هدیةَ العارفین، البَغدادي) ب ١، ل ٤١٩.

242 (کَشفْ الظنون، حاجي خلیفةَ) ل ٥١٥. (هدیةَ العارفین، البَغدادي) ب ١، ل ٤١٩.

243 (معجم المؤلفین، رَضا کحالةَ) ب ٤، ل ٣١١.

١٢٤ك– ئامۆژگـاریی بـۆ ڕەعیـەت و فـەرمانڕەوا (النَـصيحةَ للراعـي وَ الرَعيةَ)[245].

٨٧ن– (أحمد الذَهبي الأندلسي) ٥٥٤–٦٠١ك/١١٥٩–١٢٠٤ ز.

ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی حەسەن کوڕی عەتیق کە ناسراوە بە ((الذَهبي))، فەقیهو فەرموودەناس و وێژەوان، لە ((بلنسيةَ)) لە دایك بووە و لە ((تلمسان)) کۆچی دوایی کردووە[246].

١٢٥ك– دەستەواژەی جـوان لـە پلەوپایـەی خیلافـەت و فەرمانڕەواییـدا (حسن العبارة في فضل الخلافةَ وَ الأمارةَ)[247].

٨٨ن– (أسعد بن مماتي) ٥٤٤–٦٠٦ك/١١٤٩–١٢٠٩ ز.

ئەسـعەد کـوڕی موهـەزەب کـوڕی مینـا کـوڕی زەکـەریا کـوڕی مـەماتی ئەبولمـەکارم، نووسـەر، وێـژەوان، شـاعیر، بەشـدار لـە زانـستە جۆراوجۆرەکاندا، لە مەسیحییەکانی ئەسـیوتە لـە سـەعیدی میـسر، بـاوکی بەرپرسی دیوانی سوپا بووەو دوای ئەوەش ئـەم جێگـەی گرتووەتـەوە، لـە سـەردەمی سـەڵاحەددیندا سـەرۆکایەتی دیوانـەکانی لـە میـسردا پـێ سپێردراوە، لەگەڵ ئەم کتێبەشدا کتێبێکـی لـەژێر ناونیـشانی ((حجـةَ الحَـق على الخلق في التحذير وَ سوء عاقبةَ الظلم)) نووسیوە[248].

---

244 (معجم المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٣، ل ٤٠.

245 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمـارە: ٣٤٦ (حـديث تيمـور)، مـایکرۆفیلم ژمـارە: ١١٧٩٥، بریتییە لە ٨٠ لاپەڕە.

246 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٢، ل ٩٠.

247 (هديةَ العارفين، البَغدادي) ب ١، ل ٨٩، (أعلام المؤلفين، رضَا كحالةَ) ب ٢، ل ٩٠.

248 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٢، ل ٢٤٩.

**١٢٦ك– یاسای دیوانەكان (قوانين الدواوين)[٢٤٩].**

**ئەم كتێبەی پیشكەشی مەلیك عەزیز عوسمان كوڕی سەلاحەددینی ئەیوبیی كردووە، كە لە پانزە بەند پێكهاتووە، بە قسەكردن لەسەر فەزڵ و پلەوپایەی نووسین و نوسەران (سەرۆكی دیوانەكان) و ئەوەی كە پێویستە هەیان بێت و لە سەریانبێت دەست پێدەكات، ئینجا باسی جوگرافیای سیاسیی ئابووریی میسر و دابەشبوونە كارگێڕییە گەورە بچووكەكان دەكات، دواتر، باسی حوكمەكانی زەوی و رێكخستنی داهات (خەراج) یان دەكات، پاشان رەخنە لە گەندەڵیی كارگێڕیی و مامەڵەی دیوان و سوڵتانی سەردەمی خۆی دەگرێت و دواتر بە وردیی و دوورودرێژیی و رەخنەییانە باسی دیوانەكانی دەوڵەت و ئۆرگانە پەیوەندیدارەكان دەكات.**

**٨٩ن– (علي بن ظافرين الحسين الأزدي) ٥٦٥–٦١٣ك/١١٧٠–١٢١٦ ز.**

**فەقیهێكی میسریی مالیكیی، قسەزان، مێژوونووس هەوالْزان، وێژەوان و رێكخەر، سیاسیی، لەپێشدا وەزیری ((ملك الأشرف)) موسا كوڕی ((ملك العادل)) بووە، پاش ئەوە وازی لە وەزارەت هێناوەو گەڕاوەتەوە و لەوێ كۆچی دوایی كردووە[٢٥٠].**

**١٢٧ك– بناغەی سیاسەت (أساس السياسةَ)[٢٥١].**

**٩٠ن– (يعقوب المنجنيقي) ٥٥٤–٦٢٦ك/١١٥٩–١٢٢٩ ز.**

---

249 (د. عزیز سوریال عطيةَ) لێكۆڵینەوەی لە سەر كردووە، (مَطبعةَ مصر) ١٩٤٣ ز لە سەر ئەركی ئەمیر (عمر طوسون)ی سەرپەرشتی كۆمەڵەی كشتوكاڵی پاشایەتیی چاپ كراوە. بریتییە لە ٣٢٢ لاپەڕە.

250 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٧ ل ١١٣.

251 (كَشف الظنون، حاجی خليفةَ)، ل ٧٤. (هديةَ العارفين، البغدادي)، ب ١، ل ٧٠٦.

یەعقوب کوڕی سابر کوڕی بەرەکات کوڕی عەمماری حەڕانی، بەغدادیی مەنجەنیقی، شاعیر، رەگەزی دەگەڕێتەوە بۆ ((حەڕان)) و لە بەغداد لەدایکبووە، لە سەرەتادا سەرباز بووە، دواتر لە پیشەی دروستکردنی مەنجەنیق ((ئامێر و چەکێکی جەنگییە))دا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە[252].

١٢٨ك– توێژینەوەی رێگەوان بۆ سیاسەتی پاشایان (عمدةَ السالك في سياسةَ الممالِك)[253]. ئەم کتێبەی تەواو نەکردووە.

٩١ن– (القلعي) کۆچکردووی ٦٣٠ك/١٢٣٣ ز.

موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو عەلی قەلعی، زانایەکی بەشداربوو لە هەندێ زانستدا، لە ((مرياط))، (کە یەکێکە لە شارەکانی کەنار دەریای ناوچەی (ظفار) لە یەمەن و هاوسنوورە لەگەڵ سەڵتەنەی عومان) کۆچی دوایی کردووە[254].

١٢٩ك– چاکسازی سەرۆکایەتی و رێکخستنی سیاسەت (تَذهيب الرياسةَ وَ ترتيب السياسة)[255].

سەرەتاکەی بە باسی گرنگیی پێشەوایەتیی و هۆکارەکانی پێویستیی بە هەبوونی فەرمانڕەوا، ئینجا باسی چەمکی دادگەریی و پاداشتی پێشەوای دادپەروەر و باروکۆڵی سەرشانی پێشەوای ستەمکار دەکات،

252 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١٣، ل ٢٥٠.

253 (كشف الظنون، حاجي خليفة)، ل ١١٦٧.

254 (أعلام المؤلفين، رَضا حكالةَ) ب ١٠، ل ٣١٧.

255 ئیبراهیم یوسف موستەفا راڤەی کردووە، (الزَرقاو) ئەردەن، (مكتبة المنار) ١٩٨٥ ز، بریتییە لە ٣٢٢ لاپەڕە، هەروەها وەکو دەستنووس لە (دار الكتبةَ المصريةَ) و (رفاعةَ الطَهطاوي) لە سوهاج لەژێر ناوی (إبن دَجاجةَ) دایە، ناوبراو لەبەری گرتووەتەوەو دانەری نییە.

ئەوەش پێویستە لە سەر رەعیەت لە فەرمانداری فـەرمانڕەوایان و ئـەوەی پێویستە لە سەر دەسەلاتدار لە چاك رەفتـاری لـە سیاسـەتدا. دوای ئـەوە باسـی راوێـژو مەترسـیی ئیـستیبداد لـە رای خـۆ پەسـەندیی و مەترسـی بەربەستان لە نێوان رەعیەت و فەرمانڕەوادا باس دەکات. هـەروەها باسـی چۆنیەتی هەڵبـژاردنی وەزیـران و فەرمانـداران دەکـات و ئـەوەی پێویـستە لەسەریان بۆ پارێزگاریی لە جەماوەر و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان.

بەشـی سـێیەمی کتێبەکـەی تـەرخان کـراوە بـۆ فـەزڵ و پلـە و پایـەی خەلیفەو وەزیرانی پێشوو، لـە معاویـەوە دەسـت پێـدەکات هـەتا دەوڵـەتی عەلەویی لە تەبەرستان، کە گەشـتێکە بـەناو چاکترین کاریانـدا بـۆ ئـەوەی خوێنـەرانی قەناعـەت پـێ بکـات کـە مێـژوو کـوورەو وەرشـەی تەجروبـەی مرۆییە.

٩٢ن- (علي بن الأثير) ٥٥٥-٦٣٠ك/١١٦٠-١٢٣٣ ز.

عـەلی کـوڕی موحەممـەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی عەبدولکـەریم کـوڕی عەبدولواحیـدی شـەیبانی موسـڵی ناسـراوە بـە (إبـن الأثـير الجـزري)، فەرموودەناس، پارێزەری قورئان، وێـژەوان، زمانـەوان، رەوانبێـژ (بیـانی)، رەگەزناس، لە جەزیرەی ئیبنو عومەر لەدایك بووەو لـە موسـڵدا نیـشتەجێ بووە، ئینجا چووە بۆ شام، کتێبـی (الكامـل في التـأريخ)ی هەیـە، هـەروەها کتێبی ((الجِهاد))یشی هەیە[٢٥٦].

١٣٠ك- رێوڕەسمی سیاسەت (آداب السياسةَ).

[256] (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٧، ل ٢٢٨.

ئیبراهیم کوڕی یوسفی حەنبەلیی حەڵەبیی (کۆچکردوو لە ٩٥٩ک دا) لـە کتێبەکەیدا بەناوی ((مَـصابیح أربـاب الـسیاسةَ وَ مَفـاتیح أبـواب الکیاسـةَ)) کورتی کردووەتەوە[٢٥٧].

٩٣ن– (جمـال الـدین بـن أبـي حجـة) لـە سـەدەی حەوتـەمی کۆچـی و سیانزەهەمی زاینییدا ژیاوە[٢٥٨].

١٣١ک– سیاسەتداری رەعیەت (رعایة الرعیة)[٢٥٩].

بابەتی ئەم کتێبە سەبارەت بە کاروباری خەڵکە لـە جـەنگ و ئاشـتیدا و پێشکەش کراوە بە سوڵتان کامـل موحەممـەد (یەکێکـە لـە فـەرمانڕەوایانی ئەیوبیی لـە میـسر) کـە لـە مـاوەی ٦١٥–٦٣٥/١٢١٨–١٢٣٨دا فـەرمانڕەوا بووە.

٩٤ن– (عبدالله بن حمویةَ) ٥٧٢–٦٤٢ک/١١٧٧–١٢٤٤ ز.

عەبدوڵڵا کوڕی عومەر کوڕی عەلی کـوڕی موحەممـەد کـوڕی حەمەویـەی دیمەشقی، سەرەخسی، شافیعی، زانایـەکی بەشـدارە لـە مێـژوو فیقهـو دوو ئوسوڵەکە (ئوسوڵی فیقهو ئوسوڵی دین)، نامەنووس و ئەنـدازەو پزیـشکیی و فـەرموودە، لـە دیمەشـق لـەدایك بـووە و چـووە بـۆ وڵاتـی مـەغریب، لـە مەراکیش پەیوەنـدیی کـردووە بـە مـەلیك مەنـسور یـەعقوب کـوڕی یوسـف کوڕی عەبدولمو‌ئمین، ئینجا چووتە میسرو زانستی فەرموودەی خوێنـدووەو لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە[٢٦٠].

---

257 (کَشف الظنون، حاجی خلیفةَ) ل ٤٢، (هدیةَ العارفین، البغدادي) ب ١، ل ٧٠٦.

258 وەرگێڕدراوم دەست نەکەوت سەبارەت بە ژیانی ناوبراو.

259 دەستنووسێکە لە گەنجینەی حەسەنی لە ریبات، ژمارە: ٦٨٩٥، بریتییە لە ١٠١ لاپەڕە.

260 (أعلام المؤلفین، رَضا کحالةَ) ب ٦، ل ٩٦.

١٣٢ك– سیاسەتی پاشایانە (السياسة الملوكية) ئەمەی نووسیووە بۆ ((مَلِك الكامل محمد)) کە لە ٦١٥–٦٣٥ك/١٢١٨–١٢٣٨ ز دەسەڵاتی گرتووەتە دەست[٢٦١].

٩٥ن – (إبن الحاج الإشبيلي) کۆچکردووی ٦٤٧ك/١٢٤٩ ز. ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی ئەحمەدولئەزدی ئیشپیلیی کە بە ئیبنولحاج ناسراوە، نەحوی و بەشدار لە هەندێ زانستدا[٢٦٢].

١٣٣ك– پێشەوایەتی (الإمامة)[٢٦٣].

٩٦ن – (محمد بن طلحةَ القرشي) ٥٨٢–٦٥٢ك/١١٨٦–١٢٥٤ ز.

موحەممەد کوڕی تەلحە کوڕی موحەممەد کوڕی حەسەنولقرشی، عەدوی نەسیبی، شافیعی، فەرموودەناس، فەقیهو ئوسوڵی، شارەزا لە زانستی پیت و ئەوقاف، لە نەیشاپوور لە لای ((المؤيد)) و ((زينب الشعرية)) وانەی خوێندو لە نەسیبین دادوەری وەرگرت و پاشان بوویە وتاربێژی (خَطيب)ی دیمەشق. وەکو نێردراوی پاشایان (باڵیۆز) دەنێردرا بۆ زۆر ناوچە و شوێن سەردانی کردووە. کاتێ کە وەزارەتیان پێ سپارد پۆزشی هێنایەوەو وەری نەگرت.

بەڵام لەویان قبوڵ نەکرد، بە ناچاریی دوای دوو رۆژ وەری گرت، پاشان هەموو دارایی خۆی بەجێ هێشت و چوو بۆ حەج، پاشان لە دیمەشق مایەوەو لە حەڵەب کۆچی دوایی کرد[٢٦٤].

---

261 (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ١، ل ٤٦١. (إيضاح المكنون، البغدادي)، ب ٢، ل ٣٢.

262 (أعلام المؤلفين، رَضل كحالة) ب ٢، ل ٦٤.

263 (كشف الظنون، حاجي خليفة)، ل ١٣٩٨.

264 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٤، ل ١٠٤.

١٣٤ك- گرێبەستی ناوازە بۆ پاشای بەختەوەر (العقد الفريد للملك السعيد)[٢٦٥].

نووسراوەکەی بەسەر چوار بەهادا دابەشی کردووە کە سیستمی سیاسیی لەسەر دادەمەزرێت: یەکەم، بەها گونجاوەکان لەگەڵ کاری سیاسییدایە لەوانە ژیریی، وردبینیی و بیرتیژیی، دانبەخۆداگرتن، دامەزراویی و چەسپاویی، پێویستی و بەرەکەتی راوێژ و سەرکۆنەی وازلێهێنانی و بەلاوەنانی و رەچاوکردنی دادگەریی و دادپەروەریی سەبارەت بە خەڵکی، مەترسیی ستەم و ستەمکاریی، گرنگیی یەکێتیی و یەکڕیزیی و مەترسیی جیاوازیی و دووبەرەکیی، گرنگیی بێداریی و مەترسیی غافڵبوون و گرنگیی راستگۆیی، باس دەکات. لە بەشی دووەمدا، فەرمانڕەوایی، تایبەتمەندییەکانی، بەتایبەتی باسی وەزیران، نووسەران، سەربازان و خاوەن دیوانەکانی باس کردووە. لە بەشی سێیەمدا، شەریعەت و دادوەریی، حەسبەو ئەو دەستە لەمافە خواییەکان کە بریتییە لەمافی بەندەکان باس دەکات. لە بنەماو بەهای چوارەمدا قەرەبووی کەموکورتییەکان بە زیادکردنی گونجاوە و لەوەدا باسی حوکمە شەرعییەکان و تاوانکارییەکان باس کراوە.

٩٧ن- (سبط إبن الجوزي) ٥٨٢-٦٥٤ك/١١٨٦-١٢٥٧ ز.

شەمسەددین ئەبولموزەفەر یوسف کوڕی قەزا ئۆغلی کوڕی عەبدوڵڵا سبت کوڕی جەوزی. باوکی لە مەمالیك (عبد)ی تورك بوو کە ئەبی هوبەیرە

---

[265] لە میسر چاپ کراوە، (مطبعة الوَطن) ١٣١٠ك، بریتییە لە ٢٢٨ لاپەڕە، حاجی خەلیفە لە (کشف الظنون) باسی کردووە بەم ناونیشانە: (نفائس العناصر لمجالس الملك الناصر في الاخلاق وَ السلطة وَ الشريعةَ).

(کــــە کۆچـــکردووی ٥٦٠ك/١١٦٥ز) ئـــازادی کـــرد و لەگـــەڵ کـــچێکی ((ئیبنولجەوزی))دا زەماوەندی کرد، داوای جیهادی دژی خاچهەڵگران بـەرز کـردەوەو پێـشەوایەتیی خـەڵکی دیمەشـقی کـرد بـۆ هێـرش کردنـە سـەر نابلوس[٢٦٦].

١٣٥ك– هاونـشینی چـاکخوازو هـاودەمی ئامۆژگـار (الجلـیس الـصالح والانیس الناصح)[٢٦٧].

ئەو ئەم کتێبەی بۆ سەرکەوتوو (المظفر) موسـا کـوڕی ئەبوبـەکر کـوڕی ئـــەیوبی ئـــەیوبیی فەرمانـــدار (والی) دیمەشـــق نووســـی (کـــە کۆچـــکردووی ٦٣٥ك/١٢٣١ز)ە.

٩٨ن– (عبدالله بن أبي النَجم) کۆچکردووی ٦٥٦ك/١٢٥٩ ز[٢٦٨].

١٣٦ك– حەسـبەو شـارەکانی، تایبەتمەنـد بـە پێـشەواو بابەتگـەلی تـر (الحسبةَ وَ الدور مايَختص بهِ الإمام وَ غَيرهُ مِن الأمور)[٢٦٩].

٩٩ن– (عثمان بن إبراهيم النابلسي) کۆچکردووی ٦٦٠ك/١٢٦١ ز.

---

266 بروکلمان، ب ٦، ل ١٤٣-١٤٤.

267 لە لەندەن چاپکراوە، (دار رياض الريس)، هەروەها دەستنووسێکی لە جۆتا (ئەڵمانیا) بە ژمارە: ١٨٨١ (کە دراوەتە پاڵ کوڕەکەی عەلائەدین کوڕی یوسف)، هەروەها لە تۆبقۆسەرای لـە تورکیـا بـە ژمارە: ٢٦٢٢، کتێبخانەی سەلیم ئاغا لە ئەستەمبوڵ بە ژمارە: ٤٨٠ کە دراوەتە پـاڵ (أبـي الفـرج عـارف بـن زکريـا النهراوانـي)، هـەروەها لـە (دار الکتـب المصريةَ) هەیـە، ژمـارە: ٢٠٨ تـصوف، مـــایکرۆفیلم ژمـــارە: ٣٠٧٢١٠، بروکلمـــان ســـەلماندویەتی کـــە ئەمـــە نووســـینی نـــەوە (ســـبط)ی ئیبنولجەوزییە، سەیری بروکلمان، ب ٦، ل ١٤٣-١٤٤ بکە.

268 وەرگێڕدراوم دەست نەکەوت بۆ ژیانەکەی.

269 دەستنووسێکە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ق ١٥١-١٥٨ مجاميع ٦٥.

لـه میرەكـانی دەولّـەتی ئەیوبییـە، بـە فـەرمانی سـولّتان نەجمـەددین ئەیوب، چاودێریی دیوانەكانی میسری پێ سپێردراوە[270].

١٣٧ك– درەوشانەوەی یاسا پیادەكراوەكان لە دیوانـەكانی سـەرزەویی میسردا (لمع القوانین المضیة في دواوین الدیار المصریة)[271].

ئـەم كتێبـە پێـشكەشی نەجمـەددین ئـەیوب كـوڕی سـولّتان ئـەلكامیل ناسرەددین موحەممەد كراوە، بە سەرەتایەك دەستی پێكـردووە سـەبارەت بە گرنگیی ئامۆژگاریی و پێویستی و رۆڵی و ئەوەش كە پێی هەڵدەسـتێت، پاشـان باسـی پارێزگـاریی سـامانی خەزێنـە (بیـت المـال) دەكـات و باسـی واقیعی ژیانی سەردەمی خۆی دەكات لە رووی سەرچاوەكانی سامانەوە كـە خەزێنــە كۆیــان دەكاتــەوە و قــەبارەیان و جێگــەی خــەرجكردنیان بــاس دەكـات، لەگـەڵ بـەراوردێكی مێـژوویی دەوڵەتـە رابردووەكـان لـە میـسر و شوێنەكانی تـردا، دوای ئـەوە باسـی بابـەتی پێـشەوایەتیی گـەورە (الولایـة العظمـی) دەكـات و كـێ بـە كـەڵكی ئـەو جێگەیـە دێـت، ئینجـا باسـی فەرمانداارانی تر دەكات، وەكو فەرمانداری جەنگ و دیـوانی سـوپاو دیـوانی نووسین و دیوانی زیندان و دیوانی دادوەریـی و دادوەران و دیـوانی دارایـی. لە بەشی سێیەمیشدا باسی دیوانەكانی سەر زەوی میسر دەكات.

لــە بەشــی چــوارەمدا باســی كەموكوڕییــەكانی چــاودێرانی دیــوان و كەمتەرخەمییان دەكات. لە بەشی پێنجەمدا باسی خیانـەتی كاربەدەسـتان لە بەرپرسانی سەرووتر و ئەوانی تر دەكات و چۆن چارەسەر دەكرێت.

١٠٠ن– (خواجة نصیر الدین الطوسي) كۆچكردووی ٦٧٢ك/١٢٧٣ ز.

---

[270] (أعلام المؤلفین، رَضا كحالة) ب ٦، ل ٢٤٩.

[271] لە قاهیرە چاپكراوە (مطبعة الثقافة الدینیة) بە بێ بەرواو بریتییە لە ٧٤ لاپەڕە.

موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی حوسەینی تووسیی، فەیلەسوف، سەری زانستە ژیرییەکان و زانای پایەبەرزی بیرکاریی (ریاضیات) بوو، لە لای هۆلاکۆ (گەورە فەرماندەی مەغۆل) پلەو پایەیەکی بەرزی بەدەست هێناو کاریگەری لەسەری هەبوو، چونکە گوێی لێدەگرێت لەوەدا کە راوێژی پێدەکرد، لە تووس لە نزیکی نەیشاپوور لەدایك بووە، لە مەراغە گومەزەیەکی درووست کردو پڕی کرد لەو کتێبانەی کە تاتار لە بەغدادو و شام و حیجاز تاڵانیان کردبوو، نزیکەی چوارسەد هەزار کتێبی کۆکردەوە، هۆلاکۆ یارمەتی دارایی دەدا بۆ خوێندنی ئەو قوتابیانەی کە لەو خوێندنگەیەدا دەیان خوێند[٢٧٢].

١٣٨ك- پێشەوایەتی (الإمامة)[٢٧٣].

١٠١ن- (محمد بن منصور الحداد الموصلي) لە ساڵی ٦٧٣ك/١٢٧٤ ز دا لە ژیاندا بووە. لە ئامۆژگاریانکارانە[٢٧٤].

١٣٩ك- گەوهەری گرانبەها بۆ سیاسەتی سەرۆك (الجوهر النفیس في سیاسةَ الرَئیس)[٢٧٥].

ئەم کتێبە پێشکەشی ((بدرالدین لؤلـؤ))ی فەرمانڕەوای موسڵ کراوە، کە بە ترسنۆکی لە بەردەم دوژمن و دڵڕەق لەسەر رەعیەت و بێهێزان

---

272 (الأعلام المؤلفين، الزركلي) ب ٧، ل ٣١. (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ١٣١.

273 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی زاغب پاشا لە ئەستەمبوڵ، نوسخەیەکیشی لە کتێبخانەی شەهید ((شَهاب الدين التبريزي)) بە لە شاری قوم لە ئێران.

274 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١٢، ل ٥١-٥٢.

275 (د. رضوان السيد) لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە، بەیرووت: (دار الطليعةَ) ١٩٧٣ ز.

ناسراوە، لەبەر ئەوە ئەم کتێبە سەرەڕای نەرمیەکەی هاوارێکی ناڕازییە بەڕووی بەهاکانی ئەو سەردەمە و دەسەڵاتدارەکانیدا.

ئیبنو حەدداد سیاسەت دەکات بە دوو بەشەوە: سیاسەتی دین و سیاسەتی دونیا، کە دووەمیان دەبێتەهۆی ئاوەدانکردنەوەی زەوی چاککردنی و جوانکاردنی. ئینجا کتێبەکە دەکات بە دە بەندەوە، کە تیایدا باسی بابەتەکانی دادگەریی و لەسەر خۆیی و فەزڵ و لێخۆشبوون و ڕەوشت بەرزیی و ڕاوێژ و ڕاوەرگرتنی خاوەن ڕاکان و گرنگی سەخاوەت و بەخشین بەسەر ڕەعیەتدا دەکات. ئینجا بەردەوام دەبێت لەسەر کۆی بەها ڕەوشتییەکان و دەیانبەستێتەوە بە فەرمانڕەواو فەرمانداراەوە و ڕۆڵی ڕوون دەکاتەوە لە دەستەبەرکردنی ئاوەدانیی سەرزەوی و چاککردن و بەختەوەریی ڕەعیەت و دەسەڵاتدار.

١٠٢ن– (المبارَك بن خليل الخازندار البدري الموصلي) کە لە ساڵی ٦٨٢ك/١٢٨٣ز دا لە ژیاندا بووە[٢٧٦].

١٤٠ك– ڕێوڕەسمی سیاسەت بە دادگەریی و دەرخستنی ڕاستگۆی بەخشندەو پارێزکار بە پلەو فەزڵ لە گێلی سپڵەی بەدۆرخراوەی ڕسواو بێ ئابڕوو (آداب السياسةَ بالعَدل وَ تَبيين الصادق الكريم المهذب بالفضل من الاحمق اللئيم المكذيب النزل)[٢٧٧].

---

276 ژیانی نووسەری ناوبراوم دەست نەکەوت.

277 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمارە: ٤٣٠٠ ئەدیب، هەروەها لە کتێبخانەی ئەساسۆفیا لە تورکیا، ژمارە: ٢٨٤٠ (٢٤٥ لاپەڕە)، هەروەها نوسخەیەکی لە کتێبخانەی کۆبرلی ژمارە: ١٢٠٠ (٢٧٨ لاپەڕە) لەوەش نوسخەیەکی وێنەگیراو لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکانی قاهیرە پارێزراوە.

ئەمە کتێبێکی کۆکەرەوەی سیاسەتی دین و دونیایەو لە ((١٥٥)) بەندا باسی کارگێڕیی وڵات و ژیانی پاشایان و و خەلیفەکانی خستووەتە ژێر باس و توێژینەوە.

١٠٣ن- (محمد بن محمد بن محمد الخَطیب) لە ساڵی ٦٨٣ك/١٢٨٤ ز دا زیندوو بووە[٢٧٨].

١٤١ك- چەتری دادپەروەریی بنەماکانی دەسەڵات (فسطاط العدالةَ في قواعد السلطنةَ)[٢٧٩].

لە شەش بەنددا رێکخراوە کە کاروباری دەوڵەت باس دەکات لە هەموو رووەکانیەوە.

١٠٤ن- (المظفر العمر) کۆچکردووی ٦٨٨ك/١٢٨٩ ز.

موزەفەر کوڕی موحەممەد کوڕی موزەفەر کوڕی روزیهان کوڕی تاهیرولعومری، عەدوی، شاعیر، بەشدار لە هەندێ زانستدا[٢٨٠].

١٤٢ك- بەرچاو روونی پاشایان و بیرخەرەوەی دەسەڵاتداران بۆ ئاگادارکردنەویان لە لایەنگرانی شەیتان (تَبصرة الملوك وَ تذكرة السلاطين في التحذير من أعوان الشياطين)[٢٨١].

لە دە بەشدا بابەتەکانی دادگەریی و گوێڕایەڵیی پاشایان و گرنگیی پاڕانەوە بۆ کەسێك ((ناوبژیوانی بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیی)) و رۆڵی زانایان و کاربەدەستی پاشایان و مەترسیی ستەم و گرنگیی پاڕانەوەو نزاو

---

[278] ژیانی نووسەری ناوبراوم دەست نەکەوت.

[279] (کشف الظنون، حاجي خليفة) ل ١٢٥٩، (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ١٣٤.

[280] (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١٢، ل ٣٠١.

[281] كشف الظنون، حاجي خليفة) ل ١٢٥٩. (هديةَ العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ١٣٤.

پارێزگاریی له دونیا و پەندوەرگرتن له چیرۆکی رابردووان، چەندین بابەتی ئاماژە پێدراوی ئەم کتێبەن.

١٠٥ن– (عمر بن محمد بن عوض السنامي الشامي) کۆچکردووی ٦٩٦ك/١٢٩٧ز[٢٨٢].

١٤٣ك– راستی پێوانەیی حەسبه (نصب الإحتساب)[٢٨٣]. شامی کتێبەکەی به دیاریکردنی ئەو چەمکانە دەست پێدەکات وەکو حەسبەو ئیحتیساب (رێگریی لەوەی که له شەرعدا قەدەغه کرابێت)، ئینجا دەچێت بۆ دامەزراوەو بنەمای کارکردن و رێکخەرو چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەرکی چاودێریی بە نیشاندانی چالاکییه جیاوازە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان، بەو شێوەیەی که جێگەی ناتەواویی و گەندەڵیی هەبوو، هەروەها چۆنیەتی چاکسازیی باس دەکات.

١٠٦ن– (إبن الطقطقي) ٦٦٠–٧٠٩ك/١٢٦٢–١٣٠٩ ز.

موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی موحەممەد کوڕی تەباتەبای عەلەوی ناسراو به ئیبنو تەقتەقی، مێژوونووس، توێژەر، رەخنەگر، جێگەی باوکی گرتەوە له پێشەوایەتی عەلەوییەکانی حیلەو نەجەف و کەربەلادا[٢٨٤].

١٤٤ك– فەخریی له رێورەسم و رەوشتی سوڵتانییدا (الفخري في الآداب السلطانيةَ)[٢٨٥].

---

282 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسری، ژمارە: ٨٩ ((إجتماع تیمور))، مایکرۆفیلم ١٨٢٠٩ (٩٩ لاپەڕە)، لە خانەی کتێبی نیشتمانی دەستنووس لە تونس، ژمارە: ٢٠٩٤ (٧٥ پارچە).

283 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمارە ٨٩ (إجتماع تیمور) مایکرۆفیلم ١٨٢٠٩ (٩٩ لاپەڕە)، هەروەها لە خانەی نیشتمانیی دەستنووسەکان لە تونس بە ژمارە: ٢٠٩٤ (٧٥ پارچە).

284 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل ٥١.

ئـەو ئـەم کتێبـەی لـە سـاڵی ((٧٠١ك))دا پێـشکەشی فـەخرەدین عیـسا فەرمانداری غازان لە موسڵ کرد، ناوی کتێبەکەشی لە ناوی ئەو وەرگیراوە. ئەو بە پێی ڕەوشی ئیبنو خەلدون لە سەرەتادا لە چوارچێوەیەکی تیۆرییدا بۆچـوونی خـۆی پێـشکەش دەکـات، ئینجـا بـە ڕاڤـەی مێـژووی سیاسـیی سیستمی حکومەت لە ئیـسلامدا، جـەخت لـە سـەر مەسـەلەکانی وەزارەت، تەگبیرو دەوڵەت – کە لە پێشەکییەکەی خۆیدا باسی کردبوو – دەکاتەوە. ئــەو بەنــدی یەکــەمی کتێبەکــەی کــە تایبەتمەنــدی کاروبــارو تــەگبیری پاشایانەیە بەم شێوەیە دەست پێکرد کە ((بابەتی ئەم کتێبە پاشایانەیە و ڕاسـتییەکەی، دابەشـکردنی بـە پاشـایەتی دینیـی و دنیـایی، خیلافـەت و ســوڵتەنەت و میرایــەتیی و فەرمانــداریی، داخــوا چــەندە شــەرعیی یــا ناشـەرعییە، بۆچـوونی خاوەنڕاکـان سـەبارەت بـە پێـشەوایەتیی (الإمامـة) نییە، بەڵکو ئەم کتێبە باسی تەگبیرو سیاتگەلێك دەکات کە لـە مەسـەلەو ڕووداو و بــەڕێوەبردنی ڕەعیەتــدا کاریگــەریی هــەبێت و ســەرەنجام بــۆ دابینکردنی ئاسایشی وڵات و چاکتربوونی ڕەوشـی هـەموان ببێتـە بناغـە)). ئیبنــو تەقتــەقی بــە بزووتنــەوەی ڕاپەڕانــدن و جێبــەجێکردنی خــۆی لــە خـستنەبەرباسی دیـاردەی سیاسـەتدا، ئامـاژە بـە تایبەتمەندییـە گونجـاوو شایستەکان بۆ فەرمانڕەوا دەکـات، لەوانـە دادپـەروەریی، کـە دەبێتـەهۆی کۆکردنەوەی سامان و چاکتربوونی کـارو ژیـانی خـەڵك، زانـست، کەرامـەت، ڕاوێژ، ماف بەرانبەری پاشاو خەڵکە بەسـەر یـەکتر، پـۆلێنکردنی جـەماوەر، جیاوازییــە سیاســییە پەیوەندیــدارەکان بــە هەرچــینێکەوە، شــێوەکانی

---

[285] لە کتێبخانەی ((محمد علي صبيح)) لە قاهیرە (١٩٦٢ز) چاپکراوە، هەروەها لـە بـەیرووت (دار صادر) لە ٢٧٠ لاپەڕەدا چاپ کراوە.

تەگبیرو سیاسەت، لە سیاسەتی،ماڵەوە بگرە هەتا سیاسەتی گوندو شارو سوپاو.. هتد.

١٠٧ن- (الحسن بن عبدالله العباسي) لە ساڵی ٧١٦ك/١٣١٦ز دا لە ژیاندابووە. هاشمی، ((صفد))ی، مێژوونووسەو خاوەنی کتێبی ((نَزهةَ المالِك والمملوك في مُختَصَرْ سيرةَ من وَلي مصر من الملوك))[٢٨٦].

١٤٥ك- شوێنەواری یەکەم بۆ رێکخستنی وڵاتان (آثار الاول في ترتيب الدوَل)[٢٨٧].

ئەم کتێبە لە ساڵی ٧٠٨دا پێشکەشی مەلیك موزەفەر روکنوددین بێبرس مەنسوریی کراوە، دابەش دەبێت بەسەر چوار بەشدا، یەکەمیان باسی ئەو بنەماو ئوسولٚ و بنچینانە دەکات کە حکومەت و وڵاتانی لەسەر دادەمەزرێت، کۆی دەکاتەوە لە پێویستی هەبوونی پاشاو حکومەت و کۆڵەکەکان و بناغەکانی یاساو پەیکەرو خەسڵەتەکانی و ئەوەی کە پێویستە پاشا هەیبێت بەسەر رەعیەت و بە پێچەوانەوە رەعیەت لەسەر پاشای هەبێت. ئینجا پەیوەندی پاشا لەگەڵ کۆڵەکەکانی دەوڵەتدا کە بریتین لە فەرمانداران (الامراء) و ئەهلی شەریعەت و زانایان و شەرعزانان و خاوەن رێزو خوا پەرستان و بەخشندەو گرنگیی وەرگرتنی ئامۆژگاریی و راوێژەکانیان، هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ بازرگان و خاوەن پیشەو جوتیاران.

---

286 ((أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ)) ب ٣، ل ٢٤٠-٢٤١.

287 لە لایەن وەزارەتی مەعاریفی میسرییەوە لە قاهیرە چاپکراوە، پێش ئەوەش لە لایەن "خدێوی ئیسماعیل"ـەوە لە پەراوێزی کتێبی ((تأريخ الخُلفاء، السيوطى))دا لە ١٩٩ لاپەڕەدا چاپ کراوە.

بەشـی دووەمـیش باسـی دۆخ و حـاڵی پاشـا دەکـات لەگـەڵ وەزیـرو سـەرۆکی دیوانـەکان و نووسـەران و چـاودێرانی نەهێـشتنی سـتەمکاریی و پۆستەگەیەنەر و بەربەستان (الحجاب) و هەڵبژێردراوان.

لــە بەشــی سێیەمیــشدا باســی کاروبــاری تایبــەت بــە پاشــا و دەسـتوپێوەندەکەی دەکـات، لـە بەشـی چوارەمیـشدا باسـی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکان دەکات.

١٠٨ن– (إبن الرفعة المصري) ٦٤٥–٧١٠ک/١٢٤٧–١٣١٠ز.

ئەحمەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی عـەلی کـوڕی مورتـەفیع کـوڕی حـازم کـوڕی ئیـبراهیم کـوڕی عـەبباس کـوڕی ڕەفعـەی ئەنـساریی، بوخـاریی، میسریی، شافیعیی، فـەقیهو لـەدایکبووی میـسرە و فەرمانـداری حەسـبەی میسری کۆنی پێ سپێردراوە و لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە[٢٨٨].

١٤٦ک– خۆشحاڵکەری وەزیران (بهجةَ الوزراء)[٢٨٩].

١٤٧ک– پلە لە حەسبەدا (الرتبةَ في الحسبةَ)[٢٩٠].

١٠٩ن– (إبن تيميةَ) ٦٦١–٧٢٨ک/١٢٦٣–١٣٢٨ز.

ئەحمەد کوڕی عەبدولحەلیم کوڕی عەبدولسەلام کـوڕی عەبـدوڵڵا کـوڕی تەیمییــەی حــەڕانی و دواتــر دیمەشــقیی حەنبــەلیی، شەیخولئیــسلام، فــەرموودەناس، قورئانلەبــەر، توێــژەری قورئــان، فــەقیهو موجتەهیــد، بەشداریی لە جۆرەکانی زانـستدا کـردووە و تاقیکردنـەوەو ئـەزموونی زۆری

---

[288] ((أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ)) ب ٢، ل ١٣٥.

[289] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ((گۆتا)) لە ئەڵمانیاو لە ئەیاسۆفیا لە تورکیا.

[290] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی (لی لالەلی) ئەستەمبوڵ، ژمارە: ١٦٠٧، بریتییە لە ١٥٣ پارچە، لەوەش نوسخەیەکی لەبەرگیراوەی لە پەیمانگای دەستنووسی عەرەبی قاهیرە پارێزراوە.

دیوه و چەندین جار لە قەڵای قاهیرەو ئەسکەندەرییەو قەڵای دیمەشق زیندانیی کراوه هەر لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووه[٢٩١].

١٤٨ك– سیاسەتی شەرعیی بۆ چاکسازیی شوان و رەعیەت (السیاسة الشرعیة في اصلاح الراعي والرَعیة)[٢٩٢].

هەروەکو لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسی کردووه، ئیبنو تەیمییە لەم نوسراوەیدا باسی گەڕانەوەی ئەمانەت دەکات بۆ خاوەنی و باسی کارکردن بە دادگەری دەکات و کتێبەکە لەسەر ئەم بنەمایە دەبێت بە دوو بەندەوە، یەکەمیان جێبەجێکردنی و گەڕاندنەوەی ئەمانەت، ئەمەش دەبێت بە دوو بەشەوە، بەشی فەرمانداران و بنەماکانی بە دانانی چاکترین کەس بە پێی جۆری فەرمانداریيەکە و گونجاو لەگەڵ مەرجەکانی ئەو جێگەیەدا. لە بەشی دووەمیشدا رێزداران (أشراف) دیوان، داراییەکانی پاشا، بەخشینەکان، دەستکەوتەکان بە ئاشتی (الفيء)، ستەمی فەرمانداران لە مەسەلەکانی دارایی، چ لە دەرامەتەکان و چ لە خەرجییەکاندا، باس دەکات. ئەو جەختدەکاتەوە کە بودجە دەبێت لە رێگەی بەرژەوەندیی گشتیی موسڵماناندا خەرج بکرێت، بەندی دووەمی کتێبەکەش باسی حوکمە شەرعییەکان دەکات لەوانە حوکمە خواییەکان لە رووی پێناسەو جۆرو سزاکان لە جەنگەوە بۆ دزیی و زیناو بوختانەوە بۆ مافی خەڵك وەکو تۆڵەی کوشتن و بریندارکردن. لەکۆتاییشدا جەخت دەکاتەوە لەسەر گرنگیی راوێژ و پێویستبوونی.

---

291 (أعلام المؤلفين، رَضا كالةَ) ب ١، ل ٢٦١.

292 (محمد إبراهيم البَناء)، (محمد أحمد عاشور) توێژینەوەیان لەسەر کردووه، قاهیرە (دار الشعب) ١٩٧١، بریتییە لە ١٧٥ لاپەڕە.

١٤٩ك– حەسبە (الحسبة)[٢٩٣].

سەرەتا باسی گرنگیی کۆبوونەوەی مرۆیی دەکات چونکە بەرژەوەندی نەوەی ئادەم لە دونیا و دوارِۆژدا تەواو نابیٚ بە بیٚ کۆبوونەوە و هاوکاریی یەکتر سەرخستن نەبێت. مرۆڤ – وەکو ئیبنو تەیمییە دەڵێت: سروشتی شارستانیانەیە، ئینجا پێویستە رژێم و سیستمی فەرمانڕەوایی بەرپا بکات، پاشان جۆرەکانی فەرمانڕەوایی (فەرمانداریی) دەژمێریٚ و مەبەستی فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپەی تیایدا دەبینێت، هەروەها ئەرکی فەرمانداری حەسبە لە هەموو رووەکانی ژیانەوە دیاریی دەکات وەکو پێوانەو کێشانەو پیشەکان و رێگریی لە قۆرخکردن (إحتكار) و نرخ و چاودێریی کۆمەڵە پیلانگێڕەکان لەسەر قۆرخکردنی تاکڕەوانە بە نرخی کالاّوە، ئینجا باسی فەرزەکانی بەسبوون (فروض الكفايةَ) وەکو زانست فێربوون و فەرمان بە چاکە و رێگریی لە خراپە دەکات.

١٥٠ك– فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپە (الأمر بالمعروف والنَهي عَن المنكر)[٢٩٤].

لە سەرەتادا بە پێناسەی فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپە و پێویست بوونی و رۆڵی ئوممەتی ئیسلامیی و ئەرکی وەکو ئوممەت و هەڵگرتنی ئەم پەیامە بۆ جیهان بەو حوکمەی کە چاکترین ئومەتی هەڵبـژێردراوە بۆ خەڵکی دەست پێدەکات، ئینجا بنەماکانی فەرمان بە چاکەو رێگریی لە

[293] لە قاهیرە لە کتێبخانەی (المؤيد) ١٣١٨ ك چاپ کراوەو بریتییە لە ٩٣ لاپەڕە.

[294] دکتۆر سەلاحەدین مونجد توێژینەوەی لەسەر کردووە، بەیرووت (دار الكتاب الجديد)، (١٩٧٦)، هەروەها شێخ عەبدولعەزیز بەرماوی لێکۆڵینەوەی لە سەر کردووە، ئەسکەندەرییە (مكتبةَ الإيمان)، بریتییە لە ٦٣ لاپەڕە.

خراپە و مەرجەکانی و جەخت کردنەوە لە سەر ئەوەی کـە دورخـستنەوەی گەنـدەڵیی (درء المفاسـد) لـە پێـشترە لـە دەرخـستنی بەرژەوەندییـەکان دەکات کە بێگومان نەهامەتی گەلان و رووخانیان پەیوەندیـدارە بـە لادان و تاوان و بڵاوبوونـەوەی خراپەکارییـەوە، هـەروەها کاروبـاری خـەڵکی راسـت نابێتەوە بە دادگەریی نەبێت.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە دکتۆر سـەیفەددین عەبدولفـەتاح ئیسماعیل سەرنجی راکێشاوە بۆ ئەوەی کە فـەرمان بـە چـاکەو رێگـری لـە خراپـە هاومانـای ئیـسلامیانەی چـەمکی بەشـداریی سیاسـییە لـە زانـستی نوێدا[٢٩٥].

١١٠ن– (إبن الأخوة القرشي) ٦٤٨–٧٢٩ك/١٢٥٠–١٣٢٩ ز.

موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی زەید کوڕی ((الأخـوة القرشي))، فەرموودەناسە[٢٩٦].

١٥١ك– نیشانەکانی نزیکی لـە فەرمانـەکانی حەسـبەدا (معـالِم القربـةَ في أحكام الحسبةَ)[٢٩٧].

توێـژەر لـە سـەرەتای کتێبەکەیـدا دەڵێـت کـە دامـەزراوەی حەسـبە بەردەوام بوونی لە سەر کاری چالاکی خـۆی لـە میـسردا، هـەتا موحـەممـەد عەلی پاشا لە ساڵی ١٨٠٥ دا هەڵوەشاندەوە.

---

295 سەیفەددین عەبدولفەتتاح ئیسماعیل، (الجانِبْ السياسي لمفهوم الاختيار لدى المعتزلةَ بين الإدراك الذاتي وَ الفهـم الاستـشراقي) زانکـۆی قـاهیرە، کۆلێـژی ئـابووریی و زانـستی سیاسـیی، نامەیـەکی ماستەرە کە بڵاونەکراوەتەوە (١٩٨٣ز).

296 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل ١٨١.

297 موحەممەد مەحمود شەعبان توێژینەوەی لە سەر کردووە، قاهیرە (الهيئةَ المصريةَ العامةَ للكتاب)، کە بریتییە لە ٣٠٦ لاپەڕە.

ئـەم کتێبـە توێرانـدنی ئـەم دامەزراوەیـە وەکـو کتێبـە هاوشـێوەکانی حەسبە، نووسەر لە سەرەتادا باسی چەمکی حەسبەو بەڕێوبـەری حەسـبەو رۆڵ و تایبەتمەندیی و چۆنیەتی و مەرجی جێبەجێکردنی حەسبە لە تەواوی لایەنە کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییەکان دەکات، ئینجا دوای ئەوە بە دووردرێژیی باسی چالاکیی یا پیشە یا رەفتار یا دامەزراوەکان دەکات.

١١٢ن– (أحمد بن محمود الجيلي الأصفيدی) کە لـە سـاڵی ٧٢٩ک/١٣٢٩ ز دا زیندوو بووە. زانایەکی بەشداربووە لە هەندێ زانستدا[298].

١٥٢ک– پـــەیڕەوی وەزیـــران لـــە ئامۆژگارییـــدا (مَنهــاج الـــوزراء في النصيحةَ)[299]. کە لە ساڵی ٧٢٩ی کۆچیدا لە نووسینی بووەتەوە.

١١٣ن– (بدرالدين بن جماعة) ٦٣٥–٧٣٣ک/١٢٤١–١٣٣٣ ز.

موحەممـــەد کـــوڕی ئیـــبراهیم کـــوڕی ســـەعدوڵا کـــوڕی جەماعـــە، شەیخولئیـسلام و گـەورەی دادوەران (قاضــي القـضاة) شـافیعیی فـەقیهو فــەرموودەناس، نــەحویی، زمانــەوان، وێــژەوان و بەشــدار لــە زانـستەکانی تریشدا، دادوەریـی لـە میـسرو دیمەشـق و قـودس وەرگرتـووەو لـە میـسرو دیمەشـق وانـەی وتووەتـەوەو لـە مزگـەوتی ئەقـسا لـە قـودس و مزگـەوتی ئەمــەوی و مزگـەوتی ئەزهــەر وتاربێــژ بـووەو لـە قـاهیرە کۆچـی دوایـی کردووە[300].

---

[298] (أعلام المؤلفين، رَضا کالةَ) ب ٢، ل ١٧١–١٧٢.

[299] دەستنووسە لە کتێبخانەی ئەیاسۆفیا لە تورکیا، هەروەها (إيضاح المكنون، البغدادي) لە ب ٢، ٥٨٩ دا باسی کردووە.

[300] لە پێشەکی توێژەر.

١٥٣ك– دەرهێنـانی بڕیارەكـان بـۆ تـەگبیری ئـەهلی ئیـسلام (تحریـر الاحكام في تدبیر أهل الاسلام)[301].

كتێبەكـەی كـردووە بـە ((١٧)) بەنـدەوە، بـە مەسـەلەی پێـشەوایەتی (الإمامة) و پێویست بوونی چۆنیەتی ریگاكانی گرێدانی و مەرج و جۆرەكانی فەرمانـداریی و پلـەكانی و دواتـر وەزارەت و دیوانـەكان دەسـت پێـدەكات، دواتر بەشێكی گەورەی كتێبەكەی داناوە بۆ مەسەلە پەیوەندییدارەكان بـە جـەنگ و دەسـتكەوتەكانی جـەنگ و خـەراج و كاروبـاری ئـەهلی كتێـب (ذمةَ)وە.

١١٤ن– (إبـن سـید النـاس) ٦٧١–٧٣٤ك/١٢٧٣–١٣٣٤ ز. موحەممـەد كوڕی موحەممەد كوڕی موحەممەد كـوڕی ئەحمـەد كـوڕی عەبـدوڵڵا كـوڕی موحەممـەد كـوڕی یـەحیا یەعمـەری، ئەندەلوسـیی، ئیـشپیلی، میـسریی شافیعیی، ناسراو بە ئیبن سەییدونناس، فەقیهو فـەرموودەناس، پـارێزەری قورئان مێـژوونووس، رێكخـەر، پەخـشاننووس، نـەحوی، وێـژەوان، كـە لـە قاهیرە لەدایك بووەو یانەی فەرموودە (دار الحدیث)ی مزگەوتی ساڵحی پـێ سپێردراوەو وتاربێژی مزگەوتی ((الخندق)) بووە[302].

١٥٤ك– رێبازی روون بۆ پەیوەندیی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتداران (السبیل المبین في صلةَ الأمراء والسلاطین)[303].

---

[301] دكتۆر فوئاد عەبدولمونعم ئەحمەد توێژینـەوەی لـە سـەر كـردووە، دەوحـە، سـەرۆكایەتی دادگـا شەرعییەكان و كاروباری ئاینیی، چاپی یەكەم ١٩٨٥ ز.

[302] (أعلام المؤلفین، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل ٢٦٩–٢٧٠.

[303] دەستنووسێكە لە خانەی كتێبی میسریی، ژمارە: ٧٧٤ فیقهی شافیعیی، هەروەها مـایكرۆفیلم ژمارە: ٤٢٨٢٥، هەروەها ((إیضاح المكنون، البغدادي) بە هەمان ناونیشان ئاماژەی پێدراوە، بـەڵام

**١١٥ن– (يوســـــف المغربـــــي (الغربـــــي) المـــــدني) كۆچـــــكردووى ٧٤٣ك/١٣٤٣ز[٣٠٤].**

**١٥٥ك– نامەيەك لە فەزڵ پايەى زانايان و مافى پاشاياندا (رسالةً في فضل العلماء وَ حقوق الملوك)[٣٠٥].**

**١١٦ن– (أبو عبدالله شمس الدين محمد الذَهبي) ٦٧٣–٧٤٨ك/١٢٧٤–١٣٤٨ ز.**

**موحەممەد كوڕى ئەحمەد كوڕى عوسمان كوڕى قايماز كوڕى عەبدوڵڵا توركمانيى ميسريى، پێشەواى قورئانپارێزەر، مێژوونووس، فەرموودەناس، لە ديمەشق لەدايك بووەو هەر لەوێش كۆچى دوايى كردووە[٣٠٦].**

**١٥٦ك– نامەيەك لە پێشەوايەتى گەورەدا (رسالة في الإمامة العظمى)[٣٠٧].**

**١١٧ن– (أبــو عبــدالله محمــد الــسلمي) ٦٧٢–٧٥٠ك/١٢٧٣–١٣٤٩ ز.**

**موحەممــەد كــوڕى ئەحمــەد كــوڕى جەعفــەر كــوڕى عەبدولحــەق كــوڕى موحەممەد كوڕى جەعفەرى سلمى، ئەبوعەبدوڵڵا، لەخاوەن ڕێزو پلەوپايە چاكەكاران[٣٠٨].**

---

داويەتە پاڵ (زين العابدين محمد العمرى الشافيعي المعروف بسبط المرصفي) كە كۆچكردووى ٩٦٥ك، ب ٢، ل ٥.

304 سەبارەت بە ژيانى نوسراوێكم دەست نەكەوت.

305 دەستنووسێكە لە خانەى كتێبى ميسرى، ژمارە: ٦٩٠، مايكرۆفيلم: ٢٠٥٢٢ بريتييە لە ٢٣ لاپەڕە.

306 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٥، ل ٣٢٦. (الاعلام-الزركلي) ب ٨، ل ٢٨٩-٢٩٠.

307 دەستنووسێكە لە خانەى كتێبى ميسريى، ژمارە: ٥٩ (عقائد)، لەوەش نوسخەيەكى لە كتێبخانەى (رئيس الكتاب)ـە لە ئەستەمبوڵ ژمارە: ٢/١١٨٥.

308 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٨، ل ٢٤٧.

١٥٧ك– فەرمانـداری فـەرمانڕەواو فریاکـەوتنی غـەمخواردوان (طاعـة السلطان وَ إغاثةَ اللهفان)[٣٠٩].

١١٨ن– (إبن هـذيل الأندلـسي) لـە گـەورە پیـاوانی سـەدەی هەشـتەمی کۆچی و سەدەی چواردەیەمی زاینیی.

ئەبولحەسـەنی عـەلی کـوڕی عەبـدوڕەحمان ناسـراو بـە ئیبنـو هـوزەیلی ئەندەلوسیی، وێژەوان[٣١٠].

١٥٨ك– چاوی وێژەو سیاسـەت و جـوانیی ریـشەو سـەرۆکایەتیی (عـين الأدب وَ السياسة وَ زين الحسب وَ الرياسة)[٣١١].

کتێبەکەی بە باسی حیکمەت و زانـست و پێویـستی و پلـەو پەیامەکـەی دەست پێدەکات، نوسەر لە بەندی یەکەمدا، زاراوە بنچینەییەکان لە فیکری سیاسیی بە زنجیرەی پیتەکان و لە سەر بنەمای پیتی یەکـەم لـە یەکـەمین رستەوە پۆلێن کـردووەو دواتـریش بـە دوورودرێـژیی راڤەشـی کـردووە، لـە بەندی دووەمدا باسـی چـەندین بابـەتی وەکـو جـوامێریی (مـرؤة)، رەوشـت بەرزیی هەڵکردن لەگەڵ خـەڵك و پارێزگـاریی رێـز لەگـەڵ ئەوانـداو مەسـەلە داراییەکانی باس کردووە، لە بەندی سێیەمیشدا باسـی رەوشـت (أخـلاق) و خەسڵەتی کاربەدەستانی کاری سیاسیی لە هەموو پلەکاندا باس کردووە.

ئەم کتێبـە بـە کۆمەڵـە پەنـدێك بـە شـێوەی گـشتیی و پەیوەنديـدار بـە مەوداکانی سیاسەتەوە کۆتایی هات.

---

309 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی (کشك) لە بەغداد، ژمارە: ٩٣ و بریتییە لە ٥٧ پارچـە، لـەوەش نوسخەیەکی وێنەگیراوی لە پەیمانگای دەستنووسی عەرەبییە لە قاهیرە.

310 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٧، ل ١٢١.

311 لە لایەن ((مصطفى البابي الحلبي)) لە قاهیرە (١٩٦٩ز) چاپکراوەو بریتییە لە ٢٦٤ لاپەڕە.

١١٩ن– (إبن قيم الجوزية) ٦٩١–٧٥١ك/ك١٢٩٢–١٣٥٠ ز.

موحەممەد کوڕی ئەبوبەکر کوڕی ئـەیوب کـوڕی سـەعد کـوڕی حـەریزی زەرعـی دیمەشـقیی حەنبـەلیی، فـەقیهو ئوسـولّیی، موجتەهیـد، توێـژەری قورئان، قسەزان، نەحویی، فەرموودەناس، هەروەها بەشداریی زانستەکانی تریشی کردووە، لە دیمەشق لەدایك بـووە و تێگەیشتووە و پێگەیشتووە و فـــەتوای داوە و قوتـــابی و هـــاوڕێی ئیبنـــو تەیمییـــە بـــووە و لـــە قـــەلاّی دیمەشقیش لەگەلّیدا زیندانی کراوە لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە[٣١٢].

١٥٩ك– ڕێبازەکـانی فـەرمانڕەوایی لـە سیاسـەتی شـەرعییدا (الطـرق الحكمية في السياسة الشرعية)[٣١٣].

ئەم کتێبەی لە سەر پرسیاری کەسێك نووسی کـە لـە تەرابلوسـی شـام پرسیاری لێکردبوو، ئەم کتێبەش پێشکەشی هیچ فەرمانڕەوایـەك نـەکراوە. نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەی خۆیدا پرسیارگەلێك دەکات کە گرنگترینیان ئەمانەن: ئایا فەرمانڕەوا دەتوانێ بـە بیرتیـژیی فـەرمانڕەوایی بکـات؟ ئایـا دەبێ سیاسەت بە تەواویی بە پێی شەرع بێت؟ ئایـا سیاسـەت بـە گـۆڕانی کات دەگۆڕێت؟ لەو زەمینەوەیە گفتوگـۆ لـە نێـوان ئیبنـو عـەقیل و ئیبنـو قەییمدا باس دەکرێـت، پاشـان چـەندین بابـەتی سیاسـیی شـەرعیی وەکـو جێبـــەجێکردنی بڕیـــارە شـــەرعییەکان (حـــدود)، کەتنـــەکان (جنايـــات)، نرخـدانان، قـۆرخکردن، کـشتیاریی، ئاودانـەکان، حەسـبەو.. هتـد بـاس دەکات.

---

312 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٩، ل ١٠٦-١٠٧.

313 موحەممەد جەمیل ئەحمەد توێژینەوەی لەسـەر کـردووە، قـاهیرە چـاپخانەی (المدني)، (١٩٦١ز، ١٩٧٧ز) و بریتییە لە ٤٧٦ لاپەڕە.

١٢٠ن– (الطرطوسي) ٧٢٠–٧٥٨ك/١٣٢٠–١٣٥٧ ز.

ئیبراهیم کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدولواحید کوڕی عەبدولمونعم کوڕی عەبدوسسەمەدی تەرتوسیی دیمەشقیی حەنەفیی، لە دادوەرانەو لە مەزە لەدایك بووەو لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە، لە فیقهو ئوسولّدا دەرکەوتووەو وانەی وتووەتەوەو فەتوای داوەو دەسەڵاتی گرتووەتە دەست[٣١٤].

١٦٠ك– دیاریی بەجێماو کە پێویستە پاشا کاری پێ بکەن (تحفةَ الترك فیها یجب أن یعمل بهِ في الملك)[٣١٥].

١٢١ن– (محمد بن نباتة) ٦٨٦–٧٦٨ك/١٢٨٧–١٣٦٦ ز.

موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی حەسەنی جوزامیی فارقیی میسریی، شاعیری سەردەمی خۆی بووە، یەکێك بووە لە نووسەرە نامە نووسە زاناکان بە وێژە، ڕەگەزی دەگەڕێتەوە بۆ میافارقین و لەدایك بوون و کۆچی دوایی لە قاهیرە بووە، لە شام نیشتەجێ بووە و چاودێری گژوگیای پێ سپێردراوە لە قودس و هەروەها ئەمینداری سوڵتان ناصر حەسەن بووە لە قاهیرە[٣١٦].

١٦١ك– ڕەفتاری حکومەتی پاشاکان (سلوك دول الملوك).

---

314 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١، ل ٦٢.

315 (د. رضوان السيد) توێژینەوەی لەسەر کردووە، بەیرووت (دار الطَليلقة).

316 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل ٢٧٣. (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ١٦٤.

ئەم کتێبە باسی سیاسەت و بەڕێوەبردنی دەسەڵات و یاسای جەنگ دەکات و لە شەش بەندا ڕێکیخستووە[٣١٧].

١٦٢ك- کتێبی تەگبیری وڵاتان (کِتاب تدبیر الدول)[٣١٨].

١٢٢ن- (عبدالوَهاب السبکی) ٧٢٧-٧٧١ك/١٣٢٧-١٣٧٠ز.

عەبدولوەهاب کوڕی عەلی کوڕی عەبدولکافی کوڕی تەممام یوسف کوڕی موسا کوڕی تەمامی ئەنسارییی شافیعیی، فەقیهو ئوسولّیی، مێژوونووس، وێژەوان، ڕێکخەر، پەخشاننووس، لە قاهیرە لەدایك بووە، لەگەڵ باوکیدا چووە بۆ دیمەشق لە لای زانا (الذهبي) خوێندوویەتی لە سەر دەستی ئەودا دەرچووە و لە دیمەشق دادوەریی و وتاربێژیی مزگەوتی ئەمەویشی پێ سپێردراوە، هەروەها لە زۆربەی خوێندنگەکانیدا وانەی وتووەتەوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٣١٩].

١٦٣ك- گێڕەرەوەی ناز و نیعمەت و لەناوبەری نەگبەتییەکان (معید النعم وَ مبید النقم)[٣٢٠].

---

[317] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەسعەد ئەفەندی لە ئەستەمبوڵ، ژمارە: ١٨٢٢، بریتییە لە ٨٤ لاپەڕە. لەوەش نوسخەیەکی وێنەگیراو لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکان لە قاهیرەو نوسخەیەکیشی لە کتێبخانەی (بۆدلیان- ئۆکسفۆرد)، ژمارە: ٢٩ کۆمەڵەی سلدسوبرنج و بریتییە لە ١٠٩ لاپەڕە، هەروەها نوسخەیەکی وێنەگیراو لە زانکۆی ئەردەنی ژمارە: ٧٢٩ پارێزراوە.

[318] دەستنووسێکە لە زانکۆی ئەمەریکی، بەیرووت (Ms 320: Mg5 mr A) پێشتر ٨٦٣ و لە ٨٤ لاپەڕەدایە، لە زانکۆی دیمەشق بە ژمارە ١٩٦٦ پارێزراو نوسخەیەکی تریش لە زانکۆ ئەمەریکی بەیرووت و وێنەگیراو لەسەر فۆتۆستات و والسرموفاکس بە ژمارە ( Ms 354: Nll MA.and Mic-A 323) پارێزراوە.

[319] (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ٦، ل ٢٢٦.

[320] موحەممەد عەلی نەجار توێژینەوەی لەسەر کردووە، قاهیرە (دار الکتاب العربي) ١٩٤٨ ز و بریتییە لە (١٦١) لاپەڕە.

ئەم کتێبە ڕەوشتێکی نوێی بۆ باسکردنی دیاردەی سیاسیی پێشکەش کردووە، سوپاسی نیعمەت وەکو چەمکێکی مەعنەویی کە پەیوەندیدارە بە کاری ئاینییەوە کە بۆ چاککردنی کاری سیاسیی بەکاری دەهێنێت، میکانیزمی ئەم کارە بەم شێوەیە روون دەبێتەوە کە زۆربوونی چالاکی و هەڵسوکەوتی سیاسیی بریتین لە هۆکاری سوپاسی نیعمەتی خوا، چونکە سوپاسی نیعمەتی خوایی بە چاك بەکارهێنانیانە. سوبوکی لەهەمان چوارچێوەدا بۆچوونی خۆی لە تەواوی ئاست و پلەکاندا باسدەکات و لەم بارەیەوە لەگەڵ فەرمانڕەواو فەرمانداراندا دەست پێدەکات و نزیکەی ١١٣ کاری تایبەتی پەیوەندیدار بە بەرژەوەندیی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی دەژمێردرێت.

١٢٣ن– ((محمد بن محمد بن عبدالكريم بن رَضوان بن عبدالعزيز البعلي)) کۆچکردووی ٧٧٤ك/١٣٧٢ ز.

زانایەکی (فەقیه) بووە و لە بەعلەبەگ لەدایك بووە و لەوێ زانست فێربووە و لە دیمەشق و حەماش خوێندوویەتی و لە تەرابلوسی شام کۆچی دوایی کردووە[٣٢١].

١٦٤ك– رەفتارچاکیی لە سیاسەتی پاشایاندا (حسن السلوك في سياسة الملوك)[٣٢٢].

١٢٤ن– (مجهول لم يُعثر على إسمه) نووسەرێکی ناوبزرە ئەوەی کە ئاشکرایە ئەمەیە کە ئەم نووسەرە کتێبەکەی خۆی لە ساڵەکانی ٧٥٩ تا

---

321 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١١، ل ٢٣٥، (الاعلام، الزركلي) ب ٧، ل ٣٩.

322 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەحمەدییە لە مزگەوتی ((الزيتونة)) لە تونس، ژمارە: ٥٠٨٤ بریتییە لە ٩٧ لاپەڕە.

٧٨٦ی کۆچی پێشکەش بە سوڵتان شوجاع لە فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی موزەفەرییە کردووە، کە فەرمانڕەوای ئازەربایجان، فارس، کرمان، ئەسفەهان و شیرازبوون، وا دەردەکەوێت ئەو ئەم کتێبەی لە ساڵی ٧٧١ دا نووسیبێت.

١٦٥ك– یاسای سیاسەت و شێوازی سەرۆکایەتییکردن (قانون السياسة ودستور الرياسة)[٣٢٣].

نووسەر ئەم کتێبەی هەروەکو کتێبی (سلوك الممالِك)ی ئیبنو رەبیع بە سوودوەرگرتنە لە خشتەو شێوازی درەختیی رێك خستووە لە سێ یاسادا نووسیویەتی. یاسای یەکەمی بە پاککردنەو چاککردنی رەوشت تایبەت کردووە و باسی پلەوپایە و فەزڵ و دادگەریی، ئازایەتیی، داوێنپاکیی کردووەو پاشان نەخۆشییە دەروونییەکانی فەرمانڕەوایانی ئاماژە پێدراوە. بە بۆچوونی ئەو دەروونی مرۆڤ خاوەنی سێ هێزی جیاکەرەوەی (تێوری و زانست) تووڕەیی و شەهوەتخوازییە و بە دیارییکردنی هێزە دەروونییەکان نیشاندانی لەپێشتر بوون یەکێکیان لەوانەی تریان دەکرێ مەسەلەی دەروونی فەرمانڕەوایان چارەسەربکرێت. لەیاسای دووەمدا باسی چاودێری بەڕێوبەرایەتییەکانی دارایی دەکات، سەرچاوەکانی بەدەستهێنانی دارایی و شێوەی خەرجکردنی دارایی لە رێگەی گەشەکردنی کۆمەڵگەدا باسدەکات، یاسای سێیەمیش سەبارەت بە هەڵسەنگاندن و پلەبەندیی خەڵکە. جیاکردنەوەی هەڵبژاردەکان کان لە خەڵکی و شێوەی مامەڵە لەگەڵ

323 (محمد جاسم الحديثي) توێژینەوەی لەسەر کردووە، بەغدا، وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن، خانەی کاروباری رۆشنبیریی و راگەیاندن، خانەی کاروباری رۆشنبیری (١٩٨٧ز) و بریتییە لە ١٥٣ لاپەڕە.

هەریەکەدا لەم یاسایەدا باس کراوە. نووسەر لە کۆتاییدا داوا لە پاشا دەکات هەتا تەگبیری گونجاو بگرێتە بەر، سوود لە کەسانێ وەربگرێت کە لە رابردوودا خاوەنی تەجرەبەن، هەروەها پێویستە ئاگای لەیارمەتییدەران و کاربەدەستانی خۆی بێت. راوێژ بە گرنگ بزانێت خۆی لە رای خۆ پەسەندی بپارێزێت.

١٢٥ن- (عبدالرحمن بن نصر بن عبدالله الشيرزي الطبري) کۆچکردووی ٧٧٤ك/١٣٧٢ ز. لە دادوەرانەو دادگای تەبەرییەی پێ سپێردراوە[324].

١٦٦ك- پەیڕەوی گێراوەبەر بۆ سیاسەتی پاشایان (المنهج المسلوك في سياسة الملوك)[325].

ئەم کتێبە کراوە بە نۆزدە بەشەوە، بە باسی پێویستیی رەعیەت بە پاشای دادپەروەری پێویستیی، پاشاش بە رەوشتچاکیی و رێز دەست پێدەکات، ئینجا وەزیران، رەعیەت، هێز، دارایی و قەڵاکان (واتە پێداویستیی بەرگریی) وەکو کۆڵەکەکانی حکومەت و وڵاتان لەقەڵەم داوە. نووسەر لە درێژەدا باسی گرنگیی راوێژ و تایبەتمەندیی راوێژەکان و بەڕێوەبردنی سوپا و سەربازان و دابینکردنی ریگاکان و کۆنترۆڵی یاخییان و دەستدرێژیکارانی دەرەکیی باس دەکات، لە کۆتاییدا پێشنیاز دەکات بۆ

---

324 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٥، ل ١٩٧-١٩٨.

325 لە قاهیرە (١٣٢٦ك/١٩٠٧ز) چاپکراوە، هەروەها لە ئەردەن (دار المانرة، الزرقاء) چاپکراوە. پێشتریش لە قاهیرە لە چاپخانەی بۆلاق (١٨٤١ز)، چاپی میسر (١٣٠٦ك/١٨٨٨ز) و نوسخەیەکی دەستنووسیش لە (دار الكتب الازهرية) ژمارە: ١١٨٦ حوسەین پاشا، پارێزراوەو لە لایەن (محيض محمد أفندي الكليبولي) کۆچکردووی ١٢٠٣ك/١٧٨٩ز وەرگێڕدراوە کە لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە، کتێبخانەی کۆبلرلی، وەقفی (محمد عاصم بك) ژمارە: ٤٠٤.

پاشا هـەتا ئامۆژگـاریی زانایـان و خواناسـان (ئـەهلی تەریقـەت) ببیـستیٚ و وەربگرێت.

١٦٧ك– کۆتـایی پلـە لـە داخـوازی حەسـبەدا (نهایـةَ الرتبـةَ في طلـب الحسبةَ)[٣٢٦].

ئەم کتێبە کراوە بە چـل بەنـدەوە، لـە یەکەمیانـدا باسـی کاربەدەسـتی حەسبە دەکات و مەرجەکانی و پێویستییەکانی رەفتـارە پەسـەندکراوەکان (مستحبات)ی دەکات، شیزەری بە رەخنەی واقیعی ئەو سـەردەمەی خـۆی حەسبەی لە تەواویی گۆشەکانی ژیانی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی خـستووەتە ژێرباس و میکانیزمی گونجاو بۆ رێکخستنی دەست نیشان دەکات و گرنگـی پەیوەنـدی بەرپرسـی حەسـبەو دادوەر و زانایـان و جـەخت لـە سـەر جـیٚ بـەجێکردنی حەسـبە لــە لایــەن فەرمانــداران (ولاە) و کاربەدەســتانەوە دەکاتەوە.

١٢٦ن– (لسان الدين الخطيب) ٧١٣–٧٧٦ك/١٣١٣–١٣٧٤ز.

موحەممەد کوڕی عەبـدوڵڵا کـوڕی سـەعید کـوڕی ئەحمـەد کـوڕی عـەلی سـەلمانی لووشـیی، غـەرناتیی ئەندەلوسـیی، لیـسانودین، ئیبنولخـەتیب، خـاوەنی دوو وەزارەت (ذو الـوَزارتین)، وێـژەوان، پەخـشاننووس، شـاعیر، مێـژوونووس، بەشـدار لـە زانـستی پزیـشکیی و زانـستەکانی تریـشدا، لـەو وەزیرانە لە ((لوشە))ی غەرناتە لەدایك بووە و هـەر لـەوێش پێگەیـشتووەو بووەتە وەزیری سوڵتان ئەبولحەجاج یوسـف کـوڕی ئیـسماعیل و دواتـریش وەزیری کوڕەکەی ئەلغەنی بیلا موحەممەد، کاتیٚ لـە فیتنـەیی و دووڕوویـی

326 (السید الباز العریني) توێژینـەوەی لەسـەر کـردووە، قـاهیرە (لجنـةَ التـألیف وَ الترجمـةَ وَ النَـشر ١٩٤٦) چاپیان کردووە و بریتییە لە ١٢٩ لاپەڕە.

ترسا كە لە دژی دەكرا، ئەوێی بەجیٚ هێشت و چوویە سەبتە و تلمسان كە سوڵتان عەبدولعەزیز كوڕی عەلی مەرینی دەسەڵاتداربوو، كاتیٚ سوڵتان موستەنسر ئەحمەد كوڕی ئیبراهیم دەسەڵاتی مەغریبی گرتە دەست و ئەلغەنی بیلای سوڵتانی غەرناتە لەوەدا یارمەتیی دا ئەو مەرجەی بۆ دانا كە ((ئیبنولخەتیب))ی تەسلیم بكاتەوە، هەربۆیە لە لایەن موستەنسر بیللاوە دەستگیر كرا و بە تۆمەتی گومڕایی (زندقة) و شوێنكەوتنی ئاینزای فەیلەسوفان تۆمەتباركرا و زیندانیی كرا و بە خنكاندن لە ساڵی ٧٧٦ك دا كوشتیان، لە شاری ((فاس)) بە خاك سپێردرا[٣٢٧].

١٦٨ك– ئاماژە بۆ ئادابی وەزارەت[٣٢٨].

ئەم نامەیە پێكهاتووە لە پێشەكییەك و شەش كۆڵەكە. بەڵام لە سەرەتادا جەخت لە سەر گرنگیی پۆستی وەزیر و مەرجەكانی دیاریكردنی و بارودۆخی باس دەكات. بەڵام كۆڵەكەو بنەماكان ئەوەیە كە وەزیر دەبیٚ دركی رۆڵی و ئەرك و رەفتاری خۆی لەگەڵ پاشادا بزانیٚ و هەتا مەبەستەكانی ئەركەكەی دەستەبەر بكات و لە دەستی پاشاش خۆی بپارێزێت، هەروەها زانینی رەوشتی پاشاو رێگە بڕین بە پێی ئەوەو چۆنیەتی رەفتاری وەزیر لەگەڵ دەست و پێوەندەكان و دەوروبەرو خاوەن پلەوپایەكان لە دەوڵەتدا باس دەكات.

---

327 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١٠، ل ٢١٦.

328 (عبدالقادر زمامة) لە گۆڤاری (مجمع اللغة العربية) لە دیمەشق (مجلةَ ٤٧) ساڵی ١٩٧٢ز بڵاوی كردووەتەوە، هەروەها (د. وداد القاضي) لە گۆڤاری (الفكر العربي)، بەیرووت، ژمارە ٢٣ (ئۆكتۆبەر، نۆڤەمبەری ١٩٨١) بڵاوی كردووەتەوە. هەروەها نوسخەیەكی دەستنووس لە گەنجینەی گشتی ریبات، ژمارە: ٢٤١٠ (D 1092)، نوسخەیەكی تریش بە ژمارە: ٢٤١١ (D 1405) پارێزراوە.

١٦٩ك– نامەیەك لە سیاسەت یا دەسەڵات لە سیاسەت یا نامەیەك لە مەبەستی سیاسەتدا (رسالة في السیاسة أو مقامةَ في السیاسةَ أو رسالةَ في غرض السیاسةَ)[٣٢٩].

ئیبنولخەتیب ئەم كتێبەی لە ساڵی ٧٦٨ك/١٣٦٧ز لە سەر داخوازیی پاشای قشتاڵە ((دۆن پیدرۆی دڵڕەق – Don Pedro Cruel)) بە زمانی قشتاڵەیی نووسی، توێژینەوەكە دابەش دەبێت بۆ سێ بەش و پێشەكییەك، یەكەمیان: چەند ئامۆژگارییەك بۆ پاشا لەخۆ دەگرێت، كە چۆن لەگەڵ خەڵكەكەیدا بجوڵێتەوە و چۆن مامەڵە لەگەڵ بیانیانی نیشتەجێی وڵاتەكەیدا بكات.

دووەمیان: ئیبنولخەتیب داوا لە پاشا دەكات كە هەموو شتێ لە جێگەی خۆیدا دابنێ و لە رەعیەتەكەی نزیك بكەوێتەوە، لێیان، خۆش ببێ و پارێزگاریی و پشتیوانییان بكات، ئەوەش بگۆڕێت كە پێشینەكان كردوویانەو رێز لە بەڕێزەكان و پیاوماقوڵانیان بگرێت، جیاوازیی نەكات لە نێوان ئەوەی یارمەتی داوەو ئەوەش دژایەتی كردووە، ئینجا پێنج مەسەلە دیاریی دەكات كە پێشترو ئێستاش پاشاكانی پەلكێشی لەناوچوون كردووە كە بریتییە لە: خوێنڕژاندنی ناپێویست، تەماعكاریی بۆ دەست بەسەراگرتنی زەوی زیاتر، شەهوەتپەرستیی پاشایان و گوێنەدانیان بە زانایان و شەرعزانان و ستەمكاریی. لە سێیەمیشیاندا ئامۆژگاریی پاشا

---

[329] ئەم نامەیە لە لایەن مامۆستا (محمد بن أبي بكر التطواني)ەوە توێژینەوەی لە سەر كراوە، هەروەها دكتۆر (شوقی ضیف) و دواتریش رۆژهەڵاتناس دۆگلاس مۆرتۆن توێژینەوەیان لەسەر كردووە. بڕوانە ((نفح الطیب)) ب ٦، ل ٤٣١-٤٤٥، (الإحاطة) ب ٤، ل ٦١٤-٦٣٤، هەروەها لە گەنجینەی گشتی ریبات بە ژمارە: ٢٤١٢ (D 972) دەستنووسێكی ئەم نامەیە پارێزراوە.

دەکات کە کاروبارە گرنگ و بەرزەکان نەداتە دەستی بێگانـەکان، ئەوانـەی کە پێشتر یارمەتیدراوە لـە جەنگدا بـۆ سـەرکەوتن بـە سـەر دەسـەڵاتداری پێش خۆیدا، بەڵام پێویستە لە سـەر پاشـا زەوییـەکانیان لێ زەوت نـەکات. لێرەدا پێویـستە ئامـاژە بـەوە بـدەین کـە ئـەم وڵاتـە پاشـایەتییە بـوو کـە قەڵاچۆی بوونی موسـڵمانان بـە یارمـەتی لەگـەڵ پاشانـشینی ئەراگۆنـدا لـە ئەندەلوسدا کرد؟!

١٧٠ك– کتێبی باخچەی وڵاتان (کتاب بستان الدول)[٣٣٠].

ئەم نووسراوە کتێبێکی گەورەیە کە ئیبنولخـەتیب سـی (٣٠) بـەرگی لێ تەواو کردووە، کە هەر بـەرگێك بریتییـە لـە کتێبێکـی قـەبارە گـەورە، هـەر بەشێك بریتییە لە دە درەخـت بـە ناوەکـانی: درەختـی سـوڵتان، درەختـی ئۆرگـانی وەزارەت، درەختـی دامـەزراوەی نووسـین، درەختـی دامـەزراوەی دادوەریی، درەختی دامەزراوەی حەسبە، درەختـی کـار، درەختـی جیهـاد، (سەربازان سوارەو هێزی دەریایی)، درەختی پزیـشکان و شـتی تـریش کـە پاشا پێویستی پێیـان دەبێـت و درەختـی سەرپەرشـتیی. بـە پێـی قـسەی ئیبنولخـەتیب، هـەر درەختێـك لـە چـەندین بـەش، ریـشە، قـەد، پێـست و توێکڵ، لق، گوڵی بەرهەمدار و بێبەرهەم پێك دێت، لە سـەر هـەر یـەکێ لـە بەشـەکانی ئــەم درەختــەوە نــاوی کــاری جێگــەی بــاس و بەرنامــەکانی نووسراوە.

١٧١ك– تایبـەتکردنی سـەرۆکایەتیی بـە کورتکردنـەوەی لـە سیاسـەتدا (تَخصیص الریایة بتلخیص السیاسة)[٣٣١].

---

330 (د. وداد القاضي) پێشکەشی کردووە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٥، هەروەها سـەیری (الإحاطـة) ب ٤، ل ٤٦٠ و (نفح الطيب) ب ٧، ل ٩٧-١٩٨ بکە.

هەروەها ئەم کتێبە بە شیعراندن لە سیاسەتی شارستانیی (أرجوزة* في السياسةَ المدنية)[332].

یا شیعرێك لە سیاسەتدا کە بریتییە لە (٦٠٠) دێڕ شیعر، کە باسەکانی سیاسەت لە خۆی دەگرێت بەو پێیەی کە بەشێکە لە بەشەکانی زانستی کۆن (واتە فەلسەفە)، ئیبنولخەتیب لەم شیعرانەدا باسی هێزە سێکوچکەکان و دەرمانی رەوشت و مەسەلەی ژیان دەکات[333].

١٧٢ك- نامەیەك لەبارەی خزمەتی دەوڵەتدا (رسالة في أحوال خدمةَ الدولة)[334].

١٢٧ن- (إبن رضوان المالقي) ٧١٨-٧٨٤ك/١٣١٨-١٣٨٦ ز.

عەبدوڵڵا کوڕی یوسف کوڕی ریزوان کوڕی یوسف کوڕی ریزوانی بوخاریی، مالیقیی و فاسیی، فەقیهو وتاربێژ، نەحویی، زمانەوان، گێڕەرەوە، رێکخەر، پەخشاننوس، لە سەرۆکانی نووسەرانەو لە ئەزموور کۆچی دوایی کردووە[335].

---

331 سەیری کتێبی (إبن الخطيب محمد خلال كتبة) نووسینی (محمد أبوبكر التطواني)، تەتوان، (١٩٥٤ز) و(إبن الخطيب، نقاضةَ الجراب) لێکۆڵینەوەی (أحمد مختار العبادي) قاهیرە: ل ١٨٨ بکە.

* (أرجوزة) بریتییە لە قەسیدەیەك لە بەحری (رجز) کە کێشەکەی لە عەرەبیدا بریتییە لە (٦) جارو لە فارسییدا (٨) جارو ((مستفعلن))ە، کە دێڕەکان کورتە، کە مانای خۆپەسنکردن و بە خۆهەڵگوتن لە گۆڕەپانی جەنگدا دەوترێت.

332 لە (إيضاح المكنون، البَغدادي) ب ٢، ل ٣٢ دا ناوی هێناوە.

333 (د. وداد القاضي)، (جوانب محمد الفكر السياسي-للسان الدين بن الخطيب))، سەرچاوەی پێشوو، لە ٢٧٤.

334 دەستنووسێکە لە گەنجینەی گشتی ریبات، ژمارە: ٢٤١٤ (D 972).

335 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٦، ل ١٦٤.

١٧٣ك– ئەستێرە كشاوی تیشكدەری سیاسەت بەكەڵك (الشهب اللامعة في السياسة النافعة)[٣٣٦].

پێش لە هەژدەساڵ لە نووسینی كتێبی (المقدمة)ی ئیبنوخەلدون نووسەر ئەم كتێبەی نووسیوە، ئیبنوخەلدون زۆر شتی لێوەرگرتووە بەڵام ئاماژەی پێ نەداوە، نووسەرەكەی ئەم كتێبەی پێشكەشی سوڵتان ئەبوسالم ئیبراهیم كوڕی حەسەن مەرینی كردووە، كە لە نێوان ساڵانی ٧٦٠–٧٦٢ك فەرمانڕەوایی كردووە، كە زۆری حەز دەكرد لە یاسایەكی سیاسیی كە بە پێی ئەوە فەرمانڕەوایی بكات، ئیبنوڕیزوان ئەم كتێبەی بۆ نووسینی بۆ ئەوەی كاروباری وڵاتەكەی لە ستەم و بەرتیل و گەندەڵیی چارەسەر بكات، كتێبەكەی دابەش دەكات بە بیست و پێنج بەندو بە مەسەلەی خیلافەت و پێویستی و گرنگیی فەرمانداری پێشەواو ئامۆژگاریی و ئەوەی پێویستە لە سەر پاشاكان لە گوێگرتن و بە گەورە زانینی زانایان و چاكسازو چاكخوازان دەست پێدەكات و ئینجا ئەم مەسەلانەی تر باس دەكات: دادگەریی و پلەوپایەی، پاشا لەگەڵ دەستوپێوەندە تایبەت و وەزیران و نووسەران، ئینجا باسی گرنگیی ئاوەدانكردنەوەی زەوی و چاكسازیی وڵات دەكات، هەروەها بڵاوكردنەوەی بەهاكانی سەخاوەت و ڕەوشتبەرزیی و دابینكردنی هۆكاری هاتوچۆ و چاودێریی نەخشە ئاینییەكان، سزاكان، حاڵی زیندانەكان، ئینجا باسی مەسەلە ئابوورییە پەیوەندیدارەكان بە خەزێنەو خەڵات و لێگرتنەوەو سیاسەتی سەربازان و سیاسەتی جەنگەكان دەكات.

---

[336] لێكۆڵینەوەی دكتۆر (علي سامي النَشار)، (دار البيضاء: دار الثَقافة) ١٩٨٤ ز، بریتییە لە ٣٨٨ لاپەڕە.

قسەکانیش لە بارەی گەندەڵیی وڵاتان و کینەبوون لە پاشاکان و تایبەتمەندییەکان و پەندو ئامۆژگارییەکان دەکات.

١٢٨ن- (محمد بن منكلي) کۆچکردووی ٧٨٤ك/١٣٨٢ ز

موحەممەد کوڕی مەحمود کوڕی مەنکلی بوغا ئەلقاهریی، خاوەنڕێز، شارەزا بە هونەری جەنگ، لە سەردەمی مەلیکولئەشرەفی شەعبان، لە زنجیرەی پاشایانی مەمالیکی بەحری میسر (٧٦٤-٧٧٨ك، ١٣٧٧-١٣٨٢ز)دا پلەی سەرۆکایەتی کاروباری جەنگی پێ سپێردرا[٣٣٧]. سەبارەت بە شێوەی بەڕێوەبردنی جەنگ، چەندین کتێبی نووسی، لەوانە ((الاحكام الملوكية وَ الضوابط الناموسيةَ))[٣٣٨]. ((التدريبات السلطانية في سياسة الصناعية الحربية))[٣٣٩]. ((الحيل في الحروب وَ فتح المدائن وَ حِفظ الدروب))[٣٤٠]. ((الرسالة المرضية في صناعة الجندية))[٣٤١]. ((المنهل العزب لورود أهل الحرب))[٣٤٢].

---

337 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٢، ل ٨، ٥٣.

338 دکتۆر عەبدولعەزیز عەبدودائیم توێژینەوەی لە سەر کردووە، ئەمە کتێبێکە لە ستراتیژی جەنگی دەریاییدا.

339 مەحمود شیت خەتاب توێژینەوەی لە سەر کردووە، بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی عێراق (١٩٨٨ز).

340 سادق مەحمود ئەلجومەیلی لە گۆڤاری ((المورد العراقية))دا بەرگی ١٢ ژمارە ٤ (١٩٨٣) توێژینەوەی لە سەر کردووە.

341 دەستنووسێکە لە ئەیاسۆفیاو گەنجینەی گشتی ریبات.

342 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٢، ل ٥٣.

١٧٤ك- گرێبەستی گیراوەبەری پێویست بۆ هاونشینی پاشاکان (العقد المسلوك فيها يلزم جليس الملوك)[٣٤٣].

١٢٩ن- (موسى بن يوسف أبوحمو بن زيان) کۆچکردووی ٧٩١ك/١٣٨٩ز.

ویژەوان، شاعیر لە پاشایانی مەغریب، لە غەرناتە لەدایك بووە، دایك و باوکی دوورخراوەبوون بۆ ئەوێ، دواتر لەگەڵ باوکیدا چوو بۆ تلسمان و لە تونس گیرسایەوەو پاشایانی ((بنی حفص)) یارمەتییان دا بۆ وەرگرتنەوەی وڵاتەکەی لە دەستی بەنی مەرین، لە تلسمان دەوڵەتەکەی دامەزراند، دواتر یەکێك لە کوڕەکانی بەناوی عەبدوڕڕەحمان لە دژی راپەڕی و ناچاربوو یارمەتی لە بەنی مەرین وەربگرێ و لەگەڵ باوکیدا لە جەنگێکدا رووبەڕوو بوونەوەو باوکی کوشت[٣٤٤].

١٧٥ك-هۆکاری رەفتار لە سیاسەتی پاشایاندا (واسطة السلوك في سياسة الملوك)[٣٤٥].

ئیبنو زەیان ئەم کتێبەی بۆ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی نووسی بۆ ئەوەی وڵاتەکەی پێ بەڕێوە ببات، هەمان کوڕی کە دواتر کوشتی. کتێبە لە چوار بەندا رێکخراوە، لە یەکەم و دووەمیدا باسی بنەماکانی پاشا دەکات کە بریتییە لە دادپەروەریی و رەوشتبەرزیی و زاڵکردنی ژیریی بە سەر ئارەزوودا و هەبوونی پارێزگاریی و پاراستنی خەزێنە و پاراستنی سوپاو سەربازان. لە سێیەمدا باسی ئەو خەسڵەتانە دەکات کە پێویستە سیستمی

---

343 سەرچاوەی پێشوو، ب ١٢، ل ٥٣.

344 سەرچاوەی پێشوو، ب ١٢، ل ٥٣.

345 لە تونس چاپ کراوە، (مطبعة الدولة التونسية) ١٢٧٩ك و بریتییە لە ١٧٤ لاپەڕە.

پاشایەتیی خۆی پێ بڕازێنێتەوە، وەکو بەخشین و لێخۆشبوون و لە سەر خۆبوون، لە چوارەمدا باسی مەسەلەی زیرەکی و بیرتیژیی دەکات کە لە لای ئەو کۆتاییەکی سیاسیی هەیە.

١٣٠ن– (نەناسراو) لە ساڵی (٧٩٥ک/١٣٩٣ ز)دا زیندوو بووە.

١٧٦ک– ڕەوشتجوانیی پاشایان و ئەوەی کە پێویستە بگیرێتە بەر بۆ خزمەتیان لە ڕەوشتدا (محاسن الملوك وَ مايجب أن يتبع في خدمتهم من الآداب)[٣٤٦].

١٣١ن– (محمد بن أحمد بن بسام المحتسب) لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە[٣٤٧].

١٧٧ک– دواپلە لە داخوازیی حەسبەدا (نهاية الرتبة في طلب الحسبة)[٣٤٨].

ئەم کتێبە دەکرێت بە سەدو هەژدە بەندەوە، کە تیایدا باسی حەسبە دەکات، هەروەکو ئەوانی پێش خۆی باسیان کردووە، زۆر لە کتێبی شیزەرییەوە نزیکەو هەمان ناونیشانی هەیە بەڵام لە نێوەڕۆکدا وەکو ئەو نییە، بەڵکو جیاوازیشی هەیە، بەڵام ئەوەی کە جێگەی ئاماژەبێت ئەمەیە کە ئەو کتێبەی شیزەریی کاریگەری هەبووە لە سەر نووسەری ئەم کتێبە،

---

346 دەستنووسێکە لە (دار الكتب المصرية) ژمارە: ٢٢٩٨، هەروەها لە کتێبخانەی (گوبقۆسرای) ئەستەمبوڵ (ئەحمەدی سێیەم) ژمارە: ٣٠٥٢، هەروەها نوسخەیەکی وێنەگیراوی لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکان لە قاهیرە پارێزراوە، بریتییە لە ٧٧ پارچە.

347 سەرچاوەیەکم بۆ ژیان دەست نەکەوت، توێژەری کتێبەکەی بڕوای وایە کە ئەم کەسە بەرپرسیارێتی حەسبەی پێ دراوە.

348 (حسام الدين السامرائي) توێژینەوەی لە سەر کردووە، (مطبعة المعارف)، (١٩٦٨ز) و بریتییە لە ٢٢٥ لاپەڕە.

کـه بـه دامـەزراوەو چـەمکەکانی و هۆکارەکـانی دەسـت پێـدەکات و باسـی هەموو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەش دەکات.

١٣٢ن– (عبدالرحمن بن خلدون) ٧٣٢–٨٠٨ك/١٣٣٢–١٤٠٦ز.

عەبـدوڕڕەحمان کـوڕی موحەممـەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی حەسـەن کوڕی موحەممـەد ئەلحـەزرەمی بـە رەگـەز ئیـشبیلی و لـە تـونس لـەدایك بووە، دواتر چۆتە قاهیرە. مالیکیی، زانا، وێـژەوان، مێـژوونووس، حـەکیم، لە شاری فاس ئەمیندار (کتابة السر)ی پێ سپێردراوە، چووە بۆ غەرناتـە و بجایە لە ئەندەلوس لەوێ گیراوەو کاری بەوە گەیشتووە هـەتا گەڕاوەتـەوە بۆ تونس و فەرمانڕەواکەی ریزی لێگرتووە، دواتر فیتنەیی لەبارەوە کـراوە لە لای ئەو دەسەڵاتدارە و ناچـار هـەڵاتووە بـەرەو خۆرهـەڵات و دادوەریـی مالیکیی لە قاهیرە پـێ سـپێردراوە، ئـەو لەگـەڵ ئـەو سـەربازانەدا بـوو کـە بەرەو تەیموری لەنگ کەوتە رێ، سەرنجام لە قاهیرە کۆچی دوایی کرد[349].

١٧٨ك– پێشەکیی ئیبن خەلدون (مقدمة إبن خلدون)[350].

ئیبن خەلدون لـە سـاڵی ٧٧٩ك دا لـە نووسـینی بووەتـەوە، ناوبـانگێکی گەورەی بەدەست هێناوە، بەکارێکی ناوازەی بێوێنـەی مێـژووی ئیـسلامیی دەژمێردرێـت، بـەڵام بـەدوادا چـوونی فیکـری سیاسـیی ئیـسلامیی دەری دەخات کە ئەم کتێبە لە سەر بناغەی فیکـری پـێش خـۆی نوسـراوە بـەڵام زۆریان پێش خستووە، بەو شێوەیەی وا پێویست دەکات کـە فیکـری ئـیبن خەلدون و هەڵوێستی لە زنجیرەی فیکری ئیسلامیی بە جـوانی بخوێننـەوە،

---

[349] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٥، ل ١٨٨.

[350] چەندین جار توێژینەوەی لە سەر کراوەو چاپکراوە. کە من پشتم بەست بە لێکۆڵینـەوەی دکتـۆر عەلی عەبدولواحید وافی کە لە سێ بەرگدا دەرچووە.

بە بێ بڕینەوەو هەڵکێشانی لـە سـەر زەوییـە شارسـتانییەکەی، دانـانی بـە کارێکی کەسیی کە تێی ناگـەین لـە ژێـر رۆشـنایی فەلـسەفەی دیاردەکـانی کەسییدا نەبێت کە بریتییە لـە کـاری قارەمانـان و داهێنانـە هونەرییـەکان. پێش لە ئەو، دیدی دابەشکردنی پاشـایەتی بـۆ سـێ جـۆر لـە لایـەن ئیبنـو موقەفەعـەوە و هۆکارەکـانی ئـاوەدانی و پێویـستییەکانی لـە لایـەن ئیبنـو ئەبی رەبیع و دەمارگیریی و پێکهێنانی دەوڵەت لە سەری لە لایەن جوەینی و غەزالی لە کتێبـی ((سـر العـالمین))دا ئـاوەدانی و پەیوەنـدیی ئـەو لەگـەڵ دادگـەریی و سـتەمدا، ئیبنـو ریزوانـی مـالیقیی باسـیان کردبـوو. هـەروەها زانایان پێش لە ئەو بەهەمان ئـەو رایانـە یـان بـە شـێوەیەکی جیـاواز لـەوە بڕوادار بوون کە لە موقەدمەی ئیبنو خەلدوندا ئاماژەی پێدراوە. موقەدمەی ئیبن خەلدون یەك نووسراوی ئینسکلۆپێدیاییە کە پشکی سیاسـەت لـەوەدا لە زانستەکانی تر زیـاترە هـەتاوەکو دەکـرێ بـوترێ کـە بابـەتی سیاسـەت تەوەرەی سەرەکی دانانی ئەم کتێبەیە. بەو شێوەیەی کە دەکـرێ زۆربـەی بابەتە باسکراوەکان لە موقەددیمەدا ببەسـتێنەوە بـە کـاری سیاسـییەوە. ئیبنو خەلدوون باسی دەمارگیری وەکو چـەمکی بنـەڕەتی بـۆ توێژینـەوەی چـالاکیی سیاسـیی بـەکار هێنـا و لـە سـایەیدا ماهیـەتی پاشـایەتیی و قۆناغەکانی و جێگۆڕکێی دەوڵەتان و سیستمە سیاسـییەکان و پەیوەنـدیی پێـشکەوتن بـەم قۆناغـەوە بـاس دەکـات. ئـەو دواتـر باسـی جۆرەکـانی پاشایەتی و دیوانە جۆربەجۆرەکان بە تایبـەتی دیـوانی دارایـی و ئـابووریی دەکات و بڕوای وایە لە نێـوان چـالاکیی ئـابووریی دەوڵـەت کـە بریتییـە لـە ئاوەدانی و ئاوابوونی دەوڵەتەکان پەیوەندییـەکی تـەواو هەیـە. ئـەو باسـی مەسەلەی بەربەست (حجاب) یا بۆشایی کەوتنـە نێـوان پاشـاو رەعیـەتیش

قسەی کردووە و لە کۆتاییدا لەگەڵ باسکردنی چۆنیەتی زیان لێکەوتنی دەوڵەت، ئەم مەسەلەیە بەهۆی پێکهاتەی ئابوورییەوە دەزانێت. ئاشکراو روونە کە شێوەی ئەو بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی دیاردەی سیاسەت و دابەشکردنەکان، شێوەیەکی کارپێکراو بووە و زۆربەی بۆچوونەکانیش پێش خۆی پێشکەش کراون.

١٣٣ن- (القلقشندي) ٧٥٦-٨٢١ك/١٣٥٥-١٤١٨ ز.

ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵای قەلەقشەندی، لە قەلەقشەندە لەدایك بووەو لە قاهیرە نیشتەجێ بووە، وێژەوان تێگەیشتوو (فقیە)، شافیعیی، لە رەگەزناسییدا نووسیویەتی و جێگری فەرمانڕەوایی وەرگرتووە، خاوەنی کتێبی ((صبح الاعشی في صناعة الانشاء))[٣٥١].

١٧٩ك- جوامێرییە بەرزەکان لە نیشانەکانی جێنشینییدا (مآثر الانافة في معالم الخلافة)[٣٥٢].

ئەم کتێبە پێشکەشی خەلیفە موعتەزید (المعتضد) کرا کە لەساڵی ٨١٧ ك دا بەیعەتی درایە، ئەم بابەتگەلە باسدەکات: دیاریکردنی چەمکی خیلافەت و مەرج و رێگەکانی گرێدانی، ئەوەی کە پێویستە لە سەر خەلیفە بەرانبەر بە خەڵك ئەو ئەرکەشی کە لە سەر خەڵکە بەرانبەر بە خەلیفە، ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی لادانی خەلیفەو جێ نشینەکەی، ئینجا باسی ئەو ئەرکانە دەکات کە خەلیفە لە سەردەمەکانی مێژووی رابردوودا کردوویەتی و بەراوردی دەکات لەگەڵ ئەوەی کە لە سەردەمی خۆیدا کراوە، ئینجا

---

351 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالةَ) ب ١، ل ٣١٧.

352 (د. عبدالستار أحمد خراج) لێکۆڵینەوەی لە سەر کردووە، کوەیت (سلسلة التراث العربي ١٩٨٤ز)، بریتییە لە سێ بەرگ.

زنجیرەی خەلیفەكان لە سەرەتای ئیسلامەوە هەتا خەلیفە موعتەزید باس دەكات ئەوەش بە رەچاوكردنی دوو پێوەر، یەكەمیان: رووداوە گەورەكانی سەردەمی خۆی، دووەمیشیان فەرمانڕەوایی شارەكان و بارودۆخیان. دوای ئەوەش باسی ئەو وڵاتانە دەكات كە دەكەونە ژێر ركێفی خیلافەتەوە لەو سەردەمەدا و باسكردنی چۆنیەتی دیاریكردنی پاشاو فەرمانڕەواكان لە لایەن خەلیفەوە دەكات چ لە میسر یا شام یا مەدینەو عێراق. ئینجا باسی ئەوە دەكات كە چی دەنووسرا بۆ خەلیفەكان لە بەڵێندان (البیعة) لە سەردەمی كۆن و نوێدا ئەو نامەو پەیماننامانەش كە خەلیفەكان بۆ كاربەدەستان و فەرماندارانی شارەكانیان دەنووسی.

١٣٤ن- (محمد الناشري) ٧٣٣-٨٢١ك/١٣٣٢-١٤١٨ ز.

موحەممەد كوڕی عەبدوڵڵا كوڕی عومەر كوڕی ئەبوبەكر كوڕی عومەر كوڕی عەبدوڕڕەحمان كوڕی عەبدوڵڵا، ناشریی، یەمانیی، شافیعیی، خاوەن شكۆ و پلەو بەشدار لە مێژوودا[٣٥٣].

١٨٠ك- ئامۆژگارییە ئیمانییەكان بۆ خاوەن پۆستە فەرمانڕەواییەكان (النصائح الایمانیة لزوي الولایات السلطانیة)[٣٥٤].

١٣٥ن- (أبوبكر الحصني) ٧٥٢-٨٢٩ك/١٣٥١-١٤٢٦ ز.

ئەبوبەكر كوڕی موحەممەد كوڕی عەبدولموئمین كوڕی حەریز كوڕی موعەللای حیسنیی دیمەشقیی، شافیعیی، فەقیهو فەرموودەناس، لە حصن لە یەكێك لە گوندەكانی حۆران لەدایك بووە[٣٥٥].

353 (اعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٠، ل ٢٢٨.

354 إيضاح المكنون، البغدادي، ب٢ ل٦٤٩.

355 (اعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب٣، ل٧٤.

١٨١ك–نامەی پێشەوایەتی (رسالة الإمامة)[٣٥٦].

١٣٦ن– (أحمد المهدي) ٧٧٥–٨٤٠ك/١٣٧٣–١٤٣٧ ز.

ئەحمەد کوڕی یەحیا کوڕی مورتەزا (المرتضى) کوڕی موفەزەل کوڕی مەنسور کوڕی موفەزەل و نەژادی دەگەڕێتەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رەزای خوای لێ بێت)، یەمەنیی، زەیدیی، پێشەوا مەهدی، زانایەکی بەشدارە لە زۆرێك لە زانستەکاندا و لە سەنعا بەڵێنی (بیعة)ی دراوەتێ وەکو پێشەوا لە (٧٩٣ك)دا[٣٥٧].

١٨٢ك– کتێبی پێشەوایەتی (کتاب الإمامة)[٣٥٨].

١٣٧ن– (محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن ميكائيل الخيرميتي (الخيربيتي)) لە ساڵی ٨٤٥ك/١٤٤١ ز دا زیندووبووە. رێزدار و خاوەن پلەیەکی ئەشعەریی، حەنەفیی بووە[٣٥٩].

١٨٣ك– گەوهەری سپی بۆ ئامۆژگاریی فەرمانڕەوا و دادوەر و وەزیران (الدرة الغراء في نصيحة السلاطين وَ القَضاة وَ الوَزراء)[٣٦٠].

---

356 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی (الأصفدية) لە حەیدەرئاباد، ٩٢ کلام ف ٣١٧١، لەوەش نوسخەیەکی وێنەگیراو لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکان لە قاهیرە پارێزراوەو بریتییە لە ٦٠ لاپەڕە.

357 (إيضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ص ٢٠٦.

358 دەستنووسێکە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ژمارە ٥٨٧ و بریتی یە لە ٩٥ پارچە لە ق ١٥٩-٢٥٤.

359 (اعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١٢، ل ١٥٢.

360 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسری، ژمارە: ب ٢٣٢٩٢ (٦٢ پارچە، ٨٤٣ ك) ژمارە ٤١٢٠، (مباحث اسلامية طلعت) بریتییە لە ١٧٣ لاپەڕە لە ٨٧٤ ك دا مایکرۆفیلم ١٠٠٨٩، نوسخەیەکی لە فلیشەری ئەڵمانیایە، هەروەها ((دار الكتب الظاهرية)) دیمەشق ژمارە ٢٧.

نووسەر بەم کتێبەیدا ناسراوە بەڵام ناکۆکیی هەیە لەسەر مێژووەکەی، بە پێی ئەوەی لە دەستنووسی ژمارە: ٤١٢ (مباحث إسلامية طلعت) لە شەوالی ٧٤٤ی کۆچییدا لەم دانراوەی بووتەوە، پێشکەشی سوڵتان موعزولئەشرەف خەلیل کوڕی شاهین زاهیری لە مەلایتە کرد، بەڵام بە پێی قسەی حاجی خەلیفە لە کتێبی ((کشف الظنون))دا پێشکەشی سوڵتان میسر ئەبو سەعید چەقمەق کراوە، ئیبنو فەیرۆز ئەم کتێبەی بۆ زمانی تورکیی وەرگێڕاوە و پێشکەشی سوڵتان سەلیمی دووەمی کردو ناوی نا (الغرة البيضاء في نَصيحة السلاطين وَ القضاء وَ الوُزراء)[361].

کتێبەکە لە دە بەنددا ڕێکخراوە، لە بەندی یەکەمدا پێناسەی خیلافەت دەکات، پێناسەیەکی دەکات کە سنوور بۆ هەر گفتوگۆیەك دادەنێت لە سەر فەرمانڕەوایی سیاسیی لە ئیسلامدا و بەراوردی بە دەسەڵاتی سۆقراتی لە فیکری خۆرئاواییدا، تیایدا دەڵێت: ((خیلافەت سەرۆکایەتیی گشتییە لە کاروباری دین و دونیادا، جێنشینی پێغەمبەر نییە لە پلەکەیدا بەڵکو جێنشینی پێغەمبەرە (ﷺ) لە بەرپاکردن و جێبەجێکردنی یاسا شەرعییەکان و پاراستنی سنووری قەڵەمڕەوی ئیسلامییە، ئەو لە درێژەیدا، باسگەلی پێشەوایەتیی، مەرجەکانی، حیکمەتی پێشەوایەتیی و بنەماکانی، هەروەها وەزارەت و ئۆرگانەکانی تریش لە دامەزراوە و مەسەلە شەرعییەکانی پەیوەندیدار بە فەرمانڕەوایان و فەرمانداران و دادوەران باس دەکات.

١٣٨ن– (إبن الحجر العسقلاني) لە ٨٥٢ك/١٤٤٩ زدا لە ژیاندا بووە.

361 (كشف الظنون، حاجى خليفة) ل ٧٤١.

موحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی حەجەری عەسقەلانیی، میسریی، شافیعییە[٣٦٢]. (هاوچەرخی دەوڵەتی مەمالیکی برجیی و دەوڵەتی عوسمانیی لە ئەنادۆڵدا بووە).

١٨٤ك– نامەیەك لە مەسەلەی کڕینی زەویەك لە لایەن سولتانەوە بۆ خۆی بە دارایی خەزێنە (رسالة في مسألة شرار السلطان لأرض من بين المال لنفسه)[٣٦٣].

وەڵامی پرسیارگەلێکە وەکو ئایا پاشا دەتوانێت بە دارایی خەزێنە بۆ خۆی شت بکڕێت؟ ئایا مافی کڕین و فرۆشتنی هەیە؟

١٣٩ن– (محمد بن محمد خليل الأسدى) لە ساڵی ٨٥٤ك/١٤٥٠ز دا لە ژیاندا بووە. خاوەن پلەوپایە و رێزە و بە کتێبی (التيسير وَ الاعتبار) ناسراوە[٣٦٤].

١٨٥ك– ئاسانکاریی و پەندوەرگرتن و نوسین و تاقیکردنەوە لەوەدا کە پێویستە لە چاك مامەڵە کردن و تاقیکردنەوەی کاروباری وڵاتانی ئیسلامییدا (التيسير وَ الأعتبار وَ التحرير وَ الإختيار فيما يجب وَ حسن التصرف وَ الاختيار في شؤون الممالِك الاسلامية)[٣٦٥].

ئەم کتێبە پێشکەشی رێکخەری دیوانەکانی نووسین و نووسەری نهێنیی میسر کراوە، لە پێشەکییەك و چوار بەند پێکهاتووە. لە سەرەتادا باسی

---

362 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٨، ل ٢٩٥.

363 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی کوبلری لە تورکیا لە کۆمەڵەی ژمارە: ١٦٢٩.

364 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١١، ل ٢١٤.

365 (د. عبدالقادر طليمات) لێکۆڵینەوەی لە سەر کردووە، قاهیرە (دار الفكر العربي ١٩٦٨ ز)، کە پێکهاتووە لە ٨٥ لاپەڕە.

ڕۆڵی زانست لە چاکسازیی و گرنگیی ئامۆژگاریی و بیرخستنەوە دەکات. ئینجا دە بەڵگە نەویست، یا دە بنەما وەکو خۆی دەڵێت دادەنێت، لە بەندی یەکەمدا باسی ئەو رووداو کارەساتە نوێیانە دەکات لە وڵاتانی ئیسلامییدا و ئەوەی کە بووەتە هۆی ئەو گەندەڵییەی کە کەموکورتی و گرفتی لە حاڵ و کاروباری تاك و کۆمەڵدا دروست کردووە، ئەوەی کە لە میسر روویداوە لە دیاردە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکان کە کاریگەریی سیاسییان هەبووە، بە تایبەتی مەسەلەکانی گرانیی و برسێتیی و ستەمی کۆمەڵایەتیی.

لە بەندی دووەمیشدا باسی تەگبیرو سیاسەتی چاك و ئەوەش کە پێویستە لە پاراستنی پلەو پایەو ڕێزی زانایان و گەورە پیاوان و سەرکردەکان، کە بە شێوەیەکی سەرەکی جەخت لە سەر گرنگیی ڕۆڵی زانایان دەکات، کە چۆن پێویستە پارێزگاری بارودۆخ و ڕێزیان بگرێت لە بەندی سێیەمیشدا باسی بارودۆخی ئابووریی و بەتایبەتی گرانیی و گزیکاریی و زەوتکاریی و نرخدانان و دراوەکان (نقود) دەکات، چۆنیەتی کاریگەرییان لە سەر رەعیەت و ئاوەدانیی وڵات باس دەکات و ئینجا راڤەی ئەو شێوازە دەکات کە چۆن دەکرێ لەم قەیرانانە دەربچین.

لە بەندی چوارەمیشدا باسی ئەوە دەکات کە پەیوەندیدارە بە فەرمانڕەوایانی موسڵمانانەوەو ئەوەی کە پێویستە لەسەریان لە چاودێری ئەو فەرمانانەی کە شەرع پێویستی کردوون لە دادپەروەریی و سەرخستنی دین.

١٨٦ك– پرشنگە درەوشاوەکان و شوێنی دەرکەوتنی نهێنییەکان لە ئامۆژگاریی تەواو بۆ بەرژەوەندییە گشتیی و تایبەتییەکان (لوامع الأنوار وَ مطالع الاسرار في النصيحة التامة لمصالِح الخاصة وَ العامة)[٣٦٦].

ئەم کتێبە کە یەك ساڵ پێشتر لە نووسراوی پێشوو نوسراوە، پێشکەش جێنشینی فەرمانڕەوا (سوڵتان) کرا، هەتا هاندەری بێت بۆ بڵاوکردنەوەی دادپەروەریی. ئەو لەم کتێبەدا باسی فەرمانداران (والییەکان)ی میسر، پارێزەرانی ئەم سەرزەمینە و پاسەوانانی، جیدیبوون و هەوڵی کارگوزاران و خزمەتکاران لە فەرمانداری لە فەرمانەکانی فەرمانڕەوا، دەسەڵاتداران، فەرمانداران، کۆڵەکەکانی دەوڵەت لەوانە دادوەران و جێنشینانیان، وەزیران کارمەندانی حەسبە، پارەو بازرگانی باس دەکات و هۆکارەکانی کەموکورتییەکانی هەبوو (موجود) لە میسردا ئاماژە پێدەدات.

١٨٧ك– ئامۆژگاری تەواو لەوەی کە پەیوەندییدارە بە بەرژەوەندیی شوان و رەعیەتەوە (النصيحة الكليةفي كل ما يتعلق بمصالِح الراعي وَ الرَعية)[٣٦٧].

١٨٨ك– ئاماژە بەرزەکان لەوەدا کە گرفت و گەندەڵیی و چاکسازیی لە باری خەڵکدا دروست دەکەن (الاشارات العلية فيما يوجب الخلل وَ الفَساد وَ الصلاح في أحوال الرعية)[٣٦٨].

١٤٠ن – (إبن عربشاه) ٧٩١–٨٥٤ك/١٣٨٩–١٤٥٠ ز.

---

366 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ١١، ل ٢١٤، هەروەها نووسەر لە سەرەتای کتێبی (التيسير وَ الاعتبار)دا باسی دەکات.

367 نووسەر لە سەرەتای کتێبی (التيسير وَ الاعتبار)دا باسی دەکات.

368 نووسەر لە سەرەتای کتێبی (التيسير وَ الاعتبار)دا باسی دەکات.

ئەحمـەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی عەبـدوڵڵا کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی عەرەبـشای لـە بنەچـەدا دیمەشـقیی، ڕۆمیـی، حەنـەفیی، ناسـراوە بـە عەجەمیی، وێژەوان، مێژوونووس، بەشدار لە زۆری زانستەکاندا وەکو فیقهو زمان و نەحو و بەلاغە، لە قاهیرە کۆچی دوایی کـردووە، لـە نوسـراوەکانی: ((غرة السير في دول الترك وَ التتر))[٣٦٩].

١٨٩ك– میـوەی جێنـشینان و گفتوگـۆی ژیرەکـان (فاكهـة الخلفـاء وَ مضاكهة الطرفاء)[٣٧٠].

ئەم کتێبە هـەروەکو ((کەلیلـەو دیمنـە)) لـە سـەر زمـانی گیانلەبـەران و باڵندەکان مەسەلەکانی سیستمی سیاسیی دەخاتە ژێر بـاس و توێژینـەوە. بەڵام بە جیاوازی کەلیلەودیمنە باسگەلی هەروەکو حیکمەت و ڕەوشت بـاس نەکراون و تەنها مەبەست سیستمی سیاسیی بووە، بـەپێی قـسەی نووسـەر ((ئـەم بەرهەمـە لـە داڕشـتنێکی جـوان و سەرنجڕاکێـشدا بـۆ پاشـایان و فەرمانـداران و بەرپرسـانی دادگـەریی و سـەرکردە و گـەورەکان نووسـیوە، هەتا لـە چوارچـێوەی نوکتـەی پەندهێنـەردا، خەسڵەتەکانی دادپـەروەریی هەتا لە ژیان و حاڵی ئەوانی ترو ڕەوشتی پەسند بیربکەنەوە، ئەم نووسینە مایـەی خۆشـحاڵیی وێـژەوان و پەنـدوەرگرتنی بیرمەنـدان لـە پاشـایان و جێنشینان و فەرمانداران و دەست و پێوەنـدان لـە دە بەنـددا ڕێکخـراوە)). ئیبنـو عەرەبـشا نووسـینەکەی خـۆی بـە بابـەتی بـە هـاودەمی پاشـایان و ئامۆژگاری ئەوان دەستی پێکردو لـە درێـژەی مەسـەلەگەلی هـەروەکو بـەها

---

369 (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٢، ل ١٢٢.

370 چاپکراوی قاهیرە (١٢٩٠ ك)، بریتییە لە ٢٥٣ لاپەڕە.

سیاسیی و ئۆرگانییەکانی سیستمی سیاسیی، راوێژ و دادگەریی لـە رێگـەی گفتوگۆی نێوان گیانلەبەرانەوە باس دەکات.

ئەو خاڵەی کـە دەمێنێتـەوە ئەوەیـە کـە نووسـینی کتێبەکـە لـە زمـانی گیانلەبەرانـەوە نیـشاندەری کاروبـاری سیاسـیی، کـە لـە نـاوەڕۆکی گوتـار دەردەچـێت و ئامــاژەی بــە هەلومــەرجێك دەکـات کــە نووســەری بــەرەو مامەڵەی نوسراوەکانی پێشوو داهاتووشدا بەناوبانگە.

١٤١ن– (علـي بـن أحمـد بـن محمـد الـشيرازي) ٧٨٨–٨٦١ ك/١٣٨٦–١٤٥٧ز.

فـەقیهو ئوسـوڵیی شـافیعیی، نـەحویی، مـەنتیقیی، سـۆفیی، توێـژەری قورئان، لە بەغدا لە دایك بووە و لە مەککە کۆچی دوایی کردووە[٣٧١].

١٩٠ك– دیــاریی پاشــا و فــەرمانڕەوایان لــە رەوشــت و دەســەڵات و وەزارەتدا (تحفة الملوك وَ السلاطين في الاخلاق وَ السلطنة وَ الوَزارة)[٣٧٢].

ئەم کتێبەی پێـشکەشی فـەرمانڕەوای مـەمالیکی میـسر، سـوڵتان ئـەبو سەعید جەقمەق (٨٤٤–٨٥٧ ك) کردووە، کە بریتییە لە پێشەکی و حـەوت بەند. شیرازیی لە سەرەتادا گرنگیی زانستی عـەقڵیی و نـەقڵیی، خەسـڵەتی شایستەی زانایان و پێویستیی جیاکردنەوەی زانایانی راستەقینە و نەفامان و فێڵبـازانێ کـە نـاوی زانایـان لـە خۆیـان نـاوە، بـاس دەکـات. لـە بەنـدی یەکەمـدا کـە باسـی خیلافـەت دەکـات، باسـگەلی وەکـو راسـتیی (حَقيقـةَ)، پێویستیی و گرنگیی خیلافەت، ئەو گەندەڵییانەش کە بەهۆی نەبوونییـەوە

---

[371] (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٧، ل ٢٦.

[372] دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمارە: ٧٢ (إجتماع تيمـور)، مـایکرۆفیلم ١٢٠٨٤، بریتییە ٥٩ پارچە.

روو دەدەن و ئەنجامی پۆزەتیڤی هەبوونی وەکو چاکسازی دین و دونیا، فەرمانداری خەلیفە دەبێتە هۆی چاکسازیی و دژایەتی ئەویش دەبێتە هۆی گەندەڵیی و ماڵوێرانیی.. باس کراوە. لە بەندی دووەمیشدا کە تایبەتمەندە بە باسی فەرمانڕەواییەوە، لەودا ماهیەتی فەرمانڕەوایی، مەرجەکانی فەرمانڕەوا، ئەرکەکانی فەرمانڕەوا، گرنگیی دادپەروەریی، گرنگیی هەبوونی بۆ چاکتربوونی بارودۆخ، مەترسیی ستەم و ئەو گەندەڵییانەی کە لێی دەکەوێتەوە، سەرنجدراوە. مەبەست لە فەرمانڕەوایی لێرەدا هەمان سەرۆکایەتیی ژیریيە و خیلافەت هەمان ناوی ئەو پۆستەیە کە بووبوویە هۆی پەیوەندی پاشایان، یا وڵاتانی ئیسلامیی پاش کەوتنی بەغداو گوێزرایەوە بۆ قاهیرە و دواتر بۆ قوستەنتەنییە، لە بەندی سێیەمیشدا باسی ئەمیران و ماهیەتی دەسەڵات و بەرژەوەندیی و ئەو چاکەیەی کە لە سەر بناغەی ئەو بەدیی دێت، پێویستیی فەرمانداریی ئەمیر، لە خودا و پێغەمبەر و سوڵتان باس دەکات.

لە بەندی چوارەمدا باسی ئەرکەکان لە زانایان دەکات و ئەوەی کە لە سەریانە لە ئامۆژگاریی دەسەڵاتدار (سوڵتان)دا. لە بەندی پێنجەمیشدا باسی خاوەن ئەرکە ئاینییەکان دەکات و ئەوەی پێویستە لە سەریان لە فەرمانبەرداریی و ئامۆژگاریی و ئەوەش پێویستە دەرهەقیان بکرێت لە چاودێریی و تەگبیرکردنیان. بەندی شەشەمیش باسی خاوەن پیشەکانە. بەندی حەوتەمیش باسی جەماوەر (رعیە)ەو جۆر و چینەکانیان دیاریی دەکات و ئەوەی کە لە سەریانە لە ئامۆژگاری خوداو پێغەمبەر و فەرمانڕەوا وەربگرن و ئەوەش کە لە سەر فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارە کە دادپەروەریی و چاکە بەرانبەریان بەرپا بکەن.

١٤٢ن- (صالح البلقيني) ٧٩١-٨٦٨ ك/١٣٨٩-١٤٦٤ ز.

ساڵح کوڕی عومەر کوڕی ڕەسلان کوڕی نەسیر کوڕی ساڵحی کینانیی عەسقەلانیی، بە ڕەچەڵەك بەڵقینیی، قاهیریی، شافیعیی، فەقیهو فەرموودەناس، قسەزان، توێژەری قورئان، ڕێکخەر، لە قاهیرە لەدایك بووەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٣٧٣].

١٩١ك- ڕوونکردنەوەی بەڵگە لە پەسنی دەسەڵاتداردا (إيضاح البرهان في الثناء على السلطان)[٣٧٤].

نامەیەکە بۆ هاندانی خەڵك لەسەر فەرمانداریی دەسەڵاتدار (سوڵتان).

١٤٣ن- (عمر بن موسى بن محمد الرجراجي) کۆچکردووی ٨٦٨ ك/١٤٦٤ ز[٣٧٥].

١٩٢ك- نامەیەك سەبارەت بە فەرمانڕەوایی و ئەوەی کە هەیانەو ئەوەی کە لە سەریانە (رسالة في السلطنة وَما للسلاطين وَما عليهم)[٣٧٦].

---

[373] (أعلام المؤلفين، رَضا كحالة) ب ٥، ل ٩.

[374] دەستنووسێکە لە گەنجینەی گشتیی ریبات، ژمارە: ٢٠٣ ك، لەوێش نوسخەیەکی تر لە زانکۆی ئەردەنی بە ژمارە: ١٨٠ پارێزراوە.

[375] لە بارەی ژیانیەوە شتێکم دەست نەکەوت.

[376] دەستنووسێکە لە گەنجینەی گشتیی کتێب و بەڵگەنامەکان لە ریبات، لەویش نوسخەیەك لە ئیسکۆریاڵ بە ژمارە: ١٩٢٧ بە ناونیشانی ((هداية و تولي غير الرب المولى في أُمور السلطنة وَمايجب على السلاطين و ما ينبغي عليهم وَ ماليس لهم))، هەروەها نوسخەیەکیشی لە گەنجینەی حەسەنییە لە مەغریب ژمارە: ٣٩١٢، بە توێژینەوەی (برۆلیۆ جۆستیل کلاوبۆسۆ) ( Broulio Justel Caloboso)یەو توێژینەوەیەکیش هەر ئەو کردوویەتی دەقەکەی بە ئیسپانی وەرگێڕدراوە لە لایەن پەیمانگای ئیسپانی عەرەبی رۆشنبیریەوە (ساڵی ١٩٨٣ ز) لە مەدرید چاپ کراوە.

له چوار بەنددا رێکیخستووەو له پێشەکییەکەیدا که نووسەر باسی مافی دەسەڵاتداران و ئەرکەکانیان دەکات.

١٤٤ن- (خلیل بن شاهین) ٨١٣-٨٧٣ ك/١٤١٠-١٤٦٨ ز.

شەیخیی، سەفەویی (صفوي)، زاهیریی (ظاهري)، تێگەیشتوو (فقیە) مێژوونووس، وێژەوان، شاعیر، لە بەیتولمەقدیس لەدایك بووە و لە تەرابلوس کۆچی دوایی کردووە[٣٧٧].

١٩٣ك- هەڵبژاردەی دۆزەرەوەی وڵاتان و باسکردنی رێگەکان و رێبواری پارێزکار (زبدة كشف الممالِك وَ بيان الطرق و المسالك)[٣٧٨].

ئەمە کورتکراوەی کتێبێکی پێشووی نووسەرە کە ناونیشانەکەی ((كشف الممالك و بيان الطرق و المسالك))ە و بریتییە لە چل بەند. بەڵام ئەم کتێبە بریتییە لە دوانزە بەند باسی جوگرافیای سیاسیی میسر لە سەردەمی خۆیدا باسەکەی دەست پێدەکات، دواتر فەرمانڕەوایی و خەسڵەتەکانی دەسەڵاتدار، ئەوەی کە دەسەڵاتدار بۆ پابەندیی بە پێویستییەکانی خەسڵەتی پاشایەتیی پشتی پێ دەبەستێت، دادوەران، ئەهلی (الحل و العقد)، زانانایان، مەرجەکانیان و ئەرکەکانیان و خەڵکی، وەزیران و خاوەن دیوانەکان جێگری دەسەڵاتدار، فەرمانڕەواکانی سوپا فەرماندارانی سەبازیی، ئۆرگانەکانی حکومەتی خۆماڵیی لە بیابان، گرنگیی پرد دروستکردن و دامەزراندنی کەناڵ و جۆگە ئاوییەکان و دابەشکردنیان، پێناسەی تەواوی سەرزەوییە ئیسلامییەکان و ئۆرگانەکانی سیستمی

---

377 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة)، ب ٤، ل ١٢٠.

378 چاپکراوی قاهیرە (دار العرب للبستاني) ١٩٨٩ ز، پێشتر بۆلس راویس لە شاری پاریس لە چاپخانەی کۆماریی (ساڵی ١٨٩٤ ز) چاپی کردووە.

سیاسـیی لەوێـدا، شـێخەکانی عـەرەب، ئـەمیرانی تـورك و کـوردو گرووپـە بازرگانییـــەکان باســـکراون. وەکـــو بڵێـــی ئـــەو توێژینەوەیـــەکی هـــەموو رەگەزەکانی چالاکیی سیاسیی پێشکەش دەکات.

١٤٥ن– (أحمد المحمدي الأشرفي) کۆچکردووی ٨٧٥ ك/١٤٧٠ ز.

حەنەفیی، مێژوونووس، زانا بە کاروباری سیاسیی[٣٧٩].

١٩٤ك– بەڵگـە لـە سـەر فـەزڵ و پلـەی سـوڵتان (البرهـان في فـضل السلطان)[٣٨٠].

١٩٥ك– پەیڕەوی رەوشت لـە ژیـانی پاشـایاندا (مـنهج الـسلوك في سـيرة الملوك)[٣٨١].

١٤٦ن– (طوغان شیخ المحمدي) لە ساڵی ٨٧٨ ك/١٤٧٣ ز دا لـە ژیانـدا بووە. میسریی، حەنەفی[٣٨٢].

١٩٦ك– سەرەتای سوڵتانیی بۆ سیاسەتی شەرعیی (المقدمة الـسلطانية في السياسة الشرعية)[٣٨٣].

---

379 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢، ل ١٧٠.

380 دەستنوسـێکە لـە کتێبخانـەی (رفاعـة الطهطـاوي) لـە سـوهاج (میـسر) ژمـارە: ٨٠ مێـژوو، هەروەها نوسـخەیەکیش لـە کتێبخانـەی (الظاهریـة)یـە لـە دیمەشـق بـە ژمـارە: ١٠٧٤٥، هـەروەها نوسخەیەکی وێنەگیراو لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکان لە قاهیرە و نوسـخەیەکیش لـە خانـەی کتێبی میسریی بە ژمارە: ٩٩٠٧ ئەدەب.

381 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی ئەیاسۆفیا لە تورکیا، هەروەها (هدية العارفين، رضا كحالة) ب ١، ل ١٣٣ باسی کردووە.

382 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٥، ل ٤٥.

383 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، فیقهی حەنەفیی ١٧٢٦ و بریتییـە لـە ١٨٤ پارچـە، هەروەها نوسخەیەکی ناتەواویشی لە زانکۆی مەلیك سعود بە ژمارە: ٤٠٠٤ بە ناونیشانی ((مقدمة في الاحكام السلطانية و السياسة الشرعية))، پارێزراوە.

نووسـەری ئـەم کتێبـە لـە سـاڵی ٨٧٨ کۆچـییدا پێـشکەشی سـوڵتان مەلیکولئەشـرەف قایتبـای کـردووە، کـە بریتییـە لـە پێـشەکییەك و نـۆزدە بەند، لـە سـەرەتادا باسـی گرنگیـی دەسـەڵاتدار (سـوڵتان) بـۆ کۆمەڵگـە و پێویستی ئەوەی کە دەبێ دەسەڵاتدار چاکخواز (صالّح) بێت باس دەکـات، ئینجا باسی هەڵوێستی قورئـانی پـیرۆز سـەبارەت بـە کاروبـاری دەسـەڵات دەکـات و ئایـەت و بەڵگـەکان لـە سـەر حـوکم بـە شـەرع هـەر هـەمان ئـەو بەڵگانەیـە کـە مـەودودیی و سـەید قوتـب لـە رەگـەزدۆزیی (تأصـیل)دا بـۆ بابەتی فـەرمانڕەوایی (الحاکمیـة)دا پـشتیان پـێ بەسـتووە. لـە بەنـدەکانی دواتردا باسی ئەوە دەکات کە پێویستە لە سەر فەرمانڕەوا لە رێزو رەوشت و جوانی، ئینجا باسی بابەتگەلی، شاهیدیی و حوکمە شەرعییەکان (حـدود) و سەرکۆنە و سزا (تعزیر) و حوکمـەکانی سیاسـەتی شـەرعیی و حەسـبە و ئەوەی کە پێیانەوە پەیوەستە لە بەها راگرەکانی کاری سیاسـیی، ئـەنجام بـدات کتێبەکـە زاراوەو چـەمکی سیاسـەتی شـەرعیی بـە مانـا زاراوەییـە ناسراوەکەی هەروەکو ئەوەی کە ئیبنو نەجیم و ددە ئەفەندیی نووسیویانە بەکار دەهێنێت.

١٤٧ن– (نەناسـراو) کتێبەکـەی ئاراسـتەی سـوڵتان مەلیکولئەشـرەف قایتبای کردووە.

١٩٧ك– ئاڵتونی داڕێـژراو لـە ئامۆژگـاریی پاشـایاندا (التـبر المسبوك في نصیحة الملوك)[٣٨٤].

کتێبەکەی بە مافەکانی خوداو زانینی پۆلێنی درووستکراوەکان و ئاستی مرۆڤ لە لای خوای پاك و بێگەرد دەست پێـدەکات، ئـەوەش کـە پێویـستە

[384] دەستنووسێکە لە زانکۆی قاهیرە، ژمارە: ٢٠٧١٤.

دەسەڵاتدار بیزانێت لەوەی کە لـە کتێبـە کۆنەکانـدا هـاتووە سـەبارەت بـە ڕەوشتی پاشایان و پێویستە شوێن پێـی خەلیفـەکانی ڕاشـیدین هـەڵگرێت، ئینجا باسـی شـوێنەواری دەوڵـەت لـە سیـستمی مرۆیـی گـشتییدا یـا ڕۆڵـی دەوڵەت لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی و جێگەی پێشەوا و سوپاو دادگەریی لـە دامەزرانیـدا دەکـات، چـونکە ڕەعیـەت بـە بـێ بـەرپاکردنی دادپـەروەریی ناتوانن بەرهەمهێن بن، ئینجا حەوت بناغەی سـەرەکی دادەنـێن کـە بـریتین لە: پاراستنی نهێنـی و قبوڵنـەکردنی ئامۆژگـاریی جگـە لـە کەسـانی ژیـر و دیندار، دەسەڵاتدار بە بـێ دڵنیـابوون لـە پارێزگـاربوون کـەس لـە خۆیـەوە نزیـك نەکاتــەوە، پێویــستە پــشت بــە کەســانی ڕاســتگۆ ببەســتێت بــۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و چاودێرییکردنیان، دەبێ هاتوچـۆی نوێنـەران و دانیشتن لەگەڵ زانایان و پارێزگاریی ڕێك بخات، دەبێ هـەواڵی ویلایەتـەکان لە هـەموو کاتێکدا بزانێـت، هـەروەها دەبـێ بەڵێنـەکانی بباتـە سـەر و درۆ لەگەڵ خەڵکیدا نەکات. نووسەر لە درێژەی سـەرنجی ڕەفتـاری دەسـەڵاتدار دەدات: چــۆن دەســەڵاتدار دەتوانێــت لــە خــوا نزیــك بکەوێتــەوەو بــە جێبەجێکردنی ئەرکـەکانی سەرشـانی سوپاسـی نیعمەتـەکانی پـەروەردگار بکات، چۆن فەرمانڕەوا لـە کاروبـاری خـەڵکی بکۆڵێتـەوە و مـافی ئـەوان لـە سـتەمکاران وەربگرێتـەوەو هەمیـشە دادپـەروەریی و ڕاوێـژ لـە کارەکانیـدا هەبێت و لەگەڵ کەسانێکدا ڕاوێژ بکات کە پاشا بـە بەرپرسـی ناکامیـەکانی خۆیان نەزانن و ئازاو خاوەن ڕا بن.

ئـەو جـەخت دەکاتـەوە لـە سـەر دەسـەڵاتدار کـە پاراسـتنی ئاسـایش پێویستە (واجب) ترە لە پاراستنی کورسـیی دەسـەڵاتەکەی. چـونکە هـەتا ئەوکاتەی کە خانوو پارێزراو نەبێت، ناوەوەشی پـارێزراو نابێـت. پێویـستە

**خێرابێـت لـە دەرکردنـی نێردراوەکـان (الـسفراء) دا لـە دەوڵەتـدا هـەتا پەیوەنـدیی لەگـەڵ سـەربازان و ئـەوانی تریـشدا نەبەسـتن و لـە دەرەوەی خۆیان کۆیان نەکەنەوە (یان دڵیان رانەکێشن بە لای خۆیاندا).**

**١٤٨ن– (محمد الكافيجي) ٧٨٨–٨٧٩ ك/١٣٨٦–١٤٧٤ ز.**

**موحەممەد کوڕی سولەیمان کوڕی سەعد کوڕی مەسعودی رۆمی، ناسراو بە کـافیجیی یـا کافیەچـیی، فـەقیهو ئوسـوڵیی، فـەرموودەناس، نـەحویی، توێـژەری قورئـان، سـۆفی، سـەرفیی (لقێکـی زانـستی زمـانی عەرەبییـە)، رەوانبێژ (بیاني)، مەنتیقیی، حەکیم، بیرکارییزان، لـە کەکجـەکی لـە وڵاتـی سەروخان لەدایك بووە و لە میسر ناوبانگی پەیـداکردووە و ((سـیوطي)) لـە قوتابی و هاوڕێیانی بووە، بوویە شێخی خانەقای شێخایەتی میسریی[٣٨٥].**

**١٩٨ك– شمشێری پاشاو فەرمانڕەواکان و رێنماییان بۆ رێگەی راسـت و فەرمانـــەکان (ســـیف الملـــوك و الحكـــام المرشـــدلهم الی ســـبیل الحـــق و الأحكام)[٣٨٦].**

**١٤٩ن– (علي القلصادي) ٨١٥–٨٩١ ك/١٤١٢–١٤٨٦ ز.**

**عــەلی کــوڕی موحەممــەد کــوڕی عــەلی قرشــیی، بەســتیی (البــسطي) ئەندەلوســیی، مــالیکیی، ناســراو بــە قەلــسادیی، مــەنتیقیی، عــەروزیی**

---

[385] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٠، ل ٥١. (إيضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل ٣٦.

[386] دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی ژمـارە: ٢٤ (إجتمـاع تیمـور) و ژمـارە: ٢٤٢٦٣ ب، بریتییە لە ٥١ پارچە. هەروەها لـە کتێبخانـەی جوتـا لـە بـەرلین ژمـارە: ١٨٨٤ A(٥٣ لاپـەڕە)، هەروەها لە پەیمانگای کەلەپووری زانستیی عەرەبیی لە حەڵەب بە ژمارە: ١٤٨٤ پارێزراوە.

(عروضـي) فـەقیهو فـەرموودەناس، سۆفی، نـەحویی لـە باجـە لـە ولاتـی ئەفەرەیقا کۆچی دوایی کردووە[٣٨٧].

١٩٩ك– ئامۆژگـاریی لـە سیاسـەتی گـشتیی و تایبەتیـدا (النـصیحة في السیاسة العامة و الخاصة)[٣٨٨].

١٥٠ن– (محمد المصري) کۆچکردووی ٨٩٣ ك/١٤٨٨ ز.

موحەممـەد کـوڕی عەبـدوڕڕەحمانی میـسریی، مەقدیـسی، شـافیعیی، خاوەن پلەوڕێز (فاضل)[٣٨٩].

٢٠٠ك– پێـشکەشکردنی ئامۆژگـاریی شـەرعیی بـۆ ئـەوەی لەسـەر دەسەڵاتدار و فەرماندار و تەواوی جـەماوەرە (بـزل النـضائح الـشرعیة فیهـا علی السلطان و ولاة الأمور و سائر الرعیة)[٣٩٠].

١٥١ن– (محمد بن الأزرق) کۆچکردووی ٨٩٦ ك/١٤٩١ ز دا.

موحەممەد کوڕی عـەلی کـوڕی موحەممـەد کـوڕی ئـەزرەق، ئەسـبەحیی (الأصبحي)، غەرناتیی، ئەندەلوسیی، مالیکیی، فەقیهە و لە دادوەرانە و لە هەندێ زانستدا بەشداریی کردووە، لە غەرناتە دادوەری پێ سپێردراوە هەتا ئەو کاتەی کە فەرەنگ (أفرنجة) داگیریان کرد، ئیتر کۆچی کرد بۆ تلمسان

387 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ٧، ل ٢٣٠.

388 (إیضاح المکنون، البغدادي) ب ٢، ل ٦٥٤، ((هدیة العارفین، البغدادي)) ب ١، ل ٧٣٧.

389 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ١٠، ل ١٥٦.

390 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی نیشتیمانیی پاریس بە ژمارە: ٢٤٥١ و بریتی یە لە ١٢٩ لاپەڕە. نوسخەیەکی وێنەگیراویش لە سەر مـایکرۆفیلم لـە زانکـۆی ئەمـەریکیی لـە بـەیرووت (Mic-A-359) پارێزراوە، خاوەنی ((هدیـة العـارفین)) ب ٢، ل ٢١٠ داویەتـە پـاڵ ئـەم نووسـەرەو بـەڵام لـە سەرچاوەی تردا ئەم کتێبە دراوەتە پاڵ موحەممەدی ئیشپیلی و ئیبنو رەفعە.

و دواتریش بەرەو خۆرهەڵات، چوو بۆ حەج و گەڕایەوە بۆ میسرو لە قودس کۆچی دوایی کردووە[٣٩١].

٢٠١ك– پەتی سەرنجڕاکێش لە سروشتی پاشادا (بدائع السلك في طبائع الملك)[٣٩٢].

ئەم کتێبە دابەش دەبێت بۆ دوو پێشەکی و چوار کتێب کە هەر کتێبێك بریتییە لە دوو بەند. لە پێشەکی یەکەمدا باسی هۆکارە ژیرییەکان دەکات، کە توێژینەوە لە سەر پاشاو پێویستییەکانی بکرێت، باسی بیست هۆکار دەکات، لەوانە کۆبوونەوەی مرۆیی پێویستە. لە پێشەکی دووەمدا باسی هۆکارە شەرعییەکانی بوونی پاشا دەکات، بیست مەسەلە باس دەکات وەکو ئەوەی کە فەرمانڕەوای گێڕەرەوە پێویستە.

لە کتێبی یەکەمدا باسی راستییەکانی دەسەڵات و خیلافەت و جۆرەکانی تری سیستمی سیاسیی و مەرج و هۆکاری بوونی ئەوان باس دەکات. باسەکانی کتێبی دووەمیش بریتییە لە بنەما و ئوسوڵی پێویستیی و تەواوی پاشایەتیی و هەروەها ئەو چالاکییانەی کە رووی پاشایەتیی ئاشکرا دەکەن، لەوانە دیارییکردنی وەزیر، بەرپاکردنی شەریعەت، دابینکردنی هێزی سەربازیی، پارێزگاری لە دارایی، ئاوەدانی، جێ بەجێکردنی دادگەریی، سەرپەرشتییکردنی بەرنامە ئاینییەکان، رێکخستنی ئاستەکانی پاشایەتیی و دروستکردنی زەمینە بۆ ئەنجامدانی کارەکان بە چاکترین شێوە، لەوانە زانست، ژیریی، ئازایەتیی، پاکداوێنیی،

---

[391] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١١، ل ٤٣.

[392] (د. علی سامي النشار) توێژینەوەی لە سەر کردووە، بەغداد وەزارەتی راگەیاندن، بەرگی یەکەم (١٩٧٧ ز) و بەرگی دووەم (١٩٧٨ ز).

دەستکراوەیی، بەخشین، ئارامگریی و کینەخواردنەوەو خۆکۆنترۆڵکردن لـە تووڕەیی باس دەکات، کتێبی سێیەمیش تایبەتمەندە بە باسـگەلێکەوە کـە پاشـا بـە ئەنجامـدانیان دەیانکاتـە هۆکـاری بـەهێزکردنی کۆڵەکـەکانی دەسەڵاتی خۆی، لەوانە پاراسـتنی دیـن، جێبـەجێکردنی سـنوور (حـدود)ە شەرعییەکان و فەرمانەکانی ئایین و ئەوەی کە دەبێتە هـۆی سیاسـەتگەلی و تەگبیری گونجاو لە لایەن پاشاوە، ئەو سیاسەتانەی کە ئەو لە بەرانبەری تایبەتەکانەوە لەوانە وەزیران یا رەعیەت و یا کارەساتی چاوەڕوان نـەکراو یـان جیهـاد دەگرێتەبـەر، لـە کتـێبی چوارەمیـشدا باسـی بەربەسـت و گرفتـەکانی دەسـەڵات کـراوە، ئـەو گرفتانـەی وەکـو ئارەزووپـەرسـتیی و لەناوبردن و سەرشۆڕپێکردن، تـەنها تایبەتمەنـدکردن ڕێـزو شـکۆ تـەنها بـۆ خۆو بەربەست دانان لە نێوان خەڵك و رووکردنە دەمارگیریی و سامان.

١٥٢ن- (عزالدین الهادي الی الحق) ٨٤٥-٩٠٠ ك/١٤٤١-١٤٩٥ ز).

عیـزەدین کـوڕی حەسـەن کـوڕی عـەلی کـوڕی موئەیـد کـوڕی جیبریلـی یەمـەنیی، لـە پێـشەوایانی زەیدییـە، نازنـاوی (الهـادي الی الحـق)ی درایـە، خەڵکی ((فللة)) بەڵێنیان دایە و وڵاتی سودەو کەحلان و شەرقین و شامییە لە یەمەن گوێڕایەڵیی و فەرمانداری بوون، لە سەنعا کۆچی دوایی کرد[٣٩٣].

---

393 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٦، ل ٢٨٥.

٢٠٢ك– نامەیـــەکی ڕەوان لـــە ڕوونکردنـــەوەی حوکمـــە ســـەلمێنەرو ڕەتکەرەوەکانی پێشەوایەتییدا (رسالة غراء في بيان أحكام مثبت الإمامة و نافيها)[٣٩٤].

١٥٣ن– (نەناسراو) کتێبەکەی ئاڕاستەی سولْتان ((قنصوه الغوري)) کردووە.

٢٠٣ك– ڕەوشتی پاشایان (آداب الملوك)[٣٩٥].

ئەم کتێبە بە چواردەوری دادپەروەریی دەسەلاٌت و خواپەرستەکاندا دەسوڕێتەوە، وایدەبینیٚ کە سولْتان سێبەری خوایە لە سەر زەویدا بەو مانایەی کە پێویستە خۆی بڕازێنێتەوە بە ڕەوشتی خوایی و دەبیٚ دادگەر و یارمەتیدەر و بەبەزەیی بێت.. هتد. لە سەریەتی کە خاوەنی جوانترین خەسلْەت بێت لە مامەلْەی لەگەلْ ڕەعیەتدا و جەخت بکاتەوە لە سەر چەمکی دادپەروەریی، پێویستە لە سەری گرنگی بدات بە کاروباری ئایین، چونکە سروشتی خەلْکی ڕاست نابێتەوە بەوە نەبێت، لە سەریەتی کە گرنگی بدات بە ئاوەدانکردنەوە و ئاگای لە کەسانی تایبەت بێت کە ستەم نەکەن و چاودێریی فەرمانداران و کاربەدەستان بکات لە هەلْسوکەوتیان لەگەلْ خەلْکدا.

394 دەستنووسێکە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ژمارە: ١١٢، کە خاوەنی کتێبی ((هدیە العارفین))یش بە ناونیشانی ((العناية التامة في شرح مسائل الامامة)) ب ١، ل ٦٦٣ دا ئاماژەی پێداوە.

395 (د. محمد نصر مهنا) لە باسێکدا بە ناونیشانی (محمد الفكر السياسي المصري: دراسة وتحقيق و مناقشة حول إشكاليه التراث)، (ندوة العلوم السياسة في الوطن العربي، لارناكار – قبرص ٤-٨ فبراير ١٩٨٥ م).

١٥٤ن– (نەناسراو) ئەم کتێبە ئاراستەی سوڵتان ((قنصوه الفوری)) کردووە.

٢٠٤ك– بیرخەرەوەی پاشایان بۆ جوانترین هەڵسوکەوت و رەوشت (تزكرة الملوك الى أحسن السلوك)[٣٩٦].

ئەم کتێبە دابەش دەبێت بۆ چوار بەند، یەکەمیان ئەوەیە کە پاشا دەبەستێتەوە بە چاودێریی خۆیەوە لە چاککردنی حاڵی رەعیەتەکەی و بە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) نموونە دەهێنێتەوە. دووەمیان رۆڵی وەزیر لە ئامۆژگاریی و گرنگیی راوێژە و پێویستە پاشا پابەندبێت پێیانەوە. لە سێیەمیشدا ئەوەی کە پێویستە لە سەر دادوەران لە جێبەجێکردنی فەرمان و گرنگیی بەرپاکردنی دادپەروەرییدا.

لە چوارەمیشدا ئەوەی کە پێویستە بۆ پاراستنی سەربازان و ئاگاداربوونی لە حاڵیان.

١٥٥ن– (يوسف المبرّد) ٨٤٠–٩٠٩ ك/١٤٣٦–١٥٠٣ ز.

یوسف کوڕی حەسەن کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدولهادی سالحیی، حەنبەلیی، ناسراو بە ئیبنولموبەڕەد، فەقیهو فەرموودەناس، قسەزان، نەحویی، سەرفیی، سۆفی بەشدار کردووە لە هەندێ زانستدا، لە دیمەشق کۆژی دوایی کردووە[٣٩٧].

---

[396] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی کتێبی میسریی ژمارە: ٢٣٩٨ (تأريخ)، مایکرۆفیلم ژمارە: ٣٥١٠١، هەروەها نوسخەیەکیش لە کتێبخانەی ئەیاسۆفیایە لە تورکیا، ژمارە: ٣١٤٤، نوسخەیەکیش لە زانکۆی ئەمەریکایی بەیرووتە بە ژمارە: (Mic-A-110).

[397] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٣، ٢٨٩.

٢٠٥ك– روونكردنــەوەی ڕێگاكــانی دامــەزراوی لــە باســی حــوكمی فەرماندااران و پێشەوايەتييدا (إيضاح طرق الاستقامة في بيان أحكام الـولاة و الامامة)[٣٩٨].

٢٠٦ك– ژيريی و وريايی لە سياسەتدا (الكياسة في السياسة)[٣٩٩].

ئــەم كتێبــە باســی حەســبەو ڕێــوڕەسمی و سياســەتی شــەرعيی و شارستانيی دەكات.

١٥٦ن– (محمد المغيلي) كۆچكردووی ٩٠٩ ك/١٥٠٣ ز.

موحەممەد كوڕی عەبدولكەريم كـوڕی موحەممـەد موغـەيلی تەلمـسانی، فەقيهو فەرموودەناس توێژەری قورئـان، قـسەزان، مـەنتيقيی، هاوچـەرخی پێشەوا ((سيوطي)) بووەو لە نێوانياندا نامە گۆڕينەوە ړوويداوە، چووە بـۆ سودان و وڵاتی تكرۆر بۆ بڵاوكردنەوەی فەرمانەكانی شەرع و بنەماكانی، لە توات لە نزيكی تەلمسان كۆچی دوايی كردووە[٤٠٠].

٢٠٧ك– تاجی ئايين لە پێداويستيی سەرشانی پاشاو دەسەڵاتداران (تاج الدين فيها يجب على الملوك و السلاطين)[٤٠١].

---

398 دەستنووسێكە لـە كتێبخانـەی ((الظاهريـة)) لـە ديمەشـق، ژمـارە: ٣٣٠١ و بريتييـە لـە ١٦٧ لاپەڕە.

399 دەستنووسێكە لـە كتێبخانـەی خاليديـە لـە فەلەسـتين، ژمـارە: ٦٥ ((١)) هـەروەها لـە لايـەن كەسێكی نادیارەوە لە پەراوێزدا دراوەتە پاڵ (يوسف بن حسن بن احمد الصيداوي الـصالحی الحنفـي))، (زركلي) لە (الأعلام)دا ج ٨، ل ٢٢٥-٢٢٦ كتێبی لە بارەی حەسبەوە داوەتە پـاڵ ئيبنـو موبـەڕەد، لەبەر ئەوە گومان زاڵ بووە بەسەر ئەوەدا كە ناوبراو نووسەريەتی.

400 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٠، ل ١٩١.

401 لە قاهيرە چاپكراوە: (دار أحياء الكتب العربية-البابي الحلـبي حاليـاً) لـە كتێبخانـەی زانكـۆی قاهيرەش بە ژمارە: ٣٩٠٨٤ و لە ١٦ لاپەڕەدا پارێزراوە.

لەم کتێبەدا باسی ئەوە دەکات کە پێویستە لە سەر ئەمیر لە نیەتپاکیی و پارێزگاریی و دوورکەوتنەوە لە ئارەزوو، هەروەها پێویستە لە سەری کە رواڵەتی جوان بکات و وڵاتەکەی رێك بخات و ئاگادار بێت، ئەوەش کە پێویستە لە سەر دادوەران لە دادگەریی لە بڕیارەکاندا ئەو وای دەبینێت کە دەسەڵات دوو پێی هەیە ئەویش دادگەریی و چاکەکارییە، ئینجا باسی سەرچاوەکانی سامانی تایبەتی دەوڵەت و رووەکانی خەرجکردنی دەکات، یان چۆن دەبێ لە رێگەی حەڵاڵەوە پەیدابکرێ و بەشێوەیەکیش خەرج بکرێت کە خوای گەورە پێی رازی بێت.

١٥٧ن- (جلال الدين السيوطي) ٨٤٩-٩١١ك/٤٤٥-١٥٠٥ ز.

عەبدوڕڕەحمان کوڕی ئەبوبەکر کوڕی موحەممەد کوڕی ئەبوبەکری تۆڵۆنی (الطولوني) میسریی، شافیعیی، ناسراو بە جەلالەددینی سیوتیی زانایەکی بەشدارە لە چەندین زانستدا، لە قاهیرە بە هەتیویی پێگەیشتووە، کاتێ گەیشتە تەمەنی چڵ ساڵیی لە خەڵکی کەناری گرت و لە ((روحنة المقياس)) لە کەناری نیلدا خۆی دوورخستەوە لە تەواوی هاوڕێیانی و زۆربەی کتێبەکانی نووسی، لە قاهیرە کۆچی دوایی کرد[٤٠٢].

٢٠٨ك- نامەی ناسریی لە فەرمانداریی سوڵتاندا (الرسالة الناصرية في إطاعة السلطان)[٤٠٣].

٢٠٩ك- لە دوای ستوونەکانی نەچوون بۆ لای دەسەڵاتداران (ماوراء الاساطين في عدم المجيء الى السلاطين)[٤٠٤].

---

402 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٥، ل ١٢٨.

403 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی کوبلرلی لە ئەستەمبوڵ لە کۆمەڵەی ژمارە: ١٥٧٩.

**٢١٠ك– جامی لێکۆڵینەوە لە پەیڕەوی سیاسەتدا (قرح الدراسة في منهاج السياسة)[٤٠٥].**

**٢١١ك– پلەی بەرز لە فەزڵ و پلەی فەرمانڕەوایی پیرۆزدا (الرتبة المنيفة في فضل السلطة الشريفة)[٤٠٦].**

**٢١٢ك– نامەی سوڵتانیی (الرسالة السلطانية)[٤٠٧].**

**٢١٣ك– نامەیەك بۆ پاشایانی تكرۆر ((ناوچـەی خۆرئـاوای ئەفـەریقا)) (رسالة الى ملوك التكرور ((منطقة غرب أفريقا)))[٤٠٨].**

**٢١٤ك– رەوشتی پاشایان (آداب الملوك)[٤٠٩].**

**١٥٨ن– (السمهودي) ٨٤٤–٩١١ ك/١٤٤٠–١٥٠٦ ز.**

**عەلی کوڕی عەبدوڵڵا کـوڕی ئەحمـەد ئەلحەسـەنی شـافیعیی، نـورەددین ئەبولحەسەن، مێژوونووس لـە مەدینـەی منـەوەرەو مـوفتی ئـەو شـارە، لـە سمهود لـە سـەعیدی میـسر لـەدایك بـووە و لـە قـاهیرە پێگەیـشتووە و لـە**

[404] دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی ژمارە: ١٣٢٢ (حدیث). مایکرۆفیلم ژمارە: ٣٤٥٠٢ پارێزراوە.

[405] دەستنووسێکە لـە مۆزەخانـەی بـەریتانیی، ژمـارە: ٧٤٥، لـەوێش نوسـخەیەك لـە کتێبخانـەی زانکۆی ئەمەریکی بەیرووت لە سەر مایکرۆفیلم (Mic-A-376) پارێزراوە.

[406] دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میـسریی، ژمـارە: ٢٦٥ (مجـامیع)، وێنـەگیراوە لـە پـەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکان لە قاهیرە، لەوێش نوسـخەیەك لـە کتێبخانـەی ((علـي أمـيري ملـت)) لـە ئەستەمبوڵ، ژمارە: ٢٠٣٠ (مجاميع) بە ناونیشانی (فضل القيام بالسلطة الشريفة).

[407] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی سۆفیای نیشتیمانی بۆڵگاریا، ژمارە: OR ١٦١٨١٧.

[408] دەستنووسێکە لە کتێبخانەی سۆفیای نیشتیمانی بۆڵگاریا، ژمارە: OR ١٦١٨١٧.

[409] (کشف الظنون، حاجي خليفة) ل ١٧٠.

مەدینەی منەووەرە نیشتەجێ بووە، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، خاوەنی کتێبی (وفاء الوفاء بأخبار دار المصطفى)[٤١٠].

٢١٥ك– گەوهەری پەرش و بڵاوو لە ئامۆژگاریی فەرمانداراندا (اللؤلؤ المنثور في نصيحة ولاة الأمور)[٤١١].

ئەم کتێبە دەکرێت بەچوار بەندەوە، یەکەمیان، لە پلەوپایەو فەزڵی ژێرو پێناسەیدا نووسراوە. دووەمیان، باسی ئەوە دەکات کە چی لە سەر فەرمانداران (کاربەدەستان) پێویستە لە دادگەریی و نزیککردنەوەی زانایان و چاودێریی بازاڕەکان و شمەك و نرخ و دابینکردنی دانەوێڵەو خۆراك.

بەندی سێیەم، ئەوەی کە بۆ پاشایانی پێشوو پێشهاتووە، هەواڵ و ئامۆژگارییەکانیان و ئەوەی کە پێویستە فەرمانداران بیکەن، بەندی چوارەم، باسی ئەو سوود و بەرژەوەندییانە دەکات کە فەرمانداران و کاربەدەستان پێویستیان پێیەتی. لە داڕشتنی کتێبەکەوە دەردەکەوێت کە بۆ یەکێك لە دەسەڵاتدارانی میسر نوسرابێت چونکە باسی ((بەرلس، البحيرة)) و هەرێمەکانی تری میسر دەکات.

١٥٩ن– (نەناسراو) کتێبەکەی ئاڕاستەی (قنصوه الغوري) کردووە لە ساڵی ٩١٥ ك/١٥٠٩ زدا.

---

410 (الأعلام-الزركلي) ب ٤، ل ٣٠٧.

411 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمارە: ٣٥ (إجتماع تيمور)، مایکرۆفیلم: ٢٧١٨١ و بریتییە لە ٨٣ لاپەڕەو دراوەتە پاڵ نوسەرەکەی (علي بن محمد المنوفي) کۆچکردووی ١١٥٤ ك، لە کتێبخانەی کۆنگرێسی ئەمەریکا، واشنتۆن، ژمارە: ٢-٣٧٠٠٤ (مجموعة منصوري) ٣,٧٥٦ و دراوەتە پاڵ نووسەرەوەی کتێبەکە (محمد بن يوسف) کە لە ساڵی ١٢١٩ دا نووسیویەتەوە، (إيضاح المكنون، البغدادي))ب ٢، ل ٤١٧ دەیداتە پاڵ سمهودی.

٢١٦ك– ڕێگەی گیراوە لە سیاسەتی پاشایاندا (الطريق المسلوك في سياسة الملوك)[٤١٢].

١٦٠ن– (أبو الفضل محمد بن الاعرج) کۆچکردووی ٩٢٥ ك/١٥٢٣ ز[٤١٣].

٢١٧ك–ئازادیی کردار بۆ تەگبیری پاشایان (تحرير السلوك في تدبير الملوك)[٤١٤].

ئەم کتێبە ئاڕاستەی سوڵتان قەنسو غوریی کراوە و بە پێشەکی و ناوەڕاست و کۆتایی ڕێکخراوە، لە سەرەتادا باسی گرنگیی بوونی سوڵتان دەکات و بنەماکانی دەسەڵاتداریی و ئەو فەزڵ و پلانە دەکات کە پێویستە فەرمانڕەوا دەبێ هەیبێت، ئەو ڕەفتارە خراپانەش کە پێویستە ناوبراو خۆی لێ دووربخاتەوە. ئینجا بە هۆی گرنگیی چاودێریی لاوانی ستەمکاریی و بەفریاگەیشتنی و تایبەتمەندییەکانی چاودێر و بەرپرسی بەهاناوەچوون و گرنگیی چاودێریی بەسەر هەقدەستی کرێکاران، نووسەرانی دیوانەکان و چاودێرییان، هەروەها وردبینی لە ستەمی خۆژێنەران لە سەر خەزێنە (بيت المال) بە تایبەتی سەربازان و زانایان و دادوەران، گرنگیی گەڕاندنەوەی مافی زەوتکراو و جێ بەجێکردنی ئەو فەرمانانەی کە دادوەران

412 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی (أحمد الثالث) لە ئەستەمبوڵ، ژمارە: ١٦٠٨، بریتییە لە ٩٩ لاپەڕە، لە کتێبخانەی (الفاتح)ی ئەستەمبوڵ، ژمارە: ٣٥٠٢، لەوێش نوسخەیەکی وێنەگیراو لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکان قاهیرە پارێزراوە.

413 بۆ ژیانی ناوبراو سەرچاوەیەکم دەست نەکەوت.

414 د. فوئاد عەبدولمونعم ئەحمەد توێژینەوەی لە سەر کردووە، ئەسکەندەرییە، (مؤسسة شباب الجامعة)، (١٩٨٢ ز)، هەندێکیش نوسەرەوەی ئەم کتێبە (إبن الأعرج) لە جیاتی نووسەرەکەی دادەنێن. هەروەها نوسخەیەك لەم دەستنووسە لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکانی قاهیرە هەڵگیراوە تیایدا باسی ئەوە کراوە کە (إبن الأعرج) نووسەرەوەی کتێبەکەو نووسەری نادیارە.

دەریانکردووەو بەهۆی بێهێزیانەوە جێبەجێ نەکراوە، چونکە بڕیارەکان بەسەر کەسانی خاوەن پلەوپایەدا دراوە، هەروەها پێویستە ئەوە جێبەجێ بکرێت کە وردبینیی حەسبە بۆ بەرژەوەندیی هئوان بڕیاری داوە و نەیتوانیوە جێبەجێی بکات.

لەم کتێبەو ئەوانەی پێشتریشەوە کە ئاڕاستەی سوڵتان قەنسوغۆری کراوە دەردەکەوێت کە تا چەند زانایان هەستیان بە بارودۆخی ستەمکارانەی دەسەڵاتدار بە سەر میسردا کردووە، کە دادپەروەری هەڵگیراوەو رێزو هەیبەتی دەوڵەت بێهێز بووە، چ لە ناوخۆو چ لە دەرەوەدا بەتایبەتی بەرانبەر بە پرتوگالییەکان لە دەریاو لە بەرانبەری عوسمانییەکانیشەوە بە هەمان شێوە.

١٦١ن- (أحمد الجيعان) کۆچکردووی ٩٣٠ ک/١٥٢٤ ز.

ئەحمەد کوڕی یەحیا کوڕی شاکر کوڕی عەبدولغەنی، وێژەوان، دادوەری پێدراوەو بووەتە جێنشینی نهێنی لە میسر[٤١٥].

٢١٨ک- یاسای دیوانەکان (قوانين الدواوين)[٤١٦].

١٦٢ن- (علي علوان الحموي) ٨٧٣-٩٣٦ ک/١٤٦٨-١٥٣٠ ز.

عەلی کوڕی عەتییە کوڕی حەسەن کوڕی موحەممەد کوڕی حەداد، هیتیی، حەمەویی، شافیعیی، شازلیی (الشاذلي)، سۆفی، ئامۆژگار، رێکخەر (ناظم)، فەقیهو ئوسوڵیی، بەشدار لە هەندێ زانستدا و لە شاری ((حماة)) کۆچی دوایی کردووە[٤١٧].

---

415 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة)، ب ١، ل ٢٨٥، ب ٢، ل ٢٠٣.

416 (هدية العافين، البغدادي)، ب ١، ل ١٤٥.

417 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل ١٥٠-١٥١.

٢١٩ك– ئامۆژگـــاریی پـــیرۆز و مۆجیـــاریی ژیرانـــه بـــۆ ئامۆژگـــاریی دەســـەڵاتدارو خەلیفـە (النـصائح الـشریفة و المـواعظ الظریفـة في موعظـة السلطان و الخلیفة)[٤١٨].

نووسەر ئەم کتێبەی ئاڕاستەی سوڵتان ((سلیم بن عثمان)) کـردووە کـە نووسەرەوەی ئەم کتێبـە نـاوی نـاوە ((نـصیحة الـشیخ علـوان الی الـسلطان سلیم بن عثمان)). ئەم کتێبە بە چواردەوری چەمکی دادگەریی و چاودێریی کاربەدەسـتان (فەرمانـداران) و ڕێگرییـان لـە سـتەمکردن لـە ڕەعیـەت بـە تایبـەتی لـە مەسـەلەی بەدەسـتهێنان و کۆکردنـەوەی سـاماندا، هـەروەها ڕێگـری لـە دەسـتێوەردانی سـەربازان لـە کاروبـاری خـەڵکی و مامەڵـەی راستەوخۆیان لە گەڵیاندا، جەخت دەکاتەوە لـە سـەر گرنگیـی دادگـەریی و چاکەکاریی لە بینـاکردنی وڵات و دەسـتەبەرکردنی ئـاوەدانیی لـە زەویـدا و مەترسـی بڵاوبوونـەوەی خراپـەو داوێنپیـسیی لـە کۆمەڵگـەدا، بـە تایبـەتی تاوانە کۆمەڵایەتیەکان وەکو ڕێگەبڕین و شەرابخۆریی و زینا، ئینجا جـەخت لە سەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە پێـی دەڵێـت ڕووەکـانی چـاکەخوازیی کـە لـە دابینکردنـــی ڕزق و ڕۆزیـــی بـــۆ هـــەژاران و بێهێـــزان و بـــە پیرەوەچـــوون و فریاکەوتنی لێقەوماوان و دەستەبەرکردنی پێویـستیی کەمدەسـتاندا کـورت دەبێتـــەوە، هـــەروەها پێویـــستە پێویـــستیی دادوەران و کارمەنـــدان دابـــین بکرێـــت، هـــەروەها هیممـــەت بخرێتـــە کـــار بـــۆ دروســـتکردنی مزگـــەت و

---

[418] دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میـسری لـە نێـو کۆمەڵـەی ژمـارە: ٢١٥٨٠ ب، مـایکرۆفیلم: ١٦٩٥١، لەوەش نوسخەیەك لە (دار الکتب الظاهرية) لە دیمەشـق هەیـە بـە ناونیـشانی ((النـضائح المهمة للملوك و الأمة)) لە ژێر ژمارەی: ٣٢٦١ و بریتییە لە ٦٠ لاپەڕە. هەروەها نوسخەیەکیش لـە کتێبخانەی (البلدية)ی ئەسکەندەریە بە ژمارە: ن ٥١٩٥ ج، پارێزراوە.

نۆژەنکردنـەوەی مزگـەوت و قوتابخانـەکان و خانـەی بێنـەوایان (ربـاط) و خانەقاکان و ڕێگاکان.

١٦٣ن– (أحمد بن كمال باشا) کۆچکردووی ٩٤٠ ك/١٥٣٣ ز.

زانایەکی بەشدارە لە زۆرێـك لـە زانستەکاندا لـە تۆقـان کـە یەکێکـە لـە ناوچەکانی سیواس لە دایك بـووە، لـە کاتێکـدا کۆچـی دوایـی کـرد ئـەرك و پۆستی موفتیی قوستەنتەنییەی لە ئەستۆدا بوو[419].

٢٢٠ك– سیاسەتی شەرعیی (السياسة الشرعية)[420].

٢٢١ك– ڕزگاربوونی ئوممەت لە ناسینی پێشەوایاندایە (خـلاص الأمـة في معرفة الائمة)[421].

نامەیەکە لە بنەمای دانان و وەرگرتنی پۆسـتی خیلافـەت دەکۆڵێتـەوەو ئەو بەو شێوەیەی دەیبینـیٚ کـە لەسـەر بناغـەی سـەرکەوتن و بـەرپاکردنی دادگەریی و هەرکەسیٚ کە بـەڵێن بـدات لـە سـەر ئـەو مەرجـە ئـەو دەتـوانیٚ ببێتە خەلیفـە یـان پێـشەوا، ئەمنامەیـەی پێـشکەشی سـوڵتان سـولەیمانی قانونی کردووە.

١٦٤ن– (علي الشيرازي) کۆچکردووی پاش ساڵی ٩٤٥ ك/١٥٣٨ ز.

عـەلی (یـان عەلائـەدین) کـوڕی موحەممـەد (یـا موحیـەددین)ی عـەلائی شیرازیی، توێژەری حەنەفیی[422].

---

419 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٣٨.

420 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسری، ژمارە: ١٣ (فقه حنفي حليم).

421 دەستنووسێکە لە زانکۆی بیل، ژمارە: ٣٨٩ (کۆمەڵەی لانـدبیرج)، هـەروەها خـاوەنی ((کـشف الظنون)) لە ل ٧٥٥ دا باسی کردووە.

422 (الأعلام، الزركلي) ب ٥، ل ١١.

**٢٢٢ك– فەرمانی وەزیران (دستور الوزراء)[٤٢٣].**

**نووسەر بۆ موستەفا پاشای وەزیری سوڵتان سەلیمی دووەمی داناوە کە لە (٩٦٦ ك)دا کۆچی دوایی کردووە.**

**٢٢٣ك– کورتەی ئاڵتونی داڕێژراو بۆ ئامۆژگاریی پاشایان (مختصر التبر المسبوك في نصائح الملوك)[٤٢٤].**

**١٦٥ن– (محمد اليسيني) کۆچکردووی ٩٥٩ ك/١٥٥١ ز.**

**موحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوڕڕەحمانی فاسیی، یەسینیی، فەقیهی مالیکیی، بەشدار لە زانستە ژیرییی و گوێزراوەکان (العقلية و النقلية)دا، لە (فاس)ی (مەغریب) لەدایك بووە، لە هۆزەکانی بەربەرە[٤٢٥].**

**٢٢٤ك– مافەکانی دەسەڵاتدار لەسەر رەعیەت و مافی ئەوانیش لە سەر ئەو (حقوق السلطان على الرعية و حقوقهم عليه)[٤٢٦].**

**١٦٦ن– (إبراهيم بن الحنبلي) ٨٧٧–٩٥٩ ك/١٤٧٤–١٥٥٢ ز.**

**ئیبراهیم کوڕی یوسف کوڕی عەبدوڕڕەحمانی حەلەبیی، حەنەفیی، ناسراو بە ((إبن الحنبلي))، زاناو شارەزا لە سیاسەتدا، لە حەڵەب لە دایك بووە[٤٢٧].**

---

423 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەزهەر ١: ٢٩٦، هەروەها خاوەنی کتێبی ((کشف الظنون)) لە ل ٧٥٥ دا باسی کردووە.

424 دەستنووسێکە لە خانەی نیشتیمانی دەستنووسەکانی لە تونس، ٢٧٣٤.

425 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٨، ل ٢٧٤.

426 دەستنووسێکە لە زانکۆی ئەمەریکی بەیرووت لە ژێر خانەی پاشکۆی (١) ژمارە ١٢ دا هەیە، ناونیشانێکی نزیك لەم ناونیشانانەی هەیە، بەڵام بەشی یەکەمی ناتەواوە کە دەربارەی بنەماکانی رەفتاری سوڵتانە لەگەڵ رەعیەتدا، هەروەها سەیری ((الأعلام-الزركلي)) ب ٦، ل ٦ بکە.

427 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ١٣٠.

٢٢٥ك– چرای بابایانی سیاسەت و کلیلی دەرگاکانی زیرەکی (مصابیح أرباب السیاسة و مفاتیح أبواب الکیاسة)[٤٢٨].

ئەمە راڤەیەکە لە سەر کتێبی ((آداب السیاسة))ی عیزەدین کوڕی ئەسیر (عزالدین ابن الأثیر) کۆچکردووی ٦٣٠ ك.

١٦٧ن– (علي بن عراق الکناني) ٩٠٧–٩٦٣ ك/١٥٠٢–١٥٥٦ ز.

عەلی کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عێراقی کینانی، فەقیهو سۆفی، لە دیمەشق لەدایك بووەو چووە بۆ حیجاز و پێشەوایەتیی (الإمامة)ی لە مەدینەی منەوەرەدا وەرگرتووەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٤٢٩].

٢٢٦ك– پەیڕەوی کرداریی بۆ زانینی ژیانی خەلیفەو پاشایان (نهج السلوك الی معرفة سیرة الخلفاء و الملوك)[٤٣٠].

١٦٨ن– (زین الدین بن نجیم الحنفي) کۆچکردووی ٩٧٠ ك/١٥٦٣ ز.

زەینەددین کوڕی ئیبراهیم کوڕی موحەممەد کوڕی موحەممەدی میسریی، حەنەفیی ناسراو بە ((إبن نجیم))، فەقیهو ئوسوڵیی[٤٣١].

٢٢٧ك– سیاسەتی شەرعیی (السیاسة الشرعیة)[٤٣٢].

١٦٩ن– (أحمد بن حجر) ٩٠٩–٩٧٣ ك/١٥٠٣–١٥٦٦ ز.

---

428 (کشف الظنون، حاجي خلیفة) ل ٤٢، (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ١، ل ١٣٠.

429 (الأعلام–الزرکلي) ب ٥، ل ١٢.

430 دەستنووسێکە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ژمارە: ٢١٦٠.

431 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ٤، ل ١٩٢.

432 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسری، ژمارە: ١١٦٠ (فیقهی حەنەفی).

ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حەجەری هەیسەمی، سەعدی، ئەنساریی، فەقیهی شافیعیی، بەشدار لە چەندین جۆر زانستدا، لە گەڕەکی ((أبي هیثم)) لە هەرێمی خۆرئاوای میسر لەدایك بووەو لە مەککە کۆچی دوایی کردووە[٤٣٣].

٢٢٨ك– نووسینی مۆجیاریی و ڕێنمایی بۆ بابایانی فەرمانداروخاوەن بەرژەوەندیی (تحریر المواعظ و النصائح لأرباب الولایات و المصالح)[٤٣٤].

١٧٠ن– (صالح الخزرجي) کۆچکردووی ٩٧٥ ك/١٥٦٧ ز.

سالّح کوڕی سدیق کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی تماریی ئەنساریی، خەزرەجی، شافیعیی، وێژەوان[٤٣٥].

٢٢٩ك– گەوهەری گرێبەستی ناوازەو پێویستی پاشای بەختەوەر (جواهر العقد الفرید و بغیة الملك السعید)[٤٣٦].

١٧١ن– (علي المتقي) ٨٨٥–٩٧٥ هـ/١٤٨٠–١٥٦٧ ز.

عەلی کوڕی حیسامەددین کوڕی عەبدولمەلیکی جونیوریی، هیندیی، ناسراو بە پارێزکار (المتقي)، تێگەیشتوو (فقیه)، فەرموودەناس، ئامۆژگارکار، بەشداریی لە هەندێ زانستدا کردووە، خەڵکی وڵاتی

433 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ٢، ل ١٥٢.

434 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی بۆدلیان–ئۆکسفۆرد، ژمارە: ١٢٩ کۆمەڵەی ئەلور، لەویش نوسخەیەك لە کتێبخانەی زانکۆی ئەردەنییدایە، ژمارە: ٨٥، هەروەها خاوەنی ((هدیة العارفین)) ب ١، ل ١٤٦ بە ناونیشانی ((الفضائل الکاملة لزوي الولایة العادلة)) ئاماژەی پێکردووە.

435 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ٥، ل ٧.

436 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەحمەدییە لە زەیتونە لە تونس، ژمارە: ٥٠٨٨، هەروەها خاوەنی ((هدیة العارفین)) ب ١، ل ٤٢٣ باسی کردووە.

((دكن))ەو لە مەدینەی منەوەرە نیشتەجێ بووە، خاوەنی کتێبی ((کنز العمال))ـە[٤٣٧].

٢٣٠ك- پلەی نایاب لە ئامۆژگاریی پاشایاندا (الرتبة الفاخرة في نصائح الملوك)[٤٣٨].

١٧٢ن- (دده جونكی) کۆچکردووی ٩٧٥ ك/١٥٦٧ ز.

ئیبراهیم کوڕی زەینەدین یەحیا بەشی کوڕی ئیبراهیم ئەماسی، رۆمی، کەمالەدین ناسراو بە دده خەلیفە یا دده جۆنکی، سەرەتا دادوەر بووەو دواتر بووتە موفتی دیاربەکرو دواتر وەکو مامۆستای وانەبێژ (مدرس) لە قوستەنتەنییە کاری کردووە و لە ((برۆسە)) کۆچی دوایی کردووە[٤٣٩].

٢٣١ك- سیاسەتی شەرعیی (السياسة الشرعية)[٤٤٠].

١٧٣ن- (ولي الله الحائري) لە ساڵی ٩٨١ ك/١٥٧٣ ز دا لە ژیاندابووە.

وەلیوڵڵا کوڕی نیعمەتوڵڵا حوسەینی، رەزەویی (رضوی)، حائیریی، خاوەن پلەو رێز، ئیمامیی، خەڵکی کەربەلا[٤٤١].

٢٣٢ك- دیاریی پاشایان لە پارێزگاریی و حاڵی پاشایانی رابردوو چاکەی دادگەریی و حوکم و بێزراویی ستەم (تحفه الملوك في الزهد وأحوال الملوك الماضين و حسن العدل و الحكم و قبح الظلم)[٤٤٢].

---

437 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل ٥٩.

438 (إيضاح المكنون) ب ١، ل ٥٤٨، (هدية العارفين) ب ١، ل ٧٤٦.

439 (هدية العارفين)، ب ١، ل ٢٨.

440 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی کوبلرلی، ژمارە: ١٠٩ کۆمەڵەی ٢ ژمارە: ٢٠٣.

441 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٣، ل ١٦٩.

**١٧٤ن– (محمد بن بالى التركي) كۆچكردووى ٩٨٦ ك/١٥٨٨ ز[٤٤٣].**

**٢٣٣ك– سـەوقاتى فەرمانـداران و ئـەميران و گـەورەكان بـۆ بناغـەى سياسـەتە دينـى و دنياييـەكان و رەوشـتى نايـاب (تحفـة الـولاة والامـراء و الأكابر في أساس السياسات الدينية و الدنيوية و الأدب الفاخر)[٤٤٤].**

**١٧٥ن– (نەناسراو) لە سالّى ٩٨٦ ك دا لە ژياندا بووە.**

**٢٣٤ك– مەرجەكانى پێشەوايەتيى و سياسـەتى ولّات (شـروط الإمامـة و سياسة المملكة)[٤٤٥].**

**ئەم كتێبە باسى سياسـەتى ولّاتـان و مەرجـەكانى پێشەوايەتيى و مـافى پێـشەوايان و بەرژەوەندييـەكانى ئوممـەت و سيـستمى فـەرمانڕەوايى، پەيوەنديى دەولّەت و فەرمانڕەوايانى بە خەلّكەوە، لە سـالّى ٩٨٦ ك دا لـە دانانى بووتەوە.**

**١٧٦ن– (مصطفى عالي الكليبولي) كۆچكردووى ١٠٠٩ ك/١٥٩٩ ز.**

**موسـتەفا كـوڕى ئەحمـەد كـوڕى عەبدولمـەولاى كليبـولى، رۆميـى، دەفتـەرى، ناسـراو بـە ((عـالى ئەفەنـدى))، وێـژەوان، بەشـدار لـە هەنـدێ زانستدا[٤٤٦].**

---

[442] دەستنووسێكە لە خانەى كتێبى ميسريى، ژمارە: ١٥٣٧ (تصوف طلعت)، مايكرۆفيلم: ٧٣٧٦ بريتييە لە ٣٦ پارچەو ناونيشانى (الكتاب في ذكر مايلزم الملوك و الـولاة مـن العـدل و التحزيـر مـن الجور)ى هەلّگرتووە.

[443] ژيانيم دەست نەكەوت.

[444] دەستنووسێكە لە خانەى كتێبى نيشتمانى تونس، ژمارە: ٢٢٣٥.

[445] دەستنووسێكە لە كتێبخانەى بۆدليان-ئۆكسفۆرد، ژمـارە: ٣٧٧ كۆمەلّـەى مـارش لـە زانكـۆى ئەردەنيش، ژمارە: ١٠٥١.

[446] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٢، ل ٢٣٩.

٢٣٥ك– ئامۆژگاریی دەسەڵاتداران (نصیحة السلاطین)[٤٤٧].

١٧٧ن– (محمد المناوي) ٩٥٣–١٠٣١ ك/١٥٤٥–١٦٢١ ز.

موحەممەد کوڕی عەبدوڕڕەئوف کوڕی تالجولعاریفین کوڕی عەلی کوڕی زەینولعابدین مەناوی، قاهیری، زانایەکی بەشدار بووە لە جۆرەکانی زانستدا، لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە[٤٤٨].

٢٣٦ك– گەورە تیشکدەرەکانی حوکمە سوڵتانییەکان (الجواهر المضیئة في الاحکام السلطانیة)[٤٤٩].

ئەم کتێبە ئاڕاستەی سوڵتان مورادخانی چوارەم سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانیی کراوە، لە سەر دوو مەبەست ڕێکخراوە: یەکەم باسی حاڵ و دۆخی سوڵتان دەکات لە دە بەندا. لە دووەمیشدا باسی حاڵی وەزیران و پارێزەران و دیوانەکان دەکات و بیست بەندە.

١٧٨ن– (مرعي الکرمي) کۆچکردووی ١٠٣٣ ك/١٦٢٣ ز.

مەرعی کوڕی یوسف کوڕی ئەبوبەکر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەبوبەکر کوڕی یوسف کوڕی ئەحمەدی کەرەمیی، مەقدیسیی، حەنبەلیی، فەرموودەناس تێگەیشتوو (فقیە)، مێژوونووس و وێژەوان، لە ((تولکەرەم))ی فەلەستین لە دایك بووەو چووەتە قودس و دواتریش چووەتە قاهیرەو لە گەورە زانایانی حەنبەلیی بووە[٤٥٠].

---

447 دەستنووسێکە لە زانکۆی ئیمام ئیبن سعود لە ژێر ژمارەی: ٧٣٦٧.

448 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة)) ب ١٠، ل ١٦٦، ب ٥، ل ٢٢٠.

449 نوسخەیەك لە کتێبخانەی مەگنیسیای ئەستەمبوڵ، ژمارە: ١٥٤٧ هەیە و بریتییە لە ٦٨ لاپەڕە، نوسخەیەکیش لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکانی قاهیرەیە، هەروەها خاوەنی ((کشف الظنون)) ل ٦١٧.

450 (أعلام المؤلفین، رضا کحالة) ب ١٢، ل ٢١٨.

٢٣٧ك– خۆشحاڵیی و موژده له فه‌زڵی ده‌سه‌ڵات و وه‌زاره‌تدا (المسرة و البشارة في فضل السلطنة– والوزارة)[٤٥١].

١٧٩م– (علي الآيديني) له ساڵی ١٠٤٢ك/ ١٦٣٢زدا له ژیاندا بووه.

عه‌لی كوڕی یه‌حیایی ئایدینیی، ڕۆمیی، حه‌نه‌فیی، ئامۆژگار[٤٥٢].

٢٣٨ك– ڕێبازی ده‌سه‌ڵاتداران و پاشایان و سه‌وقاتی پاشایان له ره‌فتاردا (مسلك السلاطين و الملوك و تحفة الملوك في السلوك)[٤٥٣].

ئه‌م كتێبه بۆ سوڵتان موورادخان كوڕی سوڵتان ئه‌حمه‌دخان كوڕی سوڵتان موحه‌ممه‌دخان كوڕی سوڵتان موورادخان دانراوه. له سه‌ره‌تاكه‌یدا ده‌ڵێت: ((كاتێ حیكمه‌تی خوایی پێویستی كردو ئیراده‌ی به‌رزی خۆی به‌ستەوه به ئاوه‌دانیی دین و دنیاو سیستمه‌كه‌یانه‌وه، له هه‌موو سه‌رده‌مێكدا سوڵتانێكی پاسه‌وانی خاوه‌ن سیاسه‌تی یارمه‌تیده‌ری شه‌رع و حوكمه‌كانی به‌دیی هێنا، فه‌رمانی پێكرد به دادگه‌ریی و چاكه‌كاریی و به شیرو شمشێر سیاسه‌تی شه‌رعی جێبه‌جێ كردووه)). ئینجا دوای ئه‌وه باسی فه‌زڵی ده‌سه‌ڵاتداران و پاشایان و ئه‌وه‌ی له‌سه‌ریانه له جێبه‌جێ كردنی ئه‌وه‌ی كه له‌سه‌ری متمانه‌یان وه‌رگرتووه پێبسپێرن به ئه‌هلی خۆی، چونكه سپاردنی كار به كه‌سانی ناشایسته هۆكاری هه‌ره‌سهێنانی گه‌لانه، ده‌بێ پاشا خۆی بڕازێنێته‌وه به ڕه‌وشتبه‌رزیی و ده‌بێ دادگه‌ربێت و لابه‌ری سته‌م و گه‌نده‌ڵیی له سه‌ر به‌نده‌كانی خوا، ده‌بێ خاوه‌ن ویقارو

451 ده‌ستنووسه له كتێبخانه‌ی كۆنگرێس له واشنتۆن، كۆمه‌ڵه‌ی ژماره: ٦٥.

452 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل ٢٦٠.

453 ده‌ستنووسێكه له خانه‌ی كتێبی میسریی، ژماره: ٣٠ (إجتماع تيمور) و (ی ١٧٥٥٥)، مایكرۆفیلم ژماره: ٢٧٠٧٣، بریتییه له ٧٥ تابلۆ و له نوسخه‌كه‌ی تردا ١٤٨ لاپه‌ڕه‌یه.

ئارامگربێت. ئینجا بە شێوەیەکی تایبەت جەخت دەکاتەوە لەسەر ئاوەدانی وڵات و تــەگبیرو راوێــژ، ئینجــا بەلایــەوە رێزگرتنــی زانایــان دەبێتــەهۆی مانەوەی پاشـاو چەسپاندنی دەوڵـەت، ئینجـا جـەخت دەکاتـەوە لـە سـەر فەرمان بە چـاکەو رێگـری لـە خراپـەو دوورکەوتنـەوە لـە هـەواو ئـارەزوو و غەفڵەت. ئینجا باسی وەزارەت و رۆڵیـان و مەترسـی جیاوازییـان لـە نێـوان خۆیاندا و پێویستی یەکگرتوویی و یەکدەنگییان، لە کۆتاییشدا داکـۆکی لـە سەر دادگەریی و چاکەخوازیی دەکاتەوە.

١٨٠ن– (أبو الحسن علي الغزالي القـادري الـشاذلي الحمـودي) لـە سـاڵی ١٠٤٣ ک/١٦٣٣دا زیندوو بووە[٤٥٤].

٢٣٩ک– ئازادکردنی رەفتار بۆ تەگبیری پاشایان (تحرير السلوك في تدبير الملوك)[٤٥٥].

نووســەر لــە بیــست بەنــددا ئــەم کتێبــەی رێکخــستووە، تیایــدا باســی پێویــستی پێــشەوایەتی و مــەرجی گرێــدانی و کۆڵەکــەکانی وڵات و بنــەماو ئوسوڵی سیاسـیی و تـەگبیری کاروبـاری رەعیـەت و هاوڕێیـەتی پاشـایان و ئەرکەکانی سوپا دەکات، ناوبراو لە تونس ئەم کتێبەی نووسیووە لە سـاڵی ١٠٤٣ کۆچیدا.

١٨١ن– (حسن الشرنبلالي) ٩٩٤–١٠٦٩ ک/١٥٨٥–١٦٥٩ ز.

حەسەن کوڕی عەممار کوڕی عەلی شـورەنبلالیی، وەفـائیی، حەنـەفیی، فەقیهێکی بەشدارە لە هەندێ زانستدا، لە ئەزهەردا وانەی وتووەتـەوە و لـە

---

[454] سەبارەت بە ژیانی سەرچاوەیەکم دەست نەکەوت.

[455] دەستنووسێکە لە گەنجینەی حەسەنی لە ریبات، ژمارە: ٨٠٩ و بریتییە لە ٩٠ لاپەڕە.

لای دەوڵەتداران چووتە پێشەوەو خەڵکێکی زۆر زانستی لێوەرگرتووە لە میسریی و شامییەکان[٤٥٦].

٢٤٠ك– وتەبەرزەکان لە فەزڵ و پلەی دەسەڵاتی پیرۆزدا (الاحاديث المنيفة في فضل السلطنة الشريفة)[٤٥٧] کە تیایدا باسی فەرمانبەرداریی (گوێڕایەڵیی) سوڵتان و فەزڵی سوڵتانی دادگەر دەکات.

١٨٢ن– (أحمد الصنعائي) لە دەوروبەری ساڵی ١٠٨٠ ك/١٦٦٩ ز دا کۆچی دوایی کردووە ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی حەبەشی سەنعایی، یەمانیی، زەیدیی سیاسیی[٤٥٨].

٢٤١ك– پەلە بەنازە پێگەییووەکان بە بەڵگەکانی حوکمی سیاسیی (الغصون المياسة البانعة بأدلة أحكام السياسة)[٤٥٩].

ئەم کتێبە پێشکەشی ئەمیری ئیمانداران موحەممەد کوڕی متەوەکیل عەلەڵڵا کراوە، کتێبێ زۆر گرنگە چونکە پەیڕەوێکی نوێ لە باسی دیاردەی سیاسیی لە مێژووی فیکری سیاسیی ئیسلامییدا باس دەکات. ئەوەش لە ڕێگەی بەستنەوەو پەیوەندیدارکردنی نێوان زانستی ئوسوڵی فیقهو زانستی سیاسییدا، توێژینەوەی دووەم دەکات بە سوودوەرگرتن لە سەر بنەماکانی یەکەم، بەو پێیەی زانستی ئوسوڵی لە ڕووی پەیڕەوەوە زۆر نزیکە لە

---

456 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل ٢٦٥.

457 دەستنووسێکە لە زانکۆی برنستۆن لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ژمارە: ٦٩٣ کۆمەڵەی جاریت، لەویش نوسخەیەك لە زانکۆی ئەردەنییە، ژمارە: ٨٩٦.

458 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٨٧.

459 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی، ژمارە: ٣٣ (إجتماع تيمور)، مایکرۆفیلم ژمارە: ٢٧٢٩٤، بریتییە لە ١٢٨ لاپەڕە، لە سەر بەرگەکەی نووسراوە کە بۆ ئەمیری ئیمانداران موحەممەد کوڕی موتەوەکیل عەلەڵڵا نووسراوە، چونکە دانەر ئاراستەی ئەوی کردووە.

توێژینـەوەی دیـاردەی سیاسـیی، هـەمان ڕەوشـی کـە ماوەیـەك لەمەوبـەر هەندێکی تر گرتیانە بەر و هەوڵ و کۆششی زۆریـشیان لـەو بارەیـەوە کـرد، بەتایبـەتی دکتـۆر ((طـه جـابر العلـواني)) کـە ئوسـولی فیقهـی بـە دەرگـای توێژینەوەی دیاردەی کۆمەڵایـەتیی (لـە قەڵەمـدا، یـان ئـەوەی کـە دکتـۆر ســـەیفەددین عەبدولفـــەتاح لـــە جێبـــەجێکردنی دەروازەی بەرژەوەنـــدیی شەرعیی لە توێژینەوەی دیاردەی سیاسییدا لە نامەی دکتۆراکەیدا ئاماژەی پێکـردووە، کتێبەکـە رێکخـراوە لـە سـەر بنـەماکانی ئوسـوڵی ((فقـه)) و نووسەریش لە سەرەتای کتێبەکەی خۆیدا گرنگیی پێویستیی و بەرپاکردنی پێـشەوایەتیی ((الإمامـة)) و جێبـەجێ کردنـی دادپـەروەریی و حیکمـەت و پێـشەوا بـۆ هـەموو بەرژەوەنییـەکانی ئوممـەت گـرنگ و پێویـستە، ئینجـا سیاسەت دەکات بە پێنج بەشەوە:

سیاسەتی پێغەمبەریی: کە سروش پێشڕەویی دەکات.

سیاسەتی پاشایەتیی کە پەیوەستە بە پاراستنی شەریعەتەوە.

سیاسەتی سیاسەتی گشتی کە بریتییە لە سەرکردایەتیی کۆمەڵەکان.

سیاسەتی تایبەتەکان کە بریتییە لە تەگبیری کەسوکار (أهل).

سیاسەتی خۆیی کە بریتییە لە تەگبیری خۆ (النفس).

ئینجا باسی ئوسوڵی فیقهو بەڵگە قبوڵکراوەکـانی و ئـەو بابەتانـەش کـە راجیـایی لـە سـەرە وەکـو نـەریت (عُـرف)، پەسـەندکردن (إستحـسان)، چاکـسازیی (إستـصلاح)، لابردنـی ئـەرك (رفـع الحـرج) بەرژەوەندییـە نێردراوەکـانی (مـصالح مرسـلة) بیـانوو بـڕین (سـد الـذرائع)، بـەهۆی ئـەم بنەمایانـەوەو لـە چوارچـێوەی پـەنجا تـەوەرەدا باسـی زانـستی سیاسـەت دەکات.

١٨٣ن– (أبو اليسر علي بن عبدالرحيم) كۆچكردووی ١٠٨٢ ك/١٦٧١ ز.
موفتيی شاری بەلگراد لە بەڵكان ((يۆگۆسلاڤيای پێشوو))[٤٦٠].

٢٤٢ك– ئـاڵتونی دارێـژراو بـۆ مۆجيـاريی چـاكخوازان و پاشـايان (التـبر المسبوك في نصيحة الأخيار الملوك).

لە ساڵی ١٠٨٢ ك دا لە نووسينی بوەتەوە، لە پێشەكی و شـەش بەنـددا رێكخراوە[٤٦١].

١٨٤ن– (الحسن اليمني) ١٠١٤–١٠٨٤ ك/١٦٠٥–١٦٧٣ ز.

حەسەن كـوڕی ئەحمـەد كـوڕی موحەممـەد كـوڕی عـەلی كـوڕی سـەلاح كـوڕی ئەحمـەد كـوڕی عەبـدولهادی كـوڕی جـەلالی يەمـەنيی، بەڕەچـەڵەك دەچـێتەوە سـەر پێـشەوا عـەلی كـوڕی ئـەبوتاليب (ڕەزای خـوای لێبێـت)، زانايەكی بەشدار لە چەندين جۆر زانستدا[٤٦٢].

٢٤٣ك– شـان خـاڵيكردن لـە ئامۆژگـاريی پێـشەوايان (بـراءة الذمـة في نصيحة الأئمة)[٤٦٣].

١٨٥ن– (محمد السوسي) ١٠٠٧–١٠٨٩ ك/١٥٩٨–١٦٧٨ ز.

موحەممەد كوڕی سەعيد كوڕی موحەممەد كوڕی يەحيا كـوڕی ئەحمـەد كـوڕی داوود كـوڕی ئەبوبـەكری سووسـيی، زانـا، پەخـشاننووس، رێكخـەر، بەشدار لە توێژينـەوەی قورئان و فەرموودەو فيقهو زانستەكانی عـەرەبيی و

---

460 ژيانی دەست نەكەوتووە.

461 دەستنووسێكە بەخەتی نووسەرەكەی لە كتێبخانەی كوبرلی ئەسـتەمبوڵ، ژمـارە: ٧٨٧ بريتييـە لە ٣٢٧ لاپەڕە، لە كتێبخانەی (سليمية) ئەستەمبوڵ و بريتييە لە ٣٥٤ لاپەڕە.

462 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل ٢٠٢.

463 دەستنووسێكە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ق ١٢٧–١٣٥ (مجاميع) ١٠، ق ٨٥–٨٨، (مجاميع) ٢٣، خاوەنی ((هدية العارفين) ب ١، ل ٢٩٥ باسی كردووە.

تەســـەوف و ئـــەوقاف و ئەستێرەناســـیی، لـــە مـــەراکیش کۆچـــی دوایـــی کردووە[٤٦٤].

٢٤٤ك– ئاماژەی مۆجیاریی بۆ ئـەوەی کـە داوای دەسـەڵات دەکـات بـە نیەتی چاك (الإشارة الناصحة لمن طلب الولاية بالنية الصالحة)[٤٦٥].

١٨٦ن– (عبدالقادر الفاسي) ١٠٠٧–١٠٩١ ك/١٥٩٩–١٦٨٠ ز.

عەبـدولقادر کـوڕی عـەلی کـوڕی یوسـف کـوڕی موحەممـەدی فاسـیی، فـەهریی، مـالیکی، زانایـەکی فەرموودەناسـە، لـە قەسـر لـەدایك بـووە و پێگەیشتووە و لە فاس کۆچی دوایی کردووە[٤٦٦].

٢٤٥ك– پێشەوایەتیی گەورە (الإمامة العظمى)[٤٦٧].

تیایدا باسی راستی پێشەوایەتیی و مەرج و حوکمی رێگەکانی گرێدانی و پێویستی فەرمانبەرداریی و گوێڕایەڵیی و بەرگرییلێکردن و جەنگان لـە ژێـر فەرماندەییدا دەکات، ئینجا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە گوێڕایەڵیی جگە بۆ پێشەوای دادپەروەر ناکرێت.

١٨٧ن– (أحمد المجيلدي) کۆچکردووی ١٠٩٤ ك/١٦٨٣ ز.

کوڕی سەعیدی مەجلیدیی، بەربەریی، مالیکی، تێگەیشتوو، ویژەوان، لە مەکناس دادوەریی پێسپێردراوە، دواتریش دادوەریی فاس[٤٦٨].

---

464 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٩٥.

465 دەستنووسێکە لە گەنجینەی حەسەنی لە کۆشکی پاشایەتی لە ریبات، ژمارە: ٧٣٨٠.

466 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٩٥.

467 بڵاوکراوەتەوە لە پەراوێزی کتێبی ((نصح ملوك الاسلام بالتعريف بما يجيب عليهم مـن حقـوق آل بيت الكرام-محمد السكاك)) چاپ فەلەستین (١٣١٦ ك) هەروەها دەستنووسێکیش لە زانکۆی قاهیرە لە ژێر ژمارەی: ١٢٨٠٧ داو لە ٢٧ لاپەڕەدا پارێزراوە.

468 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٣٤.

٢٤٦ك– ئاسانكاريی لە حوكمی نرخدانانـدا (التيسير في أحكام التسعير)[٤٦٩].

ئەمە كتێبێكە سەبارەت بە حەسبە نوسراوە و جەخت لە سەر یەكێك لە مەوداكانی سیاسەتی ئابووریی وڵاتان دەكاتەوە و گرنگیی دامەزراوەی حەسبەو مەرجی كارمەندانی و حیكمەتی ئەو دەزگایە باس دەكات، ئینجا باسی مەسەلە جیاجیاكانی پەیوەندیدار بە نرخدانان و دژایەتی غەش و دەغەڵیی ئابووریی و بازاڕی رەش دەكات.

١٨٨ن– (أحمد الفرقاوي) كۆچكردووی ١١٠١ ك/ ١٦٩٠ ز.

ئەحمەد كوڕی ئەحمەد فەیومی مالیكی، ناسراو بە فەرقاویی، زانایەكی بەشدار لە هەندێ زانستدا[٤٧٠].

٢٤٧ك– رەوشتجوانیی لە زانینی رەفتاری وڵات و پاشایاندا (حسن السلوك في معرفة آداب الملك و الملوك)[٤٧١].

ئەم كتێبە دابەش دەبێت بە سەر پێشەكی و حەوت مەبەست و كۆتاییدا، لە مەبەست (مقصد)ی یەكەمدا باسی خیلافەت و دادپەروەریی و پێناسەیان دەكات، لە دووەمدا باسی سیاسەتی سوڵتان و رەوشتیان و دیارییكردنی یەكەمی ئەوانەی كە باسی سیاسەتیان كردووە لە پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێ بێت) و پاشایان و ئەوەش كە لە زانایان یەكەمجار

---

469 بڵاوكراوەی قاهیرەیە، بە بێ بەراورو مێژوو یان خانەی بڵاوكردنەوە، بریتییە لە ٥٢ لاپەڕە.

470 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ١٥٢.

471 دەستنووسێكە لە خانەی كتێبی میسریی ژمارە: ١٩٠ ((إجتماع تيمور))، مایكرۆفیلم ژمارە: ٢٧١٤٥، بریتییە لە ١٣٢ لاپەڕە. نوسخەیەكیش لە كتێبخانەی ئەسكەندەریە ژمارە: ن ١٩٧١-د.

پۆلێنیان کردووه. له سێیه‌میشدا باسی وه‌زیرو پێناسه‌ی و مه‌رجه‌کان و باسی پێویستیی ولات و پاشا پێیان.

له چواره‌میشدا باسی ئه‌وه ده‌کات که پێویسته له سه‌ر پاشایان له ره‌وشت و ژیان له‌گه‌ڵیان و با هه‌ڵه له‌گه‌ڵ کردنیان. ئینجا له مه‌به‌سته‌کانی تردا باسی ئه‌و به‌هاو ره‌وشت و ره‌فتارانه ده‌کات که پێویسته زاڵ بێت به‌سه‌ر فه‌رمانڕه‌واو فه‌رمانبه‌رداردا، هه‌روه‌ها ئه‌و فه‌رمووده پیرۆزانه‌ی که په‌یوه‌ندیداره به‌و بابه‌ته‌وه.

١٨٩ن– (جاد الله الغنيمي الفيومي) له ساڵی ١١٠١ ك/١٦٩٠ ز دا له ژیاندا بووه. زانای شافیعیی و وێژه‌وان[٤٧٢].

٢٤٨ك– مرواریی گه‌شاوه له ره‌فتاری وه‌زیردا (الدر النضير في آداب الوزير)[٤٧٣]. بریتییه له‌و سوودانه‌ی که په‌یوه‌ندیداره به پۆستی وه‌زیره‌وه، بۆ یه‌کێك له وه‌زیرانی ده‌وڵه‌تی عوسمانی داناوه.

١٩٠ن– (الحسن اليوسي) ١٠٤٠–١١٠٢ ك/١٦٣١–١٦٩١ ز.

حه‌سه‌ن کوڕی موحه‌ممه‌د کوڕی عه‌لی کوڕی یوسف کوڕی داوود، یوسیی، مه‌راکیشی، زانا، وێژه‌وان، به‌شداره له چه‌ندین جۆر زانستدا، به ره‌چه‌ڵه‌ك به‌ربه‌رییه[٤٧٤].

٢٤٩ك– نامه‌ی بچووك (الرسالة الصغرى)[٤٧٥].

---

472 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢، ل ١٠٥.

473 (محمد أبو الفتوح البسيوني) له نامه‌یه‌کی ماسته‌ری کۆلێژی شه‌ریعه‌ت و یاسای زانکۆی ئه‌زهه‌ردا توێژینه‌وه‌ی له‌سه‌ر کردووه (١٩٨١ ز).

474 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل ٢٩٤.

نووسـەر ئـەم کتێبـەی بـۆ مـەولا ئیـسماعیل کـوڕی شەریفولحەسـەنی نووسـیووەو تیایـدا ئـەوە ڕوونـدەکاتـەوە کـە پێویـستە لـە سـەر سـوڵتان سەبارەت بەو مافانەی کە وڵات بە بێ بەرپاکردنیان ڕاست نابێتەوە، ئینجا ئاگاداریی دەدات سەبارەت بەو گرفتە واقیعییانەی کە لە کاروباری دارایی و سەربازیی و دادوەرییدا بە هۆی گوێپێنـەدانی فەرمانـداران و بـاجوەرگران و ئیستیبدادییان و ویستیان بۆ ستەم و گەندەڵیی، داوا دەکات لە سوڵتان کە دەستی ئەو فەرماندارانـە لـە سـەر ڕەعیـەت هـەڵبگرێ و خـۆی شـەونخونی بکێشێت لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتییدا.

١٩١ن– (سليمان البحراني) ١٠٧٥–١١٢١ ك/١٦٦٥–١٧٠٩ ز.

سولەیمان کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەلی کوڕی عەمماری بـەحرانی، ڕاویـی، مـاحوزیی، لـە زانایـانی شـیعەی ئیمامییـە، لـە فەرمووودەناسـیی و مێـژوودا ناوبانگی پەیدا کردووە[٤٧٦].

٢٥٠ك– پێشەوایەتیی (الإمامة)[٤٧٧].

١٩٢ن– (أحمد الكواكبي) ١٠٥٤–١١٢٤ ك/١٦٤٤–١٧١٢ ز.

ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی حەسـەن کـوڕی ئەحمـەدی کـەواکیبی، حەلەبی، زاناو تێگەیشتوو (فقيه)، لە حەلەب لەدایك بووەو پۆستی موفتیی

---

[475] (فاطمة خليل القبلي)) لە چوارچێوەی (رسائل ابن علي الحسن اليوسـي) بـە توێژینـەوەوە بـڵاوی کردووەتەوە. ((دار البیضاء: دار الثقافة ١٤٠١ ك/١٩٨١ ز) لە گەنجینەی حەسەنیشدا لە ڕیبات بـە ژمارە: ٧١٥٤ نوسخەیەکی پارێزراوە.

[476] (الاعلام، الزركلي) ب ٣، ل ١٢٨-١٢٩.

[477] دەستنووسێکی لە کتێبخانەی حوسەینی نەجەفدا پارێزراوە، هەروەها (هديـة العـارفين) ب ١، ل ٤٠٤-٤٠٥ باسی کردووە.

حەنــەفیی لــە قوســتەنتەنییە وەرگرتــووە و هــەر لــەوێش کۆچــی دوایــی کردووە[478].

٢٥١ک– کتێبێـک سـەبارەت بـە پاشـاو وەزیـرو زانایـان لـە کاروبـاری شـەرعییدا (کتــاب فیمــا یتعلــق بالملــك و الــوزیر و العلمــاء مــن الأمــور الشرعیة)[479].

١٩٣ن– (أحمد الولالي) کۆچکردوویی ١١٢٨ ک/١٧١٦ ز.

ئەحمـەد کـوری موحەممـەد کـوڕی موحەممـەد کـوڕی یـەعقوبی وەلالـی ڕێزدارێکی خەڵکی ((فاس))ە لە مەکناس کۆچی دوایی کردووە[480].

٢٥٢ک– ئامۆژگاریی رۆشـن بـۆ بناغـەی جێنـشینان (نـصیحة الـصفاء في قواعد الخلفاء)[481].

لــە چــوار بەنــددا ڕێکخــراوە، یەکــەمیان لــە کلیلــەکانی خیلافەتدایــە، دووەمیان لە پاراستنی (حزر) دایە، سێیەمیان لە چەسپاندنیدا، چوارەمیان لە جوان تـەواوکردن (حـسن کمـال)یـدا، نووسـەر ئـەم کتێبـەی پێـشکەشی مەولای ئیسماعیل شەریف کردووە.

١٩٤ن– (أحمد عثمان زادە) کۆچکردووی ١١٣٦ ک/ ١٧٢٤ ز.

ئەحمەد تائب ئەفەندی کوڕی عوسمـان زادە ناسـراو بـە عوسمـان زادە، ئامۆژگار، بە دوورخراوەیی لە دادوەریی لە میسر کۆچی دوایی کردووە[482].

---

478 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٢، ل ٩٠.

479 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەحمەدیە لە زەیتونە، تونس، ژمارە:/ ٥٠٨٥ لە ١١٤ لاپەڕەدایە.

480 (الأعلام، الزركلي) ب ١، ل ٢٤١.

481 دەستنووسێکە لە گەنجینەی حەسەنی لە ریبـات ژمـارە: ٣٩١٤، لـە گەنجینـەی گـشتیی ریبـات ژمارە: ٣٨٣ کتا، زانکۆی ئەردەنی ژمارە: ٢٢.

482 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ١٧٩.

٢٥٣ك– بەرهـەمی ناوەکـان بـۆ ئامۆژگـاریی پاشـایان (ثمـار الاسمـاء في نضائح الملوك)[٤٨٣].

نووســەر پێــشکەشی غــازی پاشــای کــردووە لــە ســەردەمی ســوڵتان موحەممەدخاندا، عەبدولفەتاح شەفەقەت ئەفەنـدی (کۆچـکردووی ١٢٤٢ ك) راڤەیەکی لە سەر نووسـیوە و نـاوی نـاوە: ((ذیـل حدیقـة الملـوك و الـوزراء لعثمان زاده أفندي)[٤٨٤].

١٩٥ن– (محمد ددة أفندي) کۆچکردووی ١١٤٦ ك/١٧٣٤ ز.

موحەمــەد ددە کــوڕی موســتەفا کــوڕی یــەحیا حــەبیبی ئــەرزڕۆمیی، حەنـەفیی ناسـراو بـە ددە ئەفەنـدی بـە ((تێگەیـشتوو بەشـدار لـە هەنـدێ زانستدا، لە برووسە کۆچی دوایی کردووە))[٤٨٥].

٢٥٤ك– سیاسەتی شەرعیی (السیاسة الشرعیة)[٤٨٦].

نووســەر لــەم کتێبــەدا باســی سیاســەتی شــەرعیی بــە مانــا زاراوەییــە ناسراوەکەی دەکات.

١٩٦ن– (محمد بن كنان) ١٠٧٤–١١٥٣ ك/١٦٦٣–١٧٣٠ ز

---

483 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی کوبلرلی، وەقفی ((محمد عاصـم بـك)) ژمـارە: ٣٨٣، بریتییـە لـە ١٣٣ لاپەڕە.

484 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی کوبلرلی، وەقفی ((محمد عاصم بك) ژمارە: ٣٨٩.

485 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٩، ل ٢٩٨-٢٩٩.

486 دەستنووسـێکە لـە خانـەی کتـێبی میـسری، ژمـارە: ٢٩ (اجتمـاع تیمـور) لـە ٢٧ لاپەڕەدایـە نوسخەیەکیش لە کتێبخانـەی کـوبلرلی، کۆمەڵـەی ژمـارە: ٦٢ وەقفـی موحەممـەد عاسـیم بـەگ بـە ناونیـشانی ((رسـالة في الـسیاسة الـشرعیة)) هەیـە، هـەروەها ((ایـضاح المکنـون، البغـدادي)) بـە ناونیشانی (السیاسة و الاحکام لددة أفندي) ب ٢، ل ٣٠٤.

موحەممەد کوڕی عیسا کوڕی مەحمود کوڕی موحەممەد کوڕی کینانی حەنبەلیی، سالحیی، دیمەشقیی، خەلوەتیی، مێژوونووس، بەشدار لە هەندێ زانستدا، لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە[٤٨٧].

٢٥٥ک– باخچەکانی یاسەمین بۆ زاراوەکانی یاسای خەلیفەو دەسەلاتداران (حدائق الياسمين في مصطلح قوانين الخلفاء و السلاطين)[٤٨٨].

١٩٧ن– (شاه ولي الله الدهلوي) کۆچکردووی ١١٨٠ ک/١٧٦٦ ز.

تێگەیشتوو (فقیه)، ئوسولیی، فەرمووده‌ناس و توێژەری قورئان[٤٨٩].

٢٥٦ک– بەلگەی خوایی راگەیەنراو (حجة الله البالغة)[٤٩٠].

لەم بەرهەمەدا نووسەر بەشەگەلێکی سەربەخۆی بۆ گۆشەنیگای سیاسیی هەلبژاردووە کە نیشاندەری رەسەنایەتیی فیکریی ناوبراوە. لە بەرگی یەکەمدا باسی مەسەلەی سیاسەتی شار دەکات، لەوەدا چەمکی شار و پێویستیی کۆمەلگەی مرۆڤایەتیی و پێویستیی خەلک بە دەسەلاتدار و شێوەی رەفتاری پاشا لەگەل رەعیەت و هاوکارانیشی دیاریی دەکات، لە بەرگی دووەمیشدا باسی چەمکی خیلافەت و لادانی ستەم و جێبەجێکردنی سنوور (حدود)ە شەرعییەکان و دادگاو جیهاد بە راڤەو دوورو درێژیی باس دەکات.

١٩٨ن– (الامير الصنعاني) ١٠٩٩–١١٨٢ ک /١٦٨٨–١٧٦٨ ز.

---

487 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل ١٠٨، (الأعلام، الزركلي) ب ٦، ل ٣٢٣.

488 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی میسریی ژمارە: ٦٨٨٩ (أدب)، زانکۆی ئەمەریکی بەیرووت، مایکرۆفیلم (Mic-A-326).

489 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة)ب ٤، ل ٢٩٢.

490 توێژینەوەی سەیدسابق، قاهیرە، (دار الكتب الحديثة) ١٩٦٦ ز.

موحەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی سەلاحی کەحلانیی، ئینجا سەنعانیی و ناسراو بە ئەمیر، فەرموودەناس، فەقیهو ئوسولّیی، موجتەهید، قسەزان، لە پێشەوایانی یەمەنە[491].

٢٥٧ك– پاسەوانی لە دژانی رەوایی لـە سیاسـەت (الحراسـة مـن مخالفـة المشروع من السياسة)[492].

١٩٩ن– (أحمد الدمنهوري) ١١٠١–١١٩٢ ك/١٦٩٠–١٧٧٨ ز.

ئەحمەد کوڕی عەبدولمونعم کـوڕی یوسـف کـوڕی سـیامی دەمـەنهوریی مەزاهبیی، ئەزهەریی، شێخی مزگەوتی ئەزهـەر، بەشـدار بـووە لـە زۆربـەی زانستەکاندا[493].

٢٥٨ك– سوودی زۆر لە چاکسازیی سـولّتان و وەزیـردا (النفـع الغزيـر في صلاح السلطان و الوزير)[494].

ئەم کتێبـە لـە چـوار بـەش پێکهـاتووە. نووسـەر لـە پێـشەکییدا باسـی پێویـستیی و خوازیـاری کۆمەلّگـە بـە دەسـەلاّتدار دەکـات، چـونکە هـیچ کۆمەلّگەیـەك بـەبێ دەسـەلاّتدار بـەردەوام نابێـت، لـە بەشـی یەکەمـدا جیاکـەرەوەو تایبەتمەندییـەکانی دەسـەلاّت ئامـاژە پێـدەدات، چـونکە بەرژەوەندیی دەسەلاّتدار لەگەلّ بەرژەوەندیی موسلّماناندا هاوتەریبە، رۆلّی وەزارەت لـە بەشـی دووەم و ئەرکـەکانی دەسـەلاّتدار (سـلطان) لـە بەشـی

491 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٩، ل ٥٦.

492 (ايضاح المكنون، البغدادي) ب ١، ل ٧٠، ((هدية العارفين)) ب ٢، ل ٣٣٨.

493 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٣٠٣.

494 دەستنووسـێکە لـە خانـەی کتـێبی میـسری ژمـارە: ١٧٤ (علـوم إجتماعيـة)، مـایکرۆفیلم: ١٧٢٢٣.

سـێیەمداو ئەرکـەکانی وەزیـر لـە بەشـی چـوارەمدا خراوەتـە بـەرباس و توێژینەوە. لەم کتێبەدا ئاماژە بـە خـاڵێکی گـرنگ سـەبارەت بـە خیلافـەت دەکـات: ((دوای مەغۆلـەکان، خیلافـەتی رواڵـەتی گوێزرایـەوە بـۆ میـسر و مەرگی خەلیفە متەوەکل لـە سـاڵی ٩٥٠ ك، دیـاردەی خیلافـەتی رواڵـەتیش تەواوبوو، جگە لە پاشایەتیی و وەزارەت شتێکی تر نەمایەوە))، نووسـینی ئەم کتێبە لە ساڵی ١١٨١دا تەواوبووە.

٢٥٩ك– گرتنەبـەری رێگـای ئامۆژگـاریی پاشـایان بـەوەی کـە خـوای باڵادەست لە بارەی دەسەڵاتدارو وەزیـرەوە فەرموویـەتی، ئـەوەش کـە لـە سەریانە بۆ رەعیەت لە پارێزگاریی و تەگبیری چاك (نهج السلوك الى نصيحة الملوك فيها تفضل به الباري على السلطان و الوزير وما و جب عليها للرعية من الحفظ و حسن التدبير)[٤٩٥].

٢٠٠ن– (محمد أسعد زاده) کۆچکردووی ١٢٠٤ ك/١٧٩٠ ز.

موحەممەد شەریف کوڕی موحەممەد ئەسعەد کوڕی ئیـسماعیلی رۆمـی، ناسـراوە بـە ئەسـعەد زادە، لـە شەیخولئیـسلامەکانی سـەردەمی عوسمانییە[٤٩٦].

٢٦٠ك– بەشگەلێك لە بۆچـوون سـەبارەت بـە پاشـاو وەزیـران (فـصول الآراء في شأن الملوك و الوزراء)[٤٩٧].

٢٠١ن– (المظهر الصنعاني) ١١٣٢–١٢٠٧ ك/١٧٢٠–١٧٩٣ ز.

---

495 (إيضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل ٥٩١. نووسەر لە سەرەتای کتێبی (النفع الغزير)دا ئاماژەی پێداوە.

496 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٠، ل ٦٧–٦٨.

497 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ٣٤٧، ((إيضاح المكنون)) ب ٢، ل ١٩٢.

مەزهەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی یەحیا کوڕی حوسەین کوڕی قاسم کوڕی موحەممەد حەسەنی، سەنعانیی، وێژەوان، شاعیر، مێژوونووس، لە سەنعا لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٤٩٨].

٢٦١ك– سانای پێشخراو و گرێبەستی دەورەدراو بە ئامۆژگاری خەلیفەو پاشایان و ئەوان و وەك ئەوان (الیسیر المعجل و العقد المکلل في نضائح الخُلفاء و الملوك ثم الامثل فالأمثل)[٤٩٩].

٢٠٢ن– (عمر بن عثمان بن العباس الکرسیفي) کۆچکردووی ١٢١٤ ك/١٨٠٠ ز.

فەقیهێکی مالیکیی، خەڵکی کەرسیفە لە مەغریب[٥٠٠].

٢٦٢ك– نامەیەك لە حەسبەدا (رسالة في الحسبة)[٥٠١].

نووسەر بە لێکۆڵینەوەی پێشکەوتنی دیوانی حەسبە، باسی ئەو زیانانە دەکات کە لەو دامەزراوەیە کەوتوون. بە پێی راپۆرتی ئەو، گرنگیدانی بەرژەوندییخوازان و سەوداگەران بەم ئۆرگانە پێکەوەنانی سامان لەم رێگەیەوە و فراوانبوونی و بڵاوبوونەوەی بەرتیلخۆریی، بووتە هۆی ناکارامەیی ئەم دامەزراو (ئۆرگان)ـە ئەو دواتر لە بارودۆخی ئابوورییدا دیاردەکانی کڵاولەسەرنان (فێڵبازی)ی بازرگانیی و پیشەیی و نرخدانان باسدەکات بە جەخت لە سەر کردنەوە دەیەوێت کەس ئەهلی زیمە (أهل

498 (أعلام المؤلفين، رضا کحالة) ب ١٢، ل ٢٩٤.

499 (أعلام المؤلفين، رضا کحالة) ب ١٢، ل ٢٩٤.

500 سەرچاوەیەکم دەست نەکەوت بۆ راڤەی ژیانی ئەم نووسەرە جگە لەوەی کە لە کتێبەکەی خۆیدا نووسراوە.

501 لیفی بروفنسال لە چاپکراوەکانی پەیمانگای فەرەنسی بۆ کەلەپوری خۆرهەڵات لە قاهیرە: ١٩٥٥ ز، ل ١١٧-١٢٨ بڵاوی کردووەتەوە.

الزمه) ئازارو ئەشکەنجە نەدات و گرنگیی بدرێت بە کاروباری فرۆشیاران و خاوەن پیشەکان.

٢٠٣ن- (محمد بيرم) ١١٣٠-١٢١٤ ك/١٧١٨-١٨٠٠ ز.

موحەممەد کوڕی حوسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی موحەممەد کوڕی بەیرەم، فەقیهێکی حەنەفییە و خەڵکی تونسە، چل و پێنج ساڵ موفتیی ئەو وڵاتە بووە[٥٠٢].

٢٦٣ك- نامەیەك لە سیاسەتی شەرعییدا (رسالة في السياسة الشرعية)[٥٠٣].

نووسەر ئەم بابەتەی بە باسی سیاسەت و شەرعییبوونی دەست پێدەکات، ئەوەش کە پێویستە دەسەڵاتدار ئەنجامی بدات، ئینجا بەرژەوەندیی، بەڵگەی کارکردن بە یاسای سیاسیی، بنەما شەرعییەکانی پشتیوانی کارکردن بە یاساکان، فەرمانڕەوایی گشتیی و تایبەت، گۆڕانی فەرمان (حكم)ـەکان بە گۆڕانی نەریت، حەسبە، پێویستی ئەو ولایەتانەی کە بەرژەوەندییان تێدایە، نرخدانان لە سەر خەڵکی بازاڕ، پیشەسازییە پێویست (واجب)ـەکانی، ئەو باسانەن کە لە کتێبەکەدا هاتوون.

٢٠٤ن- (أبو القاسم الزياني) ١١٤٧-١٢٤٩ ك/١٧٣٤-١٨٣٣ ز.

ئەبولقاسم کوڕی ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمی زەییانی، مێژوونووس، گەڕیدە (رحالة)، وێژەوان، نووسەر، لە وەزیرانی دەوڵەتی

---

502 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٩، ل ٢٣٣.

503 لە میسر چاپکراوە (المطبعة الاعلامية، ١٣٠٦ ك/١٨٨٦ ز) ناونیشانی بریتییە لە: (نبذة مختصرة في بعض القواعد الشرعية لحفظ الادارة الملكية) بریتییە لە ٣٤ لاپەڕە.

مەغریب، لە شاری ((فاس)) لە دایك بووە، چووە بۆ قوستەنتەنییە وەكو باڵیۆزی سوڵتان موحەممەد كوڕی عەبدوڵڵا[504].

٢٦٤ك- نامەی رەفتار لەوەدا كە پێویستە لەسەر پاشایان (رسالة السلوك فيها يجب على الملوك)[505].

ئەم كتێبە ئاڕاستەی سوڵتان عەبدولحەمید كوڕی ئەحمەدی عوسمانیی كراوە، كە دابەش بووە بەسەر پێشەكییەك و بیست بەنددا.

٢٠٥م- (عبدالوهاب ياسيني) ١١٧٢-١٢٤٩ ك/١٧٥٩-١٨٣٣ ز.

عەبدولوەهاب كوڕی عوسمان رۆمیی، حەنەفیی، ناسراو بە یاسینی زادە، تێگەیشتوو (فقيه)، كراوە بە موفتیی، پاش دوورخستنەوەی لە پۆستی شەیخولئیسلامی كۆچی دوایی كرد[506].

٢٦٥ك- كورتەی بەڵگە لە گوێڕایەڵیی سوڵتاندا (خلاصة البرهان في إطاعة السلطان)[507].

٢٠٦ن- (الشوكاني) ١١٧٣-١٢٥٠ ك/١٧٦٠-١٨٣٤ ز.

موحەممەد كوڕی عەلی كوڕی موحەمەد كوڕی عەبدوڵڵا كوڕی حەسەنی، یەمەنیی، قورئانلەبەر، زانای زۆر زیرەك (العلاقة)، تێگەیشتوو، تێكۆشەر (المجتهد)، لە گەورە زانایانی یەمەنەو دادوەریی سەنعای لە ساڵی

---

504 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٨، ل ٩٣.

505 دەستنووسێكە لە گەنجینەی (القرويين) لە چوارچێوەی كۆمەڵی ٩٧ ب بۆ ١٨٠ ب.

506 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٦، ل ٢٢٥.

507 دەستنووسێكە لە قوتابخانەی حەسەنیی لە موسڵ (عێراق) ژمارە: ١٠٣، هەروەها (إيضاح المكنون، البغدادي) ب ١، ل ٤٣٤،((هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل ٦٤٣.

(١٢٢٩ك)دا پــێ سـپێردراوە، لـە کـاتی مردنیـشدا هـەر دادوەر بـووە، ئـەو شوێنکەوتن (تقلید)ی بە حەرام دەزانی و خاوەنی (١١٤) دانراوە[٥٠٨].

٢٦٦ك– دەرمانی خێرا بۆ دەرکردنی دووژمنی هەڵمەتبـەر (پـەلامـاردەر) (الدواء العاجل لدفع العدو الصائل)[٥٠٩].

٢٦٧ك– نامەی پەیوەنـدییکردن بـە دەسـەڵاتدارانەوە (رسـالة الاتـصال بالسلاطين)[٥١٠].

٢٦٨ك– وتەی راستگۆیانە لـە سـەر فـەرمانڕەوایی پێـشەوای خراپـەکار (القول الصادق في حكم الإمام الفاسق)[٥١١].

٢٦٩ك– گرێبەســتی بــەنرخ بــۆ ســەلماندنی سەرپەرشــتی ئــەمیری ئیمانداران (العقد الثمين في إثبات وصاية أمير المؤمنين)[٥١٢].

٢٠٧ن– (حسن العطار) ١١٨٠–١٢٥٠ ك/١٧٦٦–١٨٣٤ ز.

حەسەنی کوڕی موحەممەدی عەتتار، شافیعیی، ئەزهـەریی، مـەغریبیی، میسریی، زانا، وێژەوان، شاعیر، بەشـدار لـە زانـستەکانی ئوسـوڵ و نـەحو، مانــا دۆزیــی (المعــاني) و دەرخــستن (البیــان) و مــەنتیق و پزیــشکیی و گەردووناسیی و زایرەجە (ئەستێرەناس) و ئەندازیاریی، لە قـاهیرە لـەدایك

508 (الأعلام، الزركلي) ب ٦، ل ٢٩٨.

509 دەستنووسە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ق ٧٧-٩٠ مجـاميع ٨٦، هـەروەها ((فهـرس الجـامع)) ئاماژە دەدات کە ئەم دەستنووسە لە سیاسەتی فەرمانڕەوایی و تەگبیری کاروباری وڵاتاندا نووسراوە.

510 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ٣٦٥-٣٦٦.

511 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ٣٦٥-٣٦٦.

512 (هدية العارفين، البغدادي) ب ٢، ل ٣٦٥-٣٦٦.

بووه، سەردەمێکیش لە دیمەشق ژیاوە و بەرپرسیاریی و شێخایەتیی ئەزهەریشی وەرگرتووە[٥١٣].

٢٧٠ك– نامەیەك بۆ دەستەبەرکردنی خیلافەتی ئیسلامیی (رسالة في تحقيق الخلافة الاسلامية)[٥١٤].

٢٠٨ن– (محمد الكردودي) ١٢١٧–١٢٦٨ ك/١٨٠٢–١٨٠٢ ز.

موحەممەد کوڕی عەبدولقادر کوڕی ئەحمەدی حەسەنی، ئیدریسیی، فاسیی، ناسراو بە (کردودي)، تێگەیشتوو، نەحویی، وێژەوان، زمانەوان، مێژوونووس، دادوەریی تەنجە (طنجة)ی پێدراوە[٥١٥].

٢٧١ك– لابردنی غەم و پەژارە لە دەرخستنی ئەوەی کە جەنگی رژێم ئەرکە (هەقە) لە سەر ئەم ئومەتە (كشف الغمة ببيان أن حرب النظام حق على هذه الامة)[٥١٦].

٢٠٩ن– (محمود الآلوسي) ١٢١٧–١٢٧٠ ك/١٨٠٢–١٨٥٤ ز.

مەحمود کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی حوسەینی ئالوسی، تویژەری قورئان، فەرموودەناس، تێگەیشتوو، وێژەوان، زمانەوان، نەحویی، بەشدار لە هەندێ زانستدا، لە بەغداد لە دایك بووەو لە هەمان شاریشدا پۆستی موفتیی پێ بەخشراوە، دواتر لادراوەو کۆچی کردووە بۆ موسڵ و دواتریش

513 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل ٢٨٥.

514 دەستنووسە لە خانەی کتێبی میسری، ژمارە ٣٨٠ (الزكية) بریتییە لە ١٦ لاپەڕە.

515 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٠، ل ١٨١.

516 دەستنووسە لە گەنجینەی گشتیی ریبات لە چوارچێوەی کۆمەڵەی ((ق ٣٦١-٥٣٩)) بریتییە لە ١٧٩ پارچە.

بۆ قوستەنتەنیە و سوڵتان عەبدولمەجید زۆر ڕێزی لێ گرتووەو گەڕاوەتەوە بۆ بەغدادو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٥١٧].

٢٧٢ك– دەرخستن، راڤەی بەڵگەی گوێڕایەڵی سولتان (التبيان شرح البرهان في اطاعة السلطان)[٥١٨].

٢١٠ن– (أحمد الإستانبولى) کۆچکردووی ١٢٨١ ك/١٨٦٤ ز.

ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی ئەحمەدی ئیستانبوڵی، تێگەیشتووی حەنەفی (فقيه حنفي)، لە ئەستانبوڵ لەدایك بووەو لە دیمەشق ژیاوە[٥١٩].

٢٧٣ك– دیاریی خەڵکی سەردەم لە وتەی دەرخەری فەزڵی دەسەڵاتدا (تحفة أهل الزمان من أحاديث في بيان فضل السلطنة)[٥٢٠].

٢١١ن– (رفاعة الطهطاوي) ١٢١٦–١٢٩٠ ك/١٨٠١–١٨٧٣ ز.

ڕەفاعە کوڕی بەدەویی کوڕی عەلی کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی ڕافیعی تەهتاویی، میسریی، حوسەینی، شافیعیی، زانایەکی بەشدار لە جۆرەکانی زانستدا، دەرچووی ئەزهەرە، نێردراوە بۆ فەرەنساو لەوێ خوێندوویەتی و لە جوگرافیا و مێژوودا شارەزا بووە، گەڕایەوە بۆ میسر بۆ ئەوەی سەرۆکایەتی وەرگێڕان لە قوتابخانەی پزیشکییدا بگرێتە ئەستۆ، ڕۆژنامەی ((الوقائع))ی میسریی دامەزراند و چەندین کتێبی وەرگێڕا[٥٢١].

---

517 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٢، ل ١٧٥.

518 دەستنووسە لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی عێراقیی، ژمارە: ٥٦١٦، لە زانکۆی ئەمەریکی بەیرووت (Mic-A-380)، هەروەها (إيضاح المكنون) ب ١، ل ٢٢٣ باسی کردووە.

519 (الإعلام، الزركلي) ب ١، ل ١٨٩.

520 دەستنووسێکە لە خانەی کتێبی ((ظاهرية)) لە دیمەشق، ژمارە: ٤٣٥٢ بریتییە لە ٣٠ لاپەڕە.

521 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٤، ل ١٦٨.

٢٧٤ك– دەوڵەتی ئیسلامیی، سیستم و فەرماندارانی (الدولـة الاسـلامية، نظامها و عمالاتها)[٥٢٢].

ئەم کتێبە لە سەرەتادا جەخت دەکاتەوە لە سـەر ئـەوەی کـە مـرۆڤ لـە سروشتیدا شارستانییە، مرۆڤ پێویستیی بە پیشەسازیی جۆراوجۆر هەیـە و پێویـستە کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتیی بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئـەم پێویـستییانە هەوڵبدات، لە درێژەی کتێبەکەدا باسـی پێـشەوایەتیی گـەورە و پێویـستیی ئـەوی بـۆ ئاوەدانکردنـەوەو پارێزگـاریی ئـایین و هەلومـەرجی دیـارییکردنی پێـشەوا دەکـات، لەوێـشەوە باسـی دامـەزراوەکانی دەوڵـەت و مـەوداکانی چـالاکیی سیاسـیی دەکـات، لەوانـە: وەزارەت، پۆسـتە، فیقهیـەکان وەکـو فـــەتوادان، پـــەروەردەو فێرکـــردن، هێـــزی ســـەربازیی، باڵیۆزخانـــە، دەسـەڵاتداریی، دادوەریـی، دامـەزراوەی حەسـبەو سەرپەرشـتی پاسـەوانی شەو و پۆستە جیهادییـە جۆراوجۆرەکـان و پۆسـتەکانی کۆکردنـەوەی بـاج لەوانە جیزیە، دەیـەك، خـەراج، رووپێوچـی، زەکـات، بەخـشین، ئـەوقاف و سەرپەرشـــت و پـــارێزەرانی وەکوبەرپەرســـی خەزێنـــە (بیـــت المـــال)، خەزێنـــەداری ئـــاڵتون و زیـــو، خەزێنـــەداری خـــواردن، تـــرازوو و پێوانـــەی شـەرعیی، سـکەلێدان، نەخۆشـخانە، باسـدەکات. شـێوەی پێـشکەشکردنی تەهتاویی، توانی سیستمی سیاسیی ئالمۆندو پاول لە زەینی مرۆڤدا زیندوو بکاتەوە.

٢١٢ن– (أحمد بن أبي الضياف) ١٢١٩–١٢٩١ ك/١٨٠٤–١٨٧٤ ز. تونسی، وەزیر، مێژوونووس و وێژەوان[٥٢٣].

---

[522] لە قاهیرە بڵاوکراوەتەوە: کتێبخانەی ئاداب (١٩٩٠)، بریتییە لە ٣٢٦ لاپەڕە پێشتریش دکتـۆر موحەممەد عەمارە بڵاوی کردووەتەوە لە چوارچێوەی (الاعمال الكاملة للطهطاوي)دا.

٢٧٥ك– خەڵاتكردنی سەردەم بە هەواڵی پاشایانی تونس و سەردەمی ئارامیی (إتحاف أهل الزمان بأخبار ملوك تونس و عهد الأمان)[٥٢٤].

تا ئەو جێگەیەی کە من لێکۆڵینەوەم بۆ کرابێت و دەستم پێی گەشتبێ، ئەم کتێبەو سێ کتێبی (العقد الفريد– إبن عبدربه)، (عيون الأخبار– إبن قتيبة) و (حجة الله البالغة– شاه ولی الله الدهلوي)، تەنها کتێبگەلێکن کە باسی بابەتە جۆراوجۆرەکانیان کردووە، هەروەها بەشێکی تایبەتیان بۆ سیاسەت تەرخان کردووە، لەم رووەوە لە سەرچاوە ناڕاستەوخۆکانی زانستی سیاسیی (کە لە سەرەتای بەشی دووەمدا باسی کرا) باسیان نەکرا، چون لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە بە شێوەیەك باسی زاراوەکانی زانستی سیاسەتیان کردووە کە لەگەڵ سەرچاوەکانی تردا کە راستەوخۆ باس دەکرێت، بەرانبەرن.

ئیبنو ئەبی زیاف لە سەرەتای بەشی یەکەمدا، باسی چەمکی پاشایەتی، جۆرەکانی، پێویستی دادگەریی لە پاشایەتییەکاندا و گرنگیی پۆستی پاشایەتی و بەڵگەی شەرعیی پێویستبوونی پاشایەتی و مەرجەکانی باس دەکات، پاشان پاشایەتیی پۆستی دەستەی رەهاو مەرجدار و کۆماریی دابەش دەکات.

پاشایەتی رەها لە بەرانبەری خودایەکدا کە دروستکردن و فەرمان بەدەستی ئەوە، سەری تەسلیم دانانەوێنێت، لە باسی پەیوەست بە پاشایەتی رەها ئاماژەکراوە بە مەسەلەگەلێکی وەکو فەرمانبەرداری خودا، فەرمانبەرداریی و گوێڕایەڵیی دەسەڵاتداری موسڵمانان و ئارامگریی لە

---

[523] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٢٥٥.

[524] لە تونس بلاوكراوەتەوە ((كتابة الدولة للشؤون الثقافية و الاخبار))، (١٩٦٣ ز).

بەرانبەری پاشاکەیەوە کە لە حاڵەتی جەنگدایە. ئەو داکۆکیی دەکات کە ئارامگرتن (صبر) دژایەتی نییە لەگەڵ قبوڵنەکردن و دژایەتی دەسەڵاتدار یان فەرمانکردن بە چاکەدا. بە بۆچوونی ئەو پاشایەتی رەها (مطلق) تەنها تایبەتمەندە بە خوداوە و جگە لەمە لەگەڵ شەرعدا دژ دەبێت، چونکە لە پاشایەتیی رەهادا بەندەکانی خواو سەرزەویی ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دەکەونە ژێر فەرمان و هەواو ئارەزووی ئەوەوە، لە حاڵەتێکدا شەریعەتەکان بۆ ئەوە دروست کراون کە کەسی داخوازییلێکراو لە ئارەزووپەرستیی دووربخەنەوە. ئەم پاشایەتییە دژە لەگەڵ ژێرییشدا، چونکە داپلۆسین و ستەمکارییە و بەهۆیەوەیە کە لەم جۆرە پاشایەتییەدا شۆرشگێڕو نارەزایی زۆر زۆرن. ئینجا ئەو باسی کاریگەریی نێگەتیڤی ئەو جۆرە پاشایەتییە دەکات لە ئاوەدانکردنەوەدا دواتر باسی پاشایەتی کۆماریی دەکات کە لە ئەمەریکاو وڵاتانی تردا بۆتە باو و بەرژەوەندیی دنیایی تایبەت و گشتیی خەڵکیی دابین کردووە، چونکە کارەکانیان بە راوێژە (هەروەکو قورئانی پیرۆز لە باسی باوەڕدارانـدا ئامـاژەی پێکردووە "وأمرهم شورى بينهم").

سێیەمین جۆری حکومەتیش پاشایەتیی کۆت و بەند کراوە بە یاسا، کە بەندەکانی خوا ئاگایان لە کارەکانی هەیەو چاودێریی دەکەن و گەندەڵیی بەم شێوەیە کەمدەبێتەوە. لە کۆتاییشدا باسی چەندین مەسەلەی وەکو راوێژ، دادپەروەری و تایبەتمەندیی پێشەوای دادگەر دەکات. ئاشکرایە کە ئەو زاراوەی پاشایەتیی بە تێگەیشتن (مفهوم)ی سیستمی سیاسیی یان حکومەت بەکارهێناوە، چونکە دەوڵەتی ئەمەریکا پاشایی نەبووە، لە حاڵەتێکدا ئەو بۆ ئەم حکومەتە لە زاراوەی پاشایەتیی سوودی وەرگرتووە.

٢١٣ن– (محمد بيرم الخامس) لە ساڵی ١٢٩٨ ك/١٨٨١ ز دا لە ژیاندا بووە[٥٢٥].

٢٧٦ك– تێبینیگەلێكی سیاسیی لە سەر ئەو ڕێكخراوە پێویستییانەی كە بۆ دەوڵەتی خاوەنشكۆ پێویستن، (ملاحظات سياسية عن التنظيمات اللازمة للدولة العلية)[٥٢٦].

ئەم كتێبە لە ساڵی (١٢٩٨ك)دا پێشكەشی سوڵتانی هێرشبەر عەبدولحەمیدخانی دووەم كراوە، سەرەتا بە باسی گرنگ ئامۆژگاریی دەكات كە مەبەست لە دانانی كتێبی سیاسیی چەسپاویی و خۆڕاگریی دەوڵەت و چاكسازیی بارودۆخیەتی. ئینجا باسێكی زۆر گرنگ دەكات كە بۆ سەردەمی خۆی و دوای خۆیشی زۆر گرنگە، كە پێویستە بە وەرگرتن لە دەوڵەتانی ئەوروپا و مەترسیی لاساییكردنەوە و لێچواندنیانە، بەتایبەتی باسی مەسەلەی ئازادیی سیاسیی لە ئەوروپا دەكات، جەخت دەكاتەوە لە سەر ئەوەی كە ئیسلام فەرمان دەكات بەوەی هەر وڵاتێ بە پێی ئەوەی كە گونجاوە بۆ خەڵكەكەی كار بكات، ئینجا باسی مەسەلەی ڕاوێژ و گرنگیی ئەوە دەكات كە ئەنجومەنی نوێنەران و پیاوماقوڵان كاریان بە دەست بێت و كاروبارەكانیش بدرێنە دەست خەڵكانی شایستەی خۆی. ئینجا باسی مەسەلەی كەمینەكانی ناو دەوڵەتی عوسمانی و مامەڵەیان لەگەڵ ئەوروپییەكاندا دەكات، ئەم پێشنیازانە دەكات: دیارییكردنی ئەنجومەنی نوێنەران (المبعوثات) لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوەو پێویستە بە ئەركی ڕاوێژ

[525] وەكو گەڕام نەمتوانی بۆ ژیانی سەرچاوە بە دەست بهێنم.

[526] لە قاهیرە چاپ كراوە: بە بێ خانەی بڵاوكردنەوەو بە بێ مێژووی بڵاوكردنەوەو لە كتێبخانەی زانكۆی قاهیرە زانیارییم لە سەر وەرگرت، كە لە ٤٣ لاپەڕەدایە.

هەڵسێت و وەزارەت بەرانبەری هەست بە بەرپرسیارێتی بکات. بۆ ئەوەش کە دادگەریی لە نێوان خەڵکاندا جێبەجێ بکرێت، پێویستە ئەنجومەنێکی تر پێکبهێنرێت بۆ یەکلاییکردنەوەی ململانێ و گشتاندن (تعمیم)ی پەروەردەو زاڵبوون بە سەر ئەو خاوەن بەرژەوەندییانەی کە دەست لە کاری دەوڵەتدا وەردەدەن، هەروەها پێویستە قەرزە داراییەکان پاك بکرێنەوە، پێویستە پیاوانی دەوڵەت لە نێو زانایانی پاکدا هەڵبژێردرێن نەك لە نێو نەزان و بێهێزاندا، یا بەرتیلخۆر یا زانای بەرتیلخۆردا.

٢١٤م– ((محمد بن علي بن حسن المعروف بصديق حسن خان)) کۆچکردووی ساڵی ١٣٠٧ ك/١٨٨٩ ز[٥٢٧].

٢٧٧ك– ئابڕوو لە روونکردنەوەی مەبەستەکانی پێشەوایەتییدا (الكرامة في تبيات مقاصد الإمامة)[٥٢٨].

٢١٥ن– (خيرالدين التونسي) ١٢٢٥–١٣٠٨ ك/١٨١٠–١٨٩٠ ز.

بە رەگەز چەرکەسییە، لە هۆزی ئەبازە (أباظة)، بەندەیەکی بچووك بوو هاتە تونس، لەوێ زانست فێربوو، دیاریی کرا بە وەزیری جەنگ و دواتر سوڵتان عەبدولحەمید بانگهێشتی کرد بۆ قوستەنتەنیە[٥٢٩].

٢٧٨ك– راسترینی رێگاکان بۆ زانینی حاڵ و باری خەڵکی وڵاتان (أقوم المسالك في معرفة أحوال أهل الممالك)[٥٣٠].

---

527 بۆ ژیانەکەی سەرچاوەم دەست نەکەوت.

528 لە شارۆچکەی ((بهوبال)) لە هیندستان، لە چاپخانەی ((صديقي)) چاپ کراوە، بەڵام مێژووی چاپکردنی لە سەر نییە.

529 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٤، ل ١٣٣.

530 بە هەوڵی (المنصف الشنوفي) لە (دار التونسية ١٩٧٢) لە ١٥٠ لاپەڕەدا چاپکراوە.

لـه وتـاری سـەرەتای کتێبەکـەدا، خـەیرەددین، ئـەوانیتر بـۆ پێویـستی وەرگرتن لە خۆرئاوا بانگ دەکات.

بە بۆچوونی ئەو، سیاسییەکانی پێشوو ئەم نیازەیـان دابـین نـەکردووە. ئــەو لــە ســەرەتای کتێبەکــەدا دەڵێــت: مەبەســت لــە نووســینی دەقــە سیاسییەکان بانگکردنی سیاسەتمەداران و زانایانە بۆ سوود وەرگـرتن لـەو هۆکارانەی کە دەزانێت بارودۆخی خەڵك و ژیان ئەوان باشتر دەکات، هەموو خەڵکیش ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کە نەکەن لە کاری پەسەندکراوی ئەوانی تـر پـشت هەڵبکـەن، چـونکە حیکمـەت، ونبـووی کەسـی خـاوەن بـاوەڕە. سـەرەنجام جگـە لـە پـەیڕەوی ئـەوروپاو وەرگرتنـی چاکـسازیی ئـەوان چارەیەکی تر نییە.

دەبێ بنەمای پێشکەوتنی ئەوروپا کە جگـە لـە دادپـەروەریی و زانـست شتێکی ترنیە ئەم دوانە لـە بنـەماکانی شـەریعەت. ئـەو ئینجـا باسـی راوێـژ (شوری) وەکو یەکێك لە بنەماکانی شەریعەت دەکات، بە بڕوای ئـەو ئـەهلی گرێدان و کردنەوە (حەل و عقد) کاری تایبەتی راوێژیان بـە دەسـتەو راڤـەو توێژینەوەی کارە نەویستراوەکان لە ئەستۆی ئەواندایە، نـاکرێ بـە جیـا لـە ئـەهلی حـەل و عەقـد متمانـە بـە وەزیـران بکرێـت. لـەوەدا کـە گیـانیی و سروشتی مرۆڤ بە ئازادیی خوڵقاوە، بەڵام دەبێ لە چارەنووسـی ئیـستیبداد و رای خۆپەسـەندیی ئاگـاداربین. خـەیرەدین لــە درێــژەی باســەکەیدا لــە چوارچێوەی باس و توێژینەوەی دواکەوتوویی دەوڵـەتی ئیـسلامییدا، رۆڵـی دەوڵــەتی عوسمــانی بــۆ پڕکردنــەوەو قــەرەبووی دواکــەوتوویی رۆڵــی یەنیـچەرییەکان لـە نادادگەرییـداو پێویـستیی چاکـسازیی و رێکخراوەکـان، گرنگیــدان (إمتیــان)ی دەرەکــی و مەتریــسداربوونی ئــەوەو پێویــستیی

رەخنەگرتن لە بنەمای گرنگییپێدانەکان و هەمواركردنی (یاساکان) ئاماژە دەکات و ئینجا مەودا گرنگەکانی شارستانیەتی ئەوروپایی باس دەکات، لەوانە، پیشەسازیی، بەڕێوەبردنی گونجاوی کتێبخانەکان، فێرکردن، ئازادیی تاك، ئازادیی چاپ و بڵاوکراوەکان و.. هتد.

٢١٦ن– (إبراهيم رحمي) کۆچکردووی ١٣١٢ ك/١٨٩٤ ز.

ئیبراهیم کوڕی عەبدولحەمید کرێدیی، رۆمیی، ناسراو بە رەحمی[٥٣١].

٢٧٩ك– هۆکاری رەفتار لە سیاسەتی پاشایاندا (واسطة السلوك في سياسة الملوك)[٥٣٢].

٢١٧ن– (حسن الطويراني) ١٢٦٦–١٣١٥ ك/١٨٥٠–١٨٩٧ ز.

حەسەن حەسەنی کوڕی حوسەین عارف کوڕی حەسەنی تووەیرانیی، وێژەوان، رۆژنامەنووس، پەخشاننووس، رێکخەر، بە رەچەڵەك تورك، بەعەرەببوو، لە قاهیرە لە دایك بووە لەوێش پێگەیشتووەو وڵاتی ئەفەریقا و ئاسیاو رۆم گەڕاوەو لە قوستەنتەنیە نیشتەجێ بووەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، گۆڤاری ((الانسان)) و رۆژنامەکانی ((السلام، الاعتدال و النيل)) و رۆژنامەی تریشی چاپ و بڵاو کردووەتەوە[٥٣٣].

٢٨٠ك– پاکی (ملوانکەی) ئیسلام لە پێویستی پێشەوادا (عصمة الاسلام في وجوب الإمامة)[٥٣٤].

---

531 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١، ل ٤٠٣.

532 (هدية العارفين، البغدادي) ب ١، ل ٤٤.

533 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٣، ل ٢١٦.

534 دەستنووسە لە خانەی کتێبی میسریی و بریتییە لە دوو بەرگ، ژمارە: ٦١١ (إجتماع طلعت)، مایکرۆفیلم: ٣٩٦٢، ٢٢٩٦١، بریتییە لە ٧٢ و ٧٥ پارچە. هەروەها ((أعلام المؤلفين، رضا كحالة)) بە ناونیشانی ((خلاصة الكلام في وجوب الامام)) ئاماژەی پێداوە.

٢١٨ن– (محمد خيامى الحجاجي الحسيني) لـه سـاڵی ١٣١٦ ك/١٨٩٨ ز دا له ژیاندا بووه[٥٣٥].

٢٨١ك– نامەی شوان (فـەرمانڕەوا) و فەرمانبـەردار (ڕەعیـەت)، (رسـالة الراعي والرعية)[٥٣٦].

کتێبەکەی خۆی بە باسی گرنگی ئامۆژگاریی پێشکەشکردن بە رۆڵەکانی وڵات دەست پێدەکات، مەبەستی ئەم کتێبەی بۆ گەیشتن بە حاڵەتێکـە بـۆ هەموو هاووڵاتییەك کە ئەگەر هەموان لـەو حاڵەتـەدا بـن، پـێش دەکـەوین. هـەر مرۆڤـێ لـە لایـەن خۆیـەوە بەرپرسـە بەرانبـەر بـە خێـزان و خـەڵکی وڵاتەکەی، کـە ئـەرکی سەرشـانیەتی پێـنج مەبەسـتەکەی شـەریعەت واتـە: دین، دەروون، ژیریی، رەگەز و ماڵ پارێزگاری بکات.

خـەیامیی لـە بەنـدی یەکەمـدا، فـەرمان بـە دادپـەروەریی و بـەزەیی و راسـتگۆیی لـە ئەرکـەکانی سـەرۆکی شـار دەژمێرێـت، لـە بەنـدی دووەمـدا ئـەرکی هـاو شـارییەکان بـاس دەکـات، لـە بەنـدی سێیەمیـشدا باسـی بەرپرسیارێتی سەرۆك و ژێردەستەکان سەبارەت بـە شـارە هاوپەیمانـەکان دەکات، لە کۆتاییدا لە سەر گرنگی هەقخوازیی و کاریگەریی ئـەوە لـە سـەر کۆمەڵگە جەخت دەکاتەوە.

٢١٩ن– (برکت زاده) ١٢٦٠–١٣١٨ ك/١٨٤٤–١٩٠٠ ز.

---

535 بۆ ژیانی ناوبراو سەرچاوەم دەست نەکەوت.

536 لە قاهیرە چاپ کراوە، ((طبعة العدالة و المنهج القومی لصاحبها محمد الخيامی)) ١٣١٦ ك، هەروەها لە کتێبخانەی زانکۆی قاهیرە لە ژێر ژمارەی: ٢٠٧١١ پارێزراوە.

عەبدوڵڵا کوڕی حەسەن ناسراو بە بەرەکەت زادە، تێگەیشتوو، لە بەیرووت و میسر دادوەریی پێسپێردراوەو لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە[٥٣٧].

٢٨٢ک– سیاسەتی شەرعیی و مافی فەرمانڕەوا و بەختەوەریی رەعیەت (السياسة الشرعية و حقوق الراعي و سعادة الرعية)[٥٣٨].

نووسەر لە سەرەتای کتێبەکەدا باسی مەشروعیەتی سیاسەت دەکات و گرنگترین سەرچاوەکانی لە جێبەجێکردن و گەیاندنی ئەمانەت و سپاردنی فەرمانداریی بە کەسانی دەستپاك و هەڵبژاردنی کاربەدەستان و راوێژ خواستن باس دەکات. ئەو لە درێژەدا بەرژەوەندییە نێردراوەکان (المصالح المرسلة)، مافی گشتیی، یاسای سزادان، ئۆرگانەکانی دەوڵەت لە پێشەوایەتی و جۆرومەرجی و هەتا ئەهلی حەل و عەقد و رۆڵیان لە هەڵبژاردنی پێشەواو راوێژو ئورگانی دادگەریی و فەرماندارانی سوپاو دیوانی دارایی باسدەکات. بەرەکەتزادە بەم شێوەیە خیلافەت پێناسە دەکات: خیلافەت دەستکەوتێکی سیاسییە بۆ چاودێری لە گەورەیی و بەخشندەکانی شەریعەت، ئینجا سیاسەت دەکات بە دوو جۆرەوە: سیاسەتی دەروون (خۆ) و سیاسەتی ئەویتر.

جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کەسێ کە بۆ سیاسەتی خۆی چاك نەبێت بۆ سیاسەتی ئەویتر بەکەڵك نایەت. ئینجا هۆکاری بێهێزیی حکومەتە

---

537 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٦، ل ٤٢.

538 لە قاهیرە چاپ کراوە: (مطبعة الترقي) ساڵی ١٣١٨ ك، بریتییە لە ٢١٩ لاپەڕەو ساڵی ١٣١٦ نووسینی تەواو کردووە.

ئیـسلامییەکان و هەڵوەشـانەوەیان دیـاریی دەکـات و دەیگێڕێتـەوە بـۆ سیاسەتی نێوان زانایان و دەسەڵاتداران.

٢٢٠ن- (عبدالرحمن الكواكبي) ١٢١٧-١٣٢٠ ك/١٨٨٥-١٩٠٢ ز.

عەبـدوڕڕەحمان کـوڕی ئەحمـەد بـەهائی کـوڕی مەسـعود کـوڕی عەبدوڕڕەحمانی ئالوموەقـەت، ناسـراو بـە کـەواکیبی، لـە پیـاوانی زانـستی کۆمەڵناسـیی و سیاسـەتە و لـە شـاری حەڵـەب لـەدایك بـووە و عـەرەبی و تورکی و فارسی فێربـووە و پۆسـتی زۆری لـە حەڵەبـدا پێـسپێردراوە، ئـەو نووسـەری عـەرەبیی و وەرگێـڕی تـورکیی ڕۆژنامـەی ((الفـرات الرسميـة)) و ئەندامی لیژنەی تاقیکردنەوەی پارێزەران و بەڕێوەبەری چاپخانەی ویلایەت بـووە، ئینجـا بووتـە سـەرۆکی لیژنـەی بەرژەوەندییـە گـشتییەکان، ئینجـا سـەرۆکی شـارەوانی حەلـەب و سـەرۆکی ژووری بازرگـانیی و کـشتوکاڵ و پیشەسازیی بووە. پاشان ڕۆژنامەیەکی لە حەڵەب دامەزراندووەو ناوی ناوە ((الشهباء))، ئینجـا چـووە بـۆ میـسر و بـە وڵاتـانی عـەرەبی و خۆرهـەڵاتی ئەفـەریقاو هەنـدێ لـە وڵاتـانی هیندسـتان گـەڕاوەو، لـە کۆتایـدا لـە میـسر نیشتەجێ بووەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە[٥٣٩].

٢٨٣ك- دایکی گوندەکان (أم القرى)[٥٤٠].

ئەم کتێبە مێژووی داڕووخانی مـسوڵمانان و سـەرەتاکانی هەسـتانەوەی نـوێ و ئـارەزووی ڕاپـەڕین و گـۆڕان دەخاتـە ڕوو، ئـەویش لـە میانـەی شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی هۆکارەکانی ئەو کودەتا سیاسییەی سەبارەت بـە

---

539 (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٥، ل ١١٥.

540 (د. محمد عمارة) توێژینەوەی لەسەر کردووەو لە چوارچێوەی ((الاعمال الكاملة للكواكبي))دا لە بەیرووت (المؤسسة العربية للدراسات و النشر ١٩٧٥) بڵاوی کردووەتەوە کە بریتییە لە ١٤٢ لاپەڕە.

سیاسـەتی مـسوڵمانانی سـەرەتا رووی دا، هـەروەها زاڵبـوونی میرەکـانی ئیـستیبداد و لێکهەڵوەشـانی ئەڵقـە ئیـسلامییەکان و رۆڵـی زانـا و قازییـە نەفامـەکان لـەو داڕووخانـەدا. هـەروەها رۆڵـی حکومـەت و فەرمانـداران و دژایەتی و دوژمنایەتیی ئەوان لەگەڵ راوێـژ و گوێنـەدانی ئـەوانی ئـەوان بـە زانستەکان، لەناوبردنی ئـەو رێکخـراو و رێکخـستنانەی کـە راوێـژیان بـەوان نیشاندەدا و لە سەر بناغەی ئەوە رێکیان دەخات، پەرەسەندنی شتی پڕوو پووچ (خرافة) لە فیکری مرۆڤی موسڵماندا، پیشتبەستن بە لاساییکردنەوەو شـــوێنکەوتن (تقلیـــد) لـــە جێگـــەی تێکۆشـــان (إجتهـــاد)، لادانـــی هەڵبـژێردراوەکان، رۆڵـی خۆرهەڵاتناسـان و قوتابخانـە خۆرئاواییـەکان لـە شێواندنی ژیریی مرۆڤی موسڵمان. ئەو هەروەها کاریگـەری ناوەنـد گـەرایی دەوڵەتی عوسمانی لە سەرکەوتنی هەرێمـەکانی تـر لـە سـەردەمی دوایيـدا، نەزانیی، بە تایبەتی نەزانینی ژنـان، لاسـاییکردنەوەی خۆرئـاوا، وەرگرتنـی بابەتە رواڵەتییەکان و کوێرانە شوێنکەوتنی ئەوانە بـۆ کـەوتنی موسـڵمانان بە کاریگەر دەزانێت.

کەواکبیی بۆ رێکخستنێ کە هەموو موسـڵمانان کۆبکاتـەوە سـیناریۆیەك پێـشکەش دەکـات و لـە چوارچـێوەی گفتوگـۆی نێـوان نوێنـەرانی هـەموو موسڵمانانی هەموو جیهاندا، شێوەی دامەزراندنی ئەم رێکخستنە بـۆ ئـەوان ڕووندەکاتەوە، رێکخستنێك کە وێنەیەکی نوێ لـە خیلافـەت، ئامانجـەکان و دەزگاکانی پێشکەش دەکات.

٢٨٤ك– خووەکـانی زۆرداریـی و زۆرانبـازیی بـە بەنـدەکردن (طبـائع الإستبداد و مصارع الاستعباد)[٥٤١].

541 (د. محمد عمارة) لە چوارچێوەی ((الاعمال الكاملة للكواكبي)) توێژینەوەی لە سەر کردووە.

به پێناسەی چەمکی زۆرداریی سیاسیی لە زاراوەی نوێ و مەبەستە هاوچەرخەکانی، نەك بەو تێگەیشتنەی کە بڕیارە کۆنەکان لە سەردەمە مێژووییەکاندا باسیانکردووە، دەست پێدەکات. ئینجا باسی کاریگەریی دەکات لە رووە جیاوازەکانی ژیانی مرۆییەوە، ئەوەش لە رێی کاریگەریی سیستمی سیاسیی زۆردار لە دین و زانست و رەوشت و پەروەردەو شکۆ و پێشکەوتن و دارایی و شتی تریش. ئینجا لێکۆڵینەوە لەسەر چۆنیەتی رزگاربوون دەکات لێی.

٢٢١ن– (مصطفى المصري الأباضي) لە ساڵی ١٣٢١ ك/١٩٠٣ ز دا لە ژیاندا بووە[542].

٢٨٥ك– خەڵاتی یەکەمی ئیسلامیی بۆ پاشاو فەرماندااران لە نەخۆشی و دەرماندا (الهدية الأولى الاسلامية للملوك والأمراء في الداء والدواء)[543].

ئەم کتێبە پێشکەشی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کراوە، بە دیاریکردنی ماهیەتی خیلافەت و پێویست بوونی دەستی پێکردووە، هەروەها مانای شەرعی پێشەوایەتیی گشتی و مەرجەکانی بە یەکەوە لە قورئان و سوننەتدا، ئینجا باسی شارستانیەتی خۆرئاوایی و مەترسی گوێزانەوەی نموونەکانی وەکو جلوبەرگ باسدەکات کە پشکدار بێت لە گۆڕینی پێناسدا، پاشان بەراورد لە نێوان چاکەکانی پێشوو خراپەکانی

[542] ژیانی ناوبراوم دەست نەکەوت، لە ئەبازییەکانی دانیشتووی میسر لەو سەردەمەدا کەسێك بەم ناوەوە ناسراو نییە.. ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەم کتێبە بەرهەمی سولەیمان پاشای بارونی بێت، کە لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستدا لە قاهیرە دەژیاو رۆژنامەی بەناوبانگی ((الأسد الاسلامي)) بڵاو دەکردەوە.

[543] لە قاهیرە چاپکراوە ((المطبعة البارونية))، بریتییە لە ٢٠٠ لاپەڕە.

ئەمرۆدا دەکات، ئینجا لێکۆڵینەوەی فـەزڵی فـەرمانکردن بـەوە دەکـات کـە خــودا ناردوویەتــە خــوارەوە، هــەروەها رەخنــە لەوانــە دەگرێــت کــە فەرمانەکانی خودایان گۆڕیوە بـە دەسـتووریی نـاپلیۆن پۆناپـارت. پاشـان باسی زەکات و ئەوقاف و فەرمان بـە چـاکەو رێگریـی لـە خراپـەو رۆڵـی لـە رزگـارکردنی ئومەتـدا لـە کـەوتن ئامـاژە پێـدەدات. هـەروەها باسـی رۆڵـی زانایـان و راوێـژ دەکـات، پاشـان باسـی زانایـانی ئـاینزا (مـذهب)ی ئیبـازی (أباضي) دەکات کە خۆی سەر بەو قوتابخانەیە، ئینجا توێژینەوەی لە سەر مەسـەلەی زمـانی عـەرەبیی و پێویـستیی پارێزگـارییکردنی دەکـات بـەو شێوەی گرنگیی نەدرێت بە زمانی بێگانە بەو شێوەیەی کە ببێتـە مەترسـی بۆ سەر پێناسەی عەرەبیی.

٢٢٢ن– (محمد العياشي) کۆچکردووی ١٣٢٤ ک/١٩٠٦ ز.

موحەممەد تاهیر کوڕی حەسەن کـوڕی موحەممـەد عەیاشـی ئـەدلبیی، زانای تێگەیشتووی بەشدار لە هەندێ زانستدا. لە ((ئەدلیب)) لەدایك بووەو تیایدا پێگەیشتووەو پۆستی فەتوای پێ سپێردراوە[٥٤٤].

٢٨٦ک– روونترین رێگاکان بـۆ بـەڕێوەبردنی وڵاتـان (أوضـع المـسالك في سياسة الممالك)[٥٤٥].

٢٢٣م– ((علي بن محمد أبو الحسن الـسوسي الـسملالي)) کۆچـکردووی ١٣٢٨ ک/١٩١٠ ز.

توێژەرە و لە مێژوو نووسانی خۆرئاوای دوورە (المغرب الأمضى)[٥٤٦].

---

[544] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ١٠، ل ٩٧.

[545] سەرچاوەی پێشوو، ب ١٠، ل ٩٧.

[546] (أعلام المؤلفين، رضا كحالة) ب ٧، ل ٢٠١.

٢٨٧ك– خۆرهەڵاتی بەختەوەریی لە سەر تەوەری بەڕێوەبردنی سەرۆکایەتیی (مطالع السعادة في فلك سياسة الرياسة)[٥٤٧]. پێشەکەشی سوڵتان حەسەنی کوڕی موحەممەدی کردووە لە مەغریب.

٢٢٤ن– (أحمد البرزنجي) کۆچکردووی ١٣٣٢ ك/١٩١٤ ز.

ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی زەینولعابدین کوڕی موحەممەد هادی کوڕی زەین کوڕی جەعفەر کوڕی حەسەنی بەرزنجی، حوسەینی، موسەویی، مەدەنی، زانا، بەشدار لە زانیارییە جۆراوجۆرەکاندا، لە شاری مەدینەی منەوەرە کۆچی دوایی کردووە[٥٤٨].

٢٢٨ك– ئامۆژگاریی گشتیی بۆ پاشایانی ئیسلام و خەڵکی (النصيحة العامة لملوك الاسلام و العامة)[٥٤٩].

کتێبەکە ئاڕاستەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کراوە، دابەش کراوە بە پێشەکی و دووبەش و کۆتاییەوە. لە سەرەتادا باسی هەڵوێستی موسڵمانانی سەردەمەکەی دەکات کە چۆن خەڵکانی تر بەسەریاندا پێشکەوتوون و ئەمانیش ملکەچ و سەرشۆڕن، جەخت دەکاتەوە لە سەر ئەوەی کە حاڵی موسڵمانان یەکێکە لەو خراپانە (منكرات)ی کە پێویستە لابرێت. لە بەشی یەکەمیشدا باسی چۆنیەتی پێکهێنانی یەکێتییەکی گشتیی حکومەتە ئیسلامییەکان و یەکێتیەکی تایبەتیش بۆ هەموو

---

547 سەرچاوەی پێشوو، ب ٧، ل ٢٠١.

548 سەرچاوەی پێشوو، ب ١، ل ١٦٤-١٦٥.

549 لە میسر چاپ کراوە، بەبێ دیاریکردنی و خانەی بڵاوکردنەوە، لە کتێبخانەی زانکۆی قاهیرە پارێزراوە بە ژمارە: ١٨٨١٨ و دەستنووسیش لە ئەزهەری پیرۆز بە ژمارە: (١٦٠٦) ٤٧٠٠٢، ((١٤٨٥)) بخيت ٤٥٤٨٣ و بریتییە لە ٤٢ لاپەڕە.

ڕۆڵەکانی هەر وڵاتێك دەکات بە جیا، بەڵگەی شەرعیی و ژیرانە بۆ ئەو مەسەلە جەخت لە سەر کراوە پێشکەش دەکات.

ئینجا بانگەوازی ئاڕاستەی هەموو پاشایانی ئیسلام و تەواوی موسڵمانان دەکات و داوایان لێدەکات لە مێژوو تێبگەن و لە ئەزموونی میللەتانی پێشوو و هاوچەرخ سوود وەربگرن. ئینجا جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە یەکێتیی هۆکاری پێشکەوتنی گەلانە و پەرتەوازەییش هۆکاری رووخانیەتی. لە بەشی دووەمیشدا باسی ئەو ئەرکە مولزەمکەرانە دەکات کە پێویستن بۆ هەر دەسەڵاتدارێك، یا ئەمیرێکی موسڵمانان کە پێویستە لەناو وڵاتەکەیدا ئاگادارییان بکات، لە دادگەریی و پاراستنی مافی رەعیەت و بڵاوکردنەوەی زانستەکان و فێرکردنی پیشەوەران و تەواوکردنی تفاق (عدة)ی بەربەست و هێزی بەرپەرچدەرەوە. لە کۆتایشدا باسی فڕوفێڵی رووس و دەستدرێژیی و شکاندنی پەیمانەکان دەکات.

*********

دوو کۆمەڵە کتێب ماون کە نەمتوانیووە مێژووی نووسین یا بەرواری کۆچی دوایی نووسەرانیان دیاریی بکەم، دەستەیەك نوسەرانیان دیارە بەڵام مێژوویان دیار نییە، دەستەیەکی تر نە من و نە مێژوونووسانی تریش نەمانتوانیوە بیدەینەپاڵ نووسەرانێکی دیار. هەرچەندە ئەم سەرچاوانەم لێرەدا باس کردووە، بەڵام جەخت دەکەمەوە کە ئەم سەرچاوانە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی زۆر پێشووتر، کە لەوانەیە بە خوێندنەوەو توێژینەوەی کتێبەکان و بەراوردیان لەگەڵ گفتوگۆی ئەو سەردەمانەی کە دانراوی سیاسیی لە ئیسلامدا لە سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا نوسراون، هەتا بکرێ مێژووی نووسینیان روون ببێتەوە.

**یەکەم: ئەو کتێبانەی کە نووسەرانیان دیارن و بەرواری نووسینیان ونە.**

**٢٢٦ن– (أبو عبدالله محمد بن أبي بكر المبارك بن الرضوان المعروف بالحق الموصلي).**

**٢٨٩ك– ئامۆژگاریی لە ديندار بەربەستی نیازداران بۆ ئامۆژگاریکردنی دەسەڵاتداران (النصح في الدين وما رب القاصدين في مواعظ السلاطين)[550].**

**٢٢٧ن– (أبو جعفر محمد بن عيسى بن عبيد بن يقطين بن موسى البغدادي الشيعي).**

**٢٩٠ك– کتێبی پێشەوایەتی (كتاب الإمامة)[551].**

**٢٢٨ن– (محمد بن... المقدسي).**

**٢٩١ك– سیاسەتی پێویستی قایلکەر (السياسة اللازمة المرضية)[552].**

**٢٢٩ن– (محمد بن أبي العلي بن سماك).**

**٢٩٢ك– رەونەقی نووسین لە حوکمی سیاسەت و تەگبیردا (رونق التحبير في حكم السياسة و التدبير)[553].**

**٢٣٠ن– (محمد بن منصور أبي العباس الصباحري).**

**٢٩٣ك– نامەیەك لە پێشەوایەتییدا (الرسالة في الإمامة)[554].**

**٢٣١ن– (محمد بن أبي بكر السحولي).**

---

550 دەستنووسێکە لە کتێبخانەی ئەحمەدی سێیەم لە ئەستەمبوڵ، ژمارە: ٢٦٠٢، لەویش نوسخەیەك لە پەیمانگای دەستنووسە عەرەبییەکانی قاهیرەیە، کە بریتییە لە ٣٠٨ لاپەڕە.

551 (إيضاح المكنون، البغدادي) ب ٢، ل ٢٧١.

552 سەرچاوەی پێشوو، ب ٢، ل ٣٢.

553 دەستنووسە لە گەنجینەی گشتی ریبات، ریبات، ژمارە: ٢٤١٩ (D1182) کە بریتییە لە ٤٨ لاپەڕە.

554 دەستنووسە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ژمارە: ٧٧٦ ق ١٢٩ -١٦٢.

٢٩٤ك– مزگـەوتی رێکخـراو لـە فـەزڵی پێـشەوای شـکۆداردا (المـسجد المنظم في فضل الإمام المعظم)[٥٥٥].

نووسەر کردوویەتی بە بیست و حەوت بەش کە تایبەتمەنـدە بـە باسـی پێشەواو ئەرکەکانیەوە.

٢٣٢ن– (أحمـد بـن موسـى بـن نـصر بـن موسـى بـن الخـوى الدمـشقي، الشافعي).

٢٩٥ك– پلەبـەرز لـە فەرمانـەکانی حەسـبەدا (العـالي الرتبـة في أحكـام الحسبة)[٥٥٦].

لە سەد بەندا رێکخراوەو بە حەسبەی چاودێریی پاشـایان و وەزیـران و نوسـەران و دادوەران و فەرمانـداران و نوێنـەران و پـەیامنێران و ئـەمیران و سەربازان دەست پێدەکات و پاشان تـەواوی دامـەزراوەکانی دەوڵـەت بـاس دەکات. ئینجا باسـی حەسـبەی دامـەزراوە ئـابووریی و کۆمەڵایەتییـەکان و هەموو رەوشـتە گشتییەکان دەکـات. لـە شـەش بەنـدی کۆتاییـشدا باسـی مەرجـەکانی بەرپرسـی حەسـبەو چـەمکی حەسـبەو جـۆری خراپـەکاریی (المنكرات) دەکات.

٢٣٣ن– (جمال الدين محمد بـن عبـدالقادر بـن أبـي القاسـم الجنيـد، ابـن عجيل).

٢٩٦ك– کتێبی بەخشین (پێدان) لە فەزڵی سوڵتان و حوکمی رەعیەتـدا (كتاب العطية في فضل السلطان و حكم الرعية)[٥٥٧].

---

555 دەستنووسە لە مزگەوتی گەورەی سەنعا، ژمارە: ٢٢٣٤ ق ١-٨١.

556 دەستنووسە لە کتێبخانەی عەباسییەی بەسرە، ژمارە: ح- ٢.

557 دەستنووسە لە کتێبخانەی ((القرويين)) لەناو کۆمەڵەی ٤١ ب بۆ ٥٥ أ.

**٢٣٤ن– (سعيد (أو سعد) بن إسماعيل بن عمر الأقسرائي).**

**٢٩٧ك– سياسەتی دونیاو دین (سياسة الدنيا و الدين)[٥٥٨].**

**٢٣٥ن– (يوسف بن أبي الحجاج).**

**٢٩٨ك– ئەستێرەی رۆشنكەر لە سیاسەت و تەگبیردا (النجم في السياسة و التدبير)[٥٥٩].**

**٢٣٦ن– (محمد بن سعد الدين النوبي الخطيب).**

**٢٩٩ك– ئامۆژگـاریی هــەژاران بـۆ پاشــایان و فەرمانــداران و وەزیــران (نصيحة الفقراء للملوك و الولاة والوزراء)[٥٦٠].**

**دووەم: ئەو كتێبانەی كە نووسەران و مێژووشیان ونە.**

**٢٣٧ن– (نادیار).**

**٣٠٠ك– كتێبی لە سیاسەت و رەوشتدا (كتاب في السياسة و الاخلاق)[٥٦١].**

**٢٣٨ن– (نادیار).**

**٣٠١ك– رەفتار لە تگبیری پاشایاندا (السلوك في تدبير الملوك)[٥٦٢].**

**٢٣٩ن– (نادیار).**

---

[558] دەستنووسە لە كۆڕی زانیاریی عێراقییدا، ژمارە ٦٤٠، لە زانكۆی ئەمـەریكیی بـەیرووتیش بـە ژمارە (Mic-A-382) پارێزراوەو بریتییە لە ٢١٦ پەڕە.

[559] دەستنووسە لە كتێبخانەی ئەحمەدییەی زەیتونەی تونس، ژمارە: ٥٠٤٧.

[560] دەستنووسە لە كتێبخانەی ((الظاهرية)) لە دیمەشق، ژمارە: ١٥٢٤، بریتییە لە ٤٧ پەڕە.

[561] دەستنووسە لە خانەی كتێبی میسریی، ژمارە: ٤٧٩٦ (أدب طلعت) مایكرۆفیلم: ١٨٠٧١٠.

[562] دەستنووســە لــە خانــەی كتــێبی ئەیاســۆفیا، ئاســتانە، ژمــارە: ١٨٥٤ و زانكــۆی ئەمــەریكی بەیرووتیش (Mic-A-318) بریتییە لە ١١٢ لاپەڕە.

٣٠٢ك– رزگارکەر لە بێبەشکردن، ئەوەی کە لـە سـەر ئـەمیر و سـوڵتان پێویستە (المنقذ من الحرمان فیها یجب علی الامراء و السلطان)[٥٦٣].

٢٤٠ن– (نادیار).

٣٠٣ك– مەبەستی دەرخستن (باسکردن) لـە ئامۆژگـاریی دەسـەڵاتداردا (غایة البیان في نصح السطان)[٥٦٤].

٢٤١ن– (نادیار).

٣٠٤ك– کورتەیـەك لـە کتێبگـەلی سیاسـەت، ئـەوەی کـە پاشـایان پێویستیان پێیەتی (مختصر من کتب السیاسة مما تحتاج الیة الملوك)[٥٦٥].

٢٤٢ن– (نادیار).

٣٠٥ك– پاراستنی سەرۆکایەتیی بە دەرخستنی فەرمانـەکانی دادوەریـی و سیاسەت (صیانة الریاسة ببیان أحکام القضاء و السیاسة)[٥٦٦].

٢٤٣ن– (نادیار).

٣٠٦ك– سیاسەتی رەعیەت بە دادگەریی و خـەڵاتکردن (سیاسـة الرعیـة بالعدل و المنن)[٥٦٧].

********

ئەمـەش کۆمەڵـە کتێبێکـە کـە نـەمتوانیوە مێـژوویان دیـاریی بکـەم و بیانخەمە ناو زنجیرەی مێژووییەوە.

---

563 دەستنووسە لە کتێبخانەی خدێوی لە میسر، خاوەن ((إیضاح المکنون)) لـە ب ٢، ل ٥٨٤ دا باسی کردووە.

564 دەستنووسە لە کتێبخانەی نیشتمانیی بۆ دەستنووسەکان لە تونس.

565 دەستنووسە لە گەنجینەی گشتیی لە ریبات.

566 دەستنووسە لە شارەوانی ئەسکەندەرییە.

567 دەستنووسە لە شارەوانی ئەسکەندەرییە، ن، ٣٨٧٠ ج.

٢٤٤ن- (إبراهيم بن يعقوب ثابت) ١٢٦٥-١٣٣٦ ك/١٨٤٩-١٩١٨ ز. نووسەرێکی بەیرووتیی مەسیحییە[568].

٣٠٧ك- دەستووری مامۆستا (نیشانە) بۆ باری سیاسەتی مرۆڤ (الدستور المعلم في أحوال سياسة بني أدم)[569].

نووسەر لە لاپەڕەی ((٨٨))ی کتێبەکەیدا لە باسی ((مەسەلەی خۆرهەڵاتیی)) دا دەڵێت: ((من پیاوێکی خۆرهەڵاتییم و خاوەنی بیر و فیکری خۆرئاواییم)).

کتێبەکەی دابەش دەکات بە پێشەکیی و چوار بەند. لە سەرەتادا سیاسەت پێناسە دەکات بەوەی کە بریتییە لە هەوڵدان بە هەستان بە ئەرکەکان. ئینجا گوزەرێك بە سەر مێژووی مرۆڤایەتییدا دەکات، باسەکە کورتدەکاتەوە لەوەدا کە پێشکەوتنی مرۆڤایەتیی وەکو پێشکەوتنی مرۆڤ وایە لە بێهێزییەوە بۆ بەهێزیی. ئینجا باسی سیاسەتی تایبەتی مرۆڤ دەکات لە ڕێگەی جەختکردنەوە لە سەر بەها فەلسەفییە بەستراوەکان بە ڕەوشت بەرزییەوە، ئەو وایدەبینێت کە ئەم جۆرە لە سیاسەت بریتییە لە بناغەی سیاسەتەکانی تر لە جیهاندا، سیاسەتی گەلانیشی لە سەر رادەوەستێت چ ناوخۆیی و چ دەرەکی. ئینجا دێتە سەر سیاسەتی ناوخۆیی گەلان کە بریتییە لە بەڕێوەبردنی گشتیی لەوانە پارێزگارییکردن لە بەرژەوەندییەکانی ئومەت و مافەکانی. ئینجا باسی سیستەمی سیاسیی کۆماریی و پاشایەتییە پابەند و ڕەهاکان دەکات، ئەو وای دەبینێت کە

---

568 ((أعلام المؤلفين، رضا كحالة)) ب ١، ل ١٢٩.

569 لە قاهیرە بڵاوکراوەتەوە، کتێبخانەی عەرەبیی لە فوجالە، بە بێ مێژوو، لە کتێبخانەی زانکۆی قاهیرەش بە ژمارە: ٤٠٠٧ پارێزراوە.

هەرگەلێ حکومەتێکی هەیە کە گونجاوە لە گەلێدا پاشان دێتە سەر باسی سیاسەتی دەرەوەی گەلان و باسی یاسای نێودەوڵەتیی و نەریتی تایبەتی گەلان دەکات. دوای ئەوە باسی مەسەلەی خۆرهەڵات و رێگەی چارەسەری سیاسیی بەرئەنجامی پەیوەندیی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دەکات. چەندین پێشنیاز بۆ چاکسازیی دەوڵەتی عوسمانیی پێشکەش دەکات هەتاوەکو جارێکی تر راپەڕێ و هەڵسێتەوە، لەوانە باسی پڕۆژەی دەستووری رێکخستنی ئەنجومەنی یاسادانان و دەسەڵاتی راپەڕاندن و جێبەجێکردنی هەڵبژاردن و.. هتد دەکات.

ئەوەی کە وەکو کەلەپووری سیاسیی لە ئیسلامدا دەمناسی لەم خاڵەدا کۆتایی دێت، لەم توێژینەوەیەدا ناتوانین کتێبی ((الخلافة))ی ((محمد رشید رضا)) و ((الاسلام وأصول الحكم))ی ((شیخ علي عبدالرازق)) و ئەو نووسینانەی کە لە دژی نوسران، هەروەها کتێبی دکتۆر سەنهوریی و کتێبەکانی تر وەکو کەلەپووری سیاسیی بناسین. بە ناچاری دەبێ لەیەك خاڵدا راوەستین، ئەو خاڵەی کە بە هۆی گرنگییەوە لە رێگەی بیرکردنەوەی سیاسیی ئیسلامییدا و ئەو گۆڕانکارییانەی کە دروستی کرد، ناتوانین بە سەریدا تێپەڕین یان گوێی نەدەینێ. ئەم خاڵە هەمان ساتە کە کتێبێك لە زانستی سیاسییدا وەرگێڕدراوە. لە کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا، لە یوحەننا کوڕی بەتریقەوە بگرە تا ئیسحاق نیعمەتوڵلا خوری و ئیبراهیم یەعقوب سابیت کە خۆی بە خاوەنی فیکری خۆرئاوایی پێناسەکرد، هیچ یەکەیان فیکریان بە تەواوی وەرنەگێڕاوە، بەڵکو وەرگێڕدراوی خۆیان لە هەمان پەرژینی شارستانی و رووناکبیریی و بۆ ئومەتی خۆیان نووسیویانەو ئەو بیرو فیکرانەی کە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان زانیوە لەوەدا دەیانهێنا. لە

خۆیان بێگانە نەبوون و غەرقی ئـەویتر نـەبوون، بـە بـێ ئـەوەی سـەرەنجی تایبەتمەنـدیی و سیـستمە مەعریفییـە جیـاو دژە یەکـەکان بـدەن تـەواوی دەقەکـەیان وەرنـەگێڕدرا. وەرگێڕانـی پێـشوو پـەرژینی وێـژەی گوفتـاری عـەرەبیی ئیـسلامیی و بەشـەکانی سیـستمی حکومـەت و رەگـەز و ئـەرك و چەمکی سیاسەت و کاروباری پەیوەست بەویان پارێزگـاریی دەکـرد. بـەڵام ئەم کتێبە، نیشاندەری سەردەمێکی نوێیە کـە لـە تـەواوی رەهەندەکانـەوە لەگەڵ سەردەمی پێشوودا جیـاوازیی هەیـە. هەرچـەندە هێـشتا تـەوژمێکی بچووك بوونی هەیە کە بە کەمڕوویانەوە هـەنگاو هەڵدەگرێت و هەوڵدەدات هەتا ئەو جێگەیەی کە دەکرێـت دوای رەوەنـدی خـۆ و کەلـەپوورو پێناسـە بکـەوێت، بـەڵام لـەم سـەردەمە بـە دواوە زانـستی سیاسـەتێك پێـشتر لـە سەرزەوییە عەرەبییەکاندا رەواجی هەبوو لەگەڵ هەموو بەشەکان و رەگەزو رەوش و چەمکەکانیدا گرفتاری غەربگەرایی بوو. پێشکەشکردنی نێوەڕۆکی کتێبی وەرگێڕدراوی ژێرەوە، نیـشانی دەدات کـە جیـاوازیی و قـووڵیی ئـەو جیاوازییە تا کوێیە:

... م لیکوك[٥٧٠].

... ك سەرەتاکانی زانستی سیاسەت (مبادئ علم السیاسة)[٥٧١].

سەرەتا سەبارەت بە گرنگیی خوێندنی زانستی سیاسیی و ئەوەی کە لە ئەوروپادا کردی.

---

[570] مامۆستای زانستی سیاسەت لە زانکۆی ((مجیل)) لە کەنەدا.

[571] سەلیم عەبدولئەحمەد گوێزاویەتەوە، قاهیرە، چاپخانەی هیلال لە فوجالە، ساڵی ١٩١٥ ز.

**بەشی یەکەم: سەبارەت بە قەوارەی دەوڵەت.**

**بەندی یەکەم:** سەبارەت بە ماهیەتی سیاسەت و تیۆری دەوڵەت، تیایدا زانستی سیاسیی پێناسە و دیاریی دەکات و پەیوەندیی لەگەڵ زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا باس دەکات، هەروەها ماهیەتی دەوڵەت دیاریی دەکات و مەرج و جیاوازیی لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگە و حکومەت و ئوممەتدا باس دەکات.

**بەندی دووەم:** سەبارەت بە دروستبوونی دەوڵەت، باسی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی و تیۆری هێز و سەرچاوەی خوایی دەکات.

**بەندی سێیەم:** سەبارەت بە دروستبوونی دەوڵەتی راستەقینە، کە باسی تیۆری سەرهەڵدانی مێژووی دەکات.

**بەندی چوارەم:** سەبارەت بە دەسەڵاتی دەوڵەت و ئازادیی تاك و باسکردنە لە مافی و ئەرکەکان.

**بەندی پێنجەم:** سەبارەت بە پەیوەندیی وڵاتان لەگەڵ یەکتردا، ئینجا پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و پێشکەوتنی یاسای نێودەوڵەتیی و جیاوازیی لە نێوان ئەو و یاسای شارستانییدا باس دەکات.

**بەندی شەشەم:** سەبارەت بە جۆرەکانی دەوڵەت و سیستمەکانی، ئینجا توێژینەوەو دابەشی فیکری ئەرەستۆ بۆ حکومەت و بەشی گوفتارو دەستوورو جۆرەکانی دەوڵەت بە پێ ی ئەو جۆرانە.

**بەشی دووەم: سەبارەت بە سیستمی فەرمانڕەوایی.**

**بەندی یەکەم:** سەبارەت بە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان.

**بەندی دووەم:** سەبارەت بە سیستمی یاسادانان.

**بەندی سێیەم:** سەبارەت بە دەسەڵاتی راپەڕاندن.

**بەندی چوارەم:** سەبارەت بە دەسەڵاتی دادوەریی و پەیوەندیی بە دوو دەسەڵاتەکەوە.

**بەندی پێنجەم:** سەبارەت بە سیستمی هەڵبژاردنی گشتیی و مافی هەڵبژاردن ژنان و زەنجیی و کەمینەکان.

**بەشی شەشەم:** سەبارەت بە حکومەتی فیدراڵیی و سەرهەڵدانی جۆرەکانی یەکگرتوویی (فیدراڵی) و دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵیی.

**بەندی حەوتەم:** سەبارەت بە رژێمی ئیستعماریی، کە باسی بەدەستهێنانی زەوییە داگیرکراوەکان لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەو شۆڕشی ئەمەریکاو رژێمی ئیستعماری ئینگلیزیی و یەکێتیی ئیمپراتۆریی دەکات.

**بەندی هەشتەم:** سەبارەت بە حکومەتە ناو خۆییەکان، جیاوازیی لە نێوان حکومەتی ناوەندیی و حکومەتی ناوخۆیی و لقەکانی حکومەتی خۆماڵییە.

**بەندی نۆیەم:** سەبارەت بە حکومەت و پارتەکانە: سەرهەڵدانی سیستمی حیزبایەتیی لە بەریتانیا (ئینگلتەرا) و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**بەشی سێیەم: سەبارەت بە حکومەت و کۆمەڵگە.**

**بەندی یەکەم:** سەبارەت بە تاك و کۆمەڵگە، ئاینزای تاکی، تیۆری دادگەریی، تیۆری سوود وەرگرتن.

**بەندی دووەم:** سەبارەت بە ئاینزا (رێڕەو)ی شۆسیالیستی، رووی پۆزەتیڤی سۆشیالیزمی دیموکراتیی، سۆشیالیزم لە ئەڵمانیا و بەریتانیا.

**بەندی سێیەم:** سەبارەت بە سەندیکاکان.

له نیشتیمانی عەرەبییدا ئـەم کتێبـە کرایـە بناغـەی خوێنـدنی زانسـتی سیاسـیی، تـا ئیـستا هـیچ بەنـدێك لـە زانـستی سیاسـیی لـە دەرەوەی بەندەکانی ئەم کتێبە پێشکەش و هیچ تـەوەرێکی تـریش نەخراوەتـە سـەر ئەم باسە. بەڵکو کتێبی سەرچاوەی ئەم زانستە، کە لە لایەن دکتۆر پترۆس غالی و خوالێخۆشبوو دکتۆر خەیری عیساوە دانـراوە ئێستاش لـە کۆلێـژی ئـابووریی و زانـستی سیاسـیی زانکـۆی قـاهیرەوە دەخوێنـدرێت، بـەڵکو نوسخەیەکی ئەم کتێبە بە لابردن و خستنەسەری سنووردارەوە دانراوە.

لـەم رووەوە دەبـێ ئـەم کتێبـە بـە راوەسـتانی پێـشکەوتنی زانـستی سیاسـیی لـە شارسـتانیی ئیـسلامییدا بـزانین، پێـشکەوتنێك کـە لـە لایـەن ئەنـدامانی شارسـتانیی ئیـسلامیی (موسـڵمانان و مەسـیحییەکان) بـەدی هاتبوو، کە بە جۆرێك راوەستاوە ئێستاش جوڵەی تێنەکەوتووەتەوە.

# کۆتایی

لە کۆتاییدا دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە ناتوانرێ بوترێ کە ئەم توێژینەوەیە بە کۆکەرەوە و گشتگیر سەبارەت بە تەواوی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامیی لە قەڵەم بدەین. بێگومان سەرچاوەی تریش هەن و لە ئەنجامدا ئەو سەرچاوانەش سەرچاوەی عەرەبیین و کە لە قۆناغگەلێکدا لە نەخشەی کەلەپووری سیاسیی ئیسلامییدا تێپەڕمان کردووە، کە بریتین لە هەموو کات، سەردەم، شوێن، ئاینزا و گرووپ و نەژادەکان بە دەستمان هێناوە. خستنەبەرباسی دانراوە سیاسیی ئیسلامییەکان لە زمانەکانی ترەوە، پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی جیا هەیە، هەتا بە شێوەیەکی رێك و پێك ئەنجام بدرێت.

لە چوارچێوەی ئەوەی کە بەدەستهات، چەند خاڵێك هەیە، کە پێویستی بە جەخت لە سەر کردنەوەو گرێپێدانی زیاتر هەیە:

یەکەم: ئەم لێکۆڵینەوەیە روونی کردەوە کە تەوژمێك هەیە بە ئەنقەست یا نا ئەنقەست بە شوێن ئەوەدا دەگەڕێت کە مێژووی موسڵمانان و کەلەپووری ئەوان لەناو ببات و کەلەپوور بە شتێکی نا گرنگ دەناسێنێ. هەتاوەکو نەکرێ بە شێوەیەکی هاوسەنگ و پشت بە بناغەی ئەوە ببەسترێت.

ئەم زەمینەیە بێئاگایانە بووەتە هۆی بۆشایی چاوگەیی و هەوڵدان بۆ راکردن لە خۆ دەست پێدەکرێت، چونکە تا کاتێ ((خۆت)) بە پووچ، بێ نێوەرۆك بزانرێت، ناتوانرێت زەمینەیەکی مەحکوم بۆ پشت پێبەستنی توێژەری سیاسیی بەدی بهێنرێت. لە ئەنجامدا نەوەیەك بە شێوەی

مەنتیقیی یا بێئاگایانە بە چوارچێوەی چاوگە و سەرچاوەی ئەوروپایی و مێژوو کەلەپوور و فیکری تێکەڵ دەبێت، دەبێ زەمینەیەك هەبێت هەتا فیکر و جووڵە دەست پێبکات، بینینی بینایی پێشتر بۆ کۆکردنەوەو کەڵەکەکردنی ئەمڕۆ لە سەر ئەوە پێویستە، ئەگەر نا چوارده سەدە جگە لە بۆشایی و بێهیوایی و نیگەران، روو لە خۆ هەڵکردن و گرمۆڵەکردن و بە بچووك زانینی، یا هەڵکەندن و خۆ رزگارکردن لەو وتوانەوە لەویترا کە قولایی مێژووی هەیەو هزریشی تۆکمەیە، ئیتر هەستێکی تر ناتوانرێ لەوەوە بەدی بهێنرێت.

**دووەم:** بە تێبینی قەبارەو ئەندازەی سەرچاوە ناسراوەکان، ئەنجامی توێژینەوە هاوچەرخەکان، گشتاندنەکان، نرخی داوەریگەلێ کە سەبارەت بە فیکری سیاسیی لە ئیسلامدا ئەنجام دراوە دەبێ دووبارە پێداچوونەوەی لە سەر بکرێت. جیا لەوەی کە ترازووی چۆنیەتی گۆڕانی ئەنجامە بەدەستهاتووەکان، ئەم مەسەلەیە لە رووی مەنتیقیی و رەوشتیانەوە جێگەی گرنگیپێدانە، چونکە ناکرێ بە توێژینەوەی دەیەکی دیاردەیەك بە بێ ناسینی نۆ لە دەی ئەو بابەتە، فەرمان بە گشتاندن بدرێت.

**سێیەم:** دامەزراندنی زانستی سیاسیی ئیسلامیی هاوچەرخ دەبێت لە رێگەی پشتبەستن بە تێگەیشتن و توێژینەوەی مەعریفەوە لە رەوش و کەلەپوور ئەنجام بدرێت. ئەم مەسەلەیە دەبێت لە پێش هەوڵەکانی ترەوە ئەنجام بدرێت، ئەمەش دەبێ لە پێش دەستپێکردنی هەوڵدان (إجتهاد)ێکی ترەوە بێت کە وزەو هەوڵ و توانای تێدا بەکاردەهێنرێت کە ئەوە دوبارە دەکاتەوە کە پێی گەیشووین، چونکە بیناکردنی زانستی سیاسیی ئیسلامیی–هەروەکو ئەوەی دکتۆر سەیفەددین عەبدولفەتاح پێناسەی

کردووه– سەرەتا پێویستی بە سێ رەگەز هەیە: ئیمە کێین؟ چیمان هەیە؟ چی لەویتر وەردەگرین؟[572] کە دوان لەم رەگەزانە پێویستیان بە گەڕانەوە هەیە بۆ ئەم سەرچاوانە.

چوارەم: بێگومان زۆرێك لەو نامە زانستییە پێشکەشکراوە هاوچەرخە لە سەر گۆڕەپانی فیکری ئیسلامیی و بزووتنەوە ئیسلامییەکان ریشەی مێژوویی خۆیان هەیە کە ناکرێ لێی تێبگەین بە بێ ریشەدۆزییان (تأصیل). بابەتی فەرمانڕەوایی (الحاکمیة) وەکو ئەوەی بڕوا وایە لەگەڵ سەیدقوتب و مەودودیدا دەستی پێنەکردووە، بەڵکو بێگومان هەمیشە هەبووەو هاندەر بووە لە دەستنووسی ((طوغان شیخ الحمودي))، (کە لە ساڵی ٨٧٨ ك/١٤٧٣ ز لە ژیاندا بووە) کە بە ناونیشانی ((المقدمة السلطانیة في السیاسة الشرعیة)) ناسراوە هەروەها مەسەلەی دەستێوەردانی سەربازان لە دەسەڵاتدا لە لایەن ئیبنو موقەفەعەوە باسکراوە، دواتریش تێگەیشتنی زۆرێك لە بابەتە هاوچەرخەکان رێك دەرناچن، بە بێ ریشەدۆزی ریشەکانی لە ژینگەی شارستانیی و رووناکبیریی خۆیدا.

پێنجەم: بێگومان ئەم باسە سوودمەندە کە دووبارە بکرێتەوە لە زانستە کۆمەڵایەتیی و مرۆڤایەتییەکانی تردا، ئەگەر بە هەمان هەنگاو و پەیڕەو بێت یان چاکتر لەو، بۆ ئەوەی بتوانین ئیسلامییبوونی مەعریفە دەستەبەر بکەین لەم زانستانەدا، لە سەر بنەمایەکی بەهێز لەگەڵ مێژووی

---

572 د. سیف الدین عبد الفتاح، بناء علم سیاسة إسلامي. قاهیرە ناوەندی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە سیاسییەکان لە کۆلێژی ئابووریی و زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی قاهیرە، ژمارە: (یۆنیۆی ١٩٨٨ز).

خۆماندا لە پەیوەندیی بەردەوامدا بین، بەڵام بە ژیرییەکی کراوەوە بە رووی ئەویتر و دەستکەوتەکانی سەردەم، هەتاوەکو رووگە و ئاڕاستەمان لێ ون نەبێت.

وشەیەکی سەرگەردان ماوە کە لە مێشك و دڵدا ترس و لەرز دروست دەکات و هەرگیز ناشیەوێت لە پشتی پەردەی بێدەنگی و دیواری ئارامگرییەوە خۆی بشارێتەوە، ئیمە هەڕەشەی لەناوبردن و سڕینەوەی خۆمان و داخورانی پێناس و هەست نەکردن بە خۆمان لەسەرە، مادەم هەریەکە لە خۆمان لە سەنگەری خۆمان – نەك سەنگەری ئەویتر – دانەمەزرێین و قبوڵی نەکەین کە داگیر بکرێت هەروەکو چۆن شارو گوندەکانی بۆسنە کەوتن بۆ ئەوەی هێرشێکی نوێ دەربکەوێت کە لە ئاسۆدا هێشتا سەلاحەددین یا سەیفەددین قتز دەرنەکەوتوون، بەڵکو نوسخە دووبارەبووەکانی بەدرەددین لوئلوئوی فەرمانداری موسڵ دەبینین کە ئیبنو حەداد (کۆچکردووی ٦٧٣ ك/١٢٧٤ ك) کتێبی ((الجوهر النفيس في سياسة الرئيس))ی پێشکەش کرد.

---

خودا لە پشت مەبەستەکانەوەیە و رێنمایی رێگامان بۆ دەکات.

# ناوەڕۆك

# د. نەصر موحەممەد عارف



* لە رۆژی ١٩٦١/٤/٢٩ لە شاری سوهاج لە میصر لەدایك كبووە.

* ساڵی ١٩٨٤ بەكالۆریۆسی لە كۆلێژی ئابووریی و زانستە سیاسییەكانی زانكۆی قاهیرە بە پلەی (شەرەف) بەدەست هێناوە.

* ساڵی ١٩٨٨ ماستەری لە هەمان كۆلێژ بەدەست هێناوە و بووەتە مامۆستای یاریدەدەر لە كۆلێژەكە.

* ساڵی ١٩٩٥ دكتۆرای لە زانستە سیاسییەكانی زانكۆی قاهیرە بەدەست هێناوە.

*** لە دانراوەكانی:**

١ـ (نظريات التنمية السياسية المعاصرة: دراسة نقدية في ضوء المنظور الحضاري الاسلامي).

٢ـ (في مصادر التراث السياسي الاسلامي: دراسة في اشكالية التعميم قبل الاستقراء والتأصيل).

٣ـ (الحضارة –الثقافة –المدنية: دراسة لسيرة المصطلح ودلالة المفهوم).

٤ـ (التنمية من منظور متجدد: التحيز، العولمة، ما بعد الحداثة).

٥ـ (قضايا إشكالية في الفكر الاسلامي المعاصر).

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لە پێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی ئەویش، لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازیی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتیی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستیی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

- ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستیی و ئەکادیمییەکان لە پێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە رێگەیانەوە کارو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبیی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش هەیە.